

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٤٤)، بەهاری ٢٠٢٤



بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی



سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار

# ناوەرۆک




# فرەفەتوایی و کاریگەرییەکانی لەسەر کۆمەڵگە

لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، کە کوردستانیش بەشێکی دانەبڕاویەتی، بابەتی فرەفەتوایی و فرەمەرجەعی کاریگەریی بەرچاوی لەسەر کۆمەڵگە داناوە، کاریگەرییەکەش زیاتر بەلای لێکترازان و ناکۆکیدا ڕۆیشتووە، نەک ڕاجیایی و یەکتر قبوڵکردن.

ئێمە لە (گۆڤاری خاڵ) تەوەری ژمارەی داهاتوومان بۆ بابەتی فرەفەتوایی لە کوردستان تەرخان کردووە و دەپرسین:

. لایەنە ئەرێنیی و نەرێنییەکانی فرەفەتوایی چین؟

. فرەفەتوایی چ کاریگەرییەک لەسەر کۆمەڵگە بەجێدەهێڵێت؟

. ئایا فرەفەتوایی لە جیاوازی سەرچاوەکانی فەتواوە سەرچاوەی گرتووە، یان مەیلی کەسیی و مەزهەبی و سیاسی؟

. ئایا هاوردەکردنی فەتواشمان هەیە؟ ئەگەر هەمانە نابێتە نادیدەگرتنی تایبەتمەندی ناوچەیی؟

. هەتا چەند لیژنەکانی فەتوا لە کوردستان جێگەی متمانەی کۆمەڵگەن؟

. مەرجەکانی فەتوادان و کەسێتی موفتی چین؟

. چۆن ڕێگری لە پاشاگەردانی فەتوادان بکرێت؟

. پەیوەندی نێوان فەتوا و پرۆسەی یاسادانان چییە؟

. داوا لە نووسەران و شارەزایانی بەڕێزی ئەم بوارە دەکەین، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی، کە ئاماژەیان پێدراوە هەتا ڕێکەوتی (٢٠٢٤/٧/١) بۆ گۆڤارەکەمان بنێرن.



تەوەری ژمارە

# بونیادی کەسێتی تاکی کورد

کوردستان لە زۆر ڕووەوە دوێنێ و ئەمڕۆی لە یەک دەچێت، ئەو لە یەکچوونە تەنها لەڕووی جوگرافی و خاک و ئاوەوە نییە، بەڵکو لەڕووی مێژووی خەڵکەکەشییەوە، ئەگەر باسکردنی دوێنێ بۆ پەندلێوەرگرتن بێت، ئێمە وەهامان نەکردووە، زۆربەی ڕووداوەکان دووبارە دەبنەوە.

لێرەدا پرسیارێکی جەوهەریی سەرهەڵدەدات: هۆکارەکانی ئەم نەگۆڕانە چییە؟ ئەم هەموو دووبارەبوونەوانە بۆچی؟ ناکۆکی، لێکترازان؟ ناپاکی لەگەڵ یەک؟ ... هتد.

ئەم جۆرە پرسیارانە هانیداین تەوەری ئەم جارە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کەسێتی تاکی کورد تەرخان بکەین، کە دامەزرێنەر و دروستکەری ڕووداو و گۆڕانکارییەکانە، کۆمەڵێک خاڵمان دیاریکرد و ڕوومان لە شارەزایان و نووسەرانی بەڕێزی ئەم بوارە نا، بەپشتەستن بە بەڵگەی مێژوویی و شیکاریی بابەتییانە بە نووسین بۆچوونی خۆیانمان بۆ بنێرن، بەسوپاسەوە ئەوانیش، لەکاتی خۆیان بۆ گرتین و هەر بەڕێزێکیان بە بابەتێک تەوەرەکەیان لەوبارەوە بۆ دەوڵەمەند کردین.

بەئومێدی ئەوەی وتار و لێکۆڵینەوەکان، وەڵامی پرسیارەکانی ئێوەی خوێنەربن.

گۆڤاری خاڵ

## پوختە

فشاری درێژخایەن، یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی سەردەم، لە سەرانسەری لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا کاریگەری لەسەر تاکەکان هەیە. تێگەیشتن لە کاریگەرییەکانی لەسەر خەسڵەتەکانی کەسایەتی مرۆڤ، زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لە وەڵامدانەوەکانی تاکەکان بۆ فشارەکان. ئامانجی ئەم توێژینەوە، بریتییە لە زانینی کاریگەرییەکانی فشاری درێژخایەن لەسەر خەسڵەتەکانی کەسایەتی، ئەمەش بەسوودوەرگرتن لە لێکۆڵینەوە نوێیەکان. ئەنجامی توێژینەوەکان ئەوە نیشاندەدەن کە خەسڵەتەکانی دەرەوەخوازی، ئەرکناسی، تەباخوازی و کراوەیی بەهۆی فشارە درێژخایەنەکانەوە لاواز دەبن و بەپێچەوانەشەوە تایبەتمەندی دەمارگیری زیاد دەکات. ئەم دەرئەنجامە دەگونجێت کاریگەری نەرێنی بکاتە سەر کەسایەتی تاکی کورد، لەبەرئەوەی کە فشارە درێژخایەنەکان زۆرن و بەردەوامبوونیان هەیە لەناو کۆمەڵگەدا، بەتایبەت نەبوونی دەوڵەت، کێشەی سیاسی و ئابووریی و مووچە. توێژینەوەکە پێشنیاز دەکات کە لەوبارەوە لێکۆڵینەوەی زانستی زیاتر بکرێت بەمەبەستی دەرخستنی قەبارەی دیاردەکە لە کۆمەڵگەی کوردیدا.

### ١. پێشەکی:

دوو بابەتی گرنگی بواری دەروونزانی بریتین لە فشاری دەروونی و کەسایەتی، دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئەم دوو بابەتە یەکێکە لە پێویستییەکان (١)، بەتایبەت بەهۆی گۆڕانکاری خێرا و پێشکەوتنەکانەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، فشارەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیان کردووە، چواردەوری تاکەکانیان داوە. لەهەمانکاتدا گۆڕانکاری لە کەسایەتی و خەسڵەتەکانی کەسایەتی مرۆڤی سەردەم بابەتێکە ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت (٢) (٣). بوونی پەیوەندی نێوان ئەم دووانە لە کۆمەڵگەدا تەوەری توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانە، بەتایبەت لە کۆمەڵگەی کوردیدا، هەتا بزانین پەیوەندییەکە چۆنە و بەچی ئاڕاستەیەک ڕوودەدات.

مۆدێلی کاریگەری نێوان فشاری دەروونی و خۆگونجاندن بەشێوەیەکی فەرمی لەلایەن لازارۆس و فۆلکمانەوە پەرەی پێدراوە، ئاماژە بە گرنگی و بەهای تێگەیشتن لە نێوان فشاری درێژخایەن و خەسڵەتە کەسییەکان دەکات (٤). بەگوێرەی ئەم مۆدێلە؛ فشاری دەروونی لە ئەنجامی کارلێکی جوڵاوی نێوان تاک و ژینگە

لەگەڵ تێگەیشتنی هزری و ستراتیجەکانی خۆگونجاندنەوە بۆ فشار نوێنەرایەتی دەکرێت. خەسڵەتە کەسییەکانی وەکو دەمارگیری، کراوەیی، دەرەوەخوازی، ئەرکناسی و تەباخوازیی ڕۆڵی گرنگ و سەرەکییان هەیە لە تێگەیشتن و پێزانین بە فشارهێنەرەکان و پاشان لەسەر ستراتیجەکانی خۆگونجاندن.

## ١.١. کەسایەتی و خەسڵەتەکانی (Personality & Personality traits)

کەسایەتی؛ بریتییە لە بنیاتێکی فرەڕەهەند کە کاریگەری لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی تاک هەیە، لەوانە کارلێککردنیان لەگەڵ ئەوانی تر، لایەنی سۆزداریی و کارکردنی دەروونی تاک بەشێوەیەکی گشتی. کەسایەتی لە خەسڵەتە بەردەوام و چەسپاوەکانی کەسایەتی پێکدێت (٥). تایبەتمەندی کەسایەتی ئاماژەیە بۆ ڕەوشت و هەڵسوکەوتە بەردەوامەکانی تاک لەڕووی بیرکردنەوە، هەست و ڕەفتارەکانی کە کەسەکەی پێدەناسرێتەوە. ئەم خەسڵەتانەی کەسایەتی بەتێپەڕبوونی کات بە جێگیری دەمێننەوە، کاریگەرییان لەسەر تێڕوانین و هەڵوێست و ڕەفتارەکانی مرۆڤ هەیە لە تەواوی ژیانی تاکدا (٦). کەسایەتی هەر مرۆڤێک لەوانی تر جیاوازە، واتە هەر تاکێک کەسایەتی تایبەت بەخۆی هەیە و بەهۆی خەسڵەتەکانەوە لەوانی تر جیا دەبێتەوە (٣).

### ١.١.١. پێنج خەسڵەتە گەورەکە (Big Five)

یەکێک لە تیۆرەکانی تێگەیشتن لە کەسایەتی، «کەسایەتی» لەچوارچێوەی تیۆری پێنج فاکتەری کەسایەتیدا پێناسە دەکات، گریمانەی ئەوە دەکات کە کەسایەتی لە دەوری پێنج ڕەهەندی فراوان پێکدێت، کە بە مۆدێلی پێنج فاکتەری گەورە یان پێنج فاکتەری (Five-Factor Model) ناسراوە (٧). ئەو ڕەهەندانەش بریتین لە (٨):

١. کراوەیی (Openness): ئەم خەسڵەتە ڕەنگدانەوەی کونجکاوی و داهێنان و وەرگرتنی بیرۆکە و ئەزموونی نوێیە لە مرۆڤدا. خەیاڵکردنی فراوانی تاکە، ئەم خەسڵەتە مرۆڤ دووردەخاتەوە لە تەقلیدکردن.

٢. ئەرکناسی (Conscientiousness): نوێنەرایەتی ڕێکخراویی و بەرپرسیاریی و ئامانجداری لە تاکدا دەکات. مرۆڤ بتوانێت ڕێککاری لە خۆی و ژیانیدا بکات.

٣. دەرەوەخوازی (Extraversion): ئاماژەیە بۆ بەرزی ئاستی کۆمەڵایەتی و جەختکردنەوە و گەڕانی تاک بەدوای هاندانی کۆمەڵایەتیدا.

٤. تەباخوازی (Agreeableness): ڕەنگدانەوەی گەرمی و هاوسۆزی و هاوکاریی و هەستیارییە بەرانبەر بە کەسانی تر.

٥. دەمارگیری (Neuroticism): ڕێژەی کاردانەوەی تاک لەڕووی هەستی نەرێنی وەک دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و ناجێگیری هەڵچوونی دەگرێتەوە.

تیۆری پێنج هۆکار، جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەم پێنج ڕەهەندە، ئەو خەسڵەتە بنەڕەتییانە دەگرنەوە کە جیاوازی تاکەکەسی لە ڕەفتار و زانین و هەستدا لێکدەدەنەوە (٦).

## ١. ٢. فشاریی درێژخایەن (Chronic Stress)

زۆر هۆکار و لایەن کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی کەسایەتی تاک هەیە، بونیادی کەسایەتی ئاڵۆز و هەمەلایەنە، ناتواندرێت بە تەنها یەک ڕەهەند لێکدانەوەی بۆ بکرێت (٧) (٨). یەکێک لە هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر کەسایەتی بریتییە لە فشارە درێژخایەنەکان کە بەردەوام ڕووبەڕووی تاک دەبنەوە (٩). فشاریی درێژخایەن بریتییە لە بەرکەوتنی بەردەوام و نەوەستاو بۆ فشارهێنەرەکان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، کە دەتوانێت کاریگەری نەرێنی بکاتە سەر خۆشگوزەرانی دەروونی و جەستەیی و هەڵچوونی تاک (٩). فشاری درێژخایەن جیاوازە لە فشاریی کتوپڕ (acute stress) کە بۆ ماوەیەکی کاتی تووشی تاک دەبێت و دوای نەمانی فشارهێنەرەکە کاریگەرییەکەش نامێنێت، بەڵکو فشاریی بەردەوام بۆماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە و دەبێتە هۆی دروستکردنی وەڵامدانەوەی درێژخایەنی جەستەیی (٩).

فشاریی درێژخایەن بە چەندین شێوەی جیاواز لە بوارەکانی ژیاندا دەردەکەوێت، وەکو پیشە، پەیوەندییەکان، تەندروستی و بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی (١٠) (١١) (١٢) (١٣). بۆ نموونە فشارە درێژخایەنەکانی کار و پیشە لە ئەنجامی زۆری ماوەی کارکردن، کێشەی زۆر لە شوێنی کارا، کەمتوانایی لە کۆنترۆڵی ئیش و نەبوونی ئاسایش لە شوێنی کار دروستدەبن(١٠). لە پەیوەندییەکاندا، فشاریی درێژخایەن بەهۆی بوونی کێشە بەردەوامەکان، بەرپرسیارییەتییەکانی چاودێرکردنی کەسانی تر، یان گۆڕانە بەردەوامەکان و ناجێگیریی خێزانییەوەیە ڕوودەدەن(١١). لە بواری تەندروستییشەوە وەکو بوونی ئازاری درێژخایەن و نەخۆشییە درێژخایەنەکان(١٢). لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتییشەوە وەکو بوونی گەندەڵی لە وڵات و جیاکاری کۆمەڵایەتی کە سەرچاوەن بۆ فشاریی درێژخایەن دەگرێتەوە(١٣).

### ١. ٣. ئامانجی توێژینەوەکە (Objectives):

لە کۆمەڵگەی ئێمەدا فشارە درێژخایەنەکان زۆر و هەمەچەشنن، دەتوانین بڵێین زۆربەی فشارە درێژخایەنەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا هەن، هەندێک لەو فشارە درێژخایەنانە لە هەرێمی کوردستان، زیاتر ڕەنگیانداوەتەوە، وەکو بوونی نایەکسانی لەناو کۆمەڵگە و گەندەڵی، بێدەوڵەتی، کێشەی ئابووری و مووچە ... ئەمە سەرەڕای بوونی فشارە بەردەوامەکانی تری بواری تەندروستی، کۆمەڵایەتی، ژینگەیی و پیشەیی، لەبەرئەوە گرنگە کە بزانین ئایا ئەو فشارە بەردەوامانە چەندە کاریگەرییان هەیە لەسەر تایبەتمەندییە کەسییەکانی تاکی کوردی. ئامانجی توێژینەوەکە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان فشاریی درێژخایەنە لەگەڵ پێنج خەسڵەتە گەورەکەی کەسایەتی تاک، کە ئایا کامیان زیاد دەکات و کامیان کەم دەکاتەوە؟ لێکۆڵینەوەکە لەچوارچێوەی توێژینەوەکان کە لە دونیای زانستدا هەن لەو بوارەدا ئامادەکراوە. دەتواندرێت بۆ کۆمەڵگەی کوردی هاوشێوە بێت.

## ٢. کاریگەری فشاریی درێژخایەن لەسەر خەسڵەتە کەسییەکان:

لەچوارچێوەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە تایبەتەکاندا، لەم بەشەدا ئاماژە بە کاریگەری فشاری درێژخایەن، لەسەر پێنج خەسڵەتە گەورەکەی کەسایەتی دەکەین:

### ٢. ١. کراوەیی (Openness):

ئەم خەسڵەتە گوزراشت لە بیرفراوانی و بیرقوڵی مرۆڤ دەکات، کەسانی کراوە کاردانەوەیەکی قوڵی سۆزداریان بۆ شتەکان هەیە، هەوڵدەدەن ڕێگەی جیاواز بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان بدۆزنەوە. هەروەها کەسانی کراوە ئارەزووی تاقیکردنەوەی شتی نوێ دەکەن (١٤). بەگوێرەی توێژینەوەکان فشارە بەردەوامەکان دەبنە هۆی کەمبوونەوەی ئەم خەسڵەتە لەلای تاک (١٥) (١٦). ئەمەش لەبەرئەوەی کە فشاریی بەردەوام دەبێتە هۆی سنورداركردنی بوونی هەل بۆ دەرخست و هاندانی هزری تاک، کە پێویستن بۆ ئەم خەسڵەتە (١٥). بەهەمانشێوە ئەو کەسانەی کە لەژێر فشاری درێژخایەندان، ئارەزووی کەم و سنورداریان هەیە، داهێنانکارییان کەمترە و بەرگیریکارن بەرانبەر گۆرانکارییەکان (١٦).

هەروەها دەرکەوتووە کە بوونی تایبەتمەندی کراوەیی دەبێتە هۆی گۆڕینی کاریگەرییەکانی فشاریی درێژخایەن لەسەر خۆشگوزەرانی تاک، بەشێوەیەک کە هەتا ئاستی کراوەیی زیاتر بێت، کاریگەرییە نەرێنییەکان کەمتر دەبنەوە (١٧).

### ٢. ٢. ئەركناسی (Conscientiousness):

مەبەست لەم خەسڵەتە بریتییە لە خۆکۆنترۆڵکردن، هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی، ماندوونەبوون لە کارکردن و پابەندبوون بە ڕێساکان. هەروەها ناوەرۆکی ئەرکناسی بریتییە لە خۆکۆنترۆڵکردن (١٤). بەهەمانشیوە فشارە درێژخایەنەکان دەبنە هۆی لاوازبوونی ئەم خەسڵەتە (١٨) (١٩) (٢٠).

دەرکەوتووە کە فشارهێنەرە درێژخایەنەکان، دەبنە هۆی تێکچوونی ڕۆتینیاتی ڕۆژانە و لاوازکردنی ڕەفتاری ئامانجداری تاک، کە ئەمەش پەیوەندی هەیە بە کەمبوونەوەی لایەنی ئەرکناسی تاکەوە (١٨). هەروەها ئەو کەسانەی کە لەژێر فشاریی درێژخایەندان، ئاستی پاڵنەر و هاندەریان نزم دەبێتەوە، توانای بڕیاردانیان خراپ دەبێت و پابەندییان بە بەرپرسیارییەتییەکانەوە دادەبەزێت، ئەم ڕەفتارانەش بەشێکن لە تایبەتمەندی ئەرکناسی (١٩). لایەنێکی تری کاریگەری فشار لەسەر ئەرکناسی لەڕێگەی کاریگەرییە نەرێنییەکانی فشارەوەیە لەسەر توانای هزری و ژیری تاک، کە بەهۆی فشارەکانەوە لاواز دەبن و دەرئەنجام بەگوێرەی کات گۆڕانکاری لە ئەرکناسی تاکدا دروستدەکات (٢٠).

### ٢. ٣. دەرەوەخوازی (Extraversion):

دەرەوەخوازی ئاماژە بە وزە و پەرۆشی دەکات، کە ئەم وزە و پەرۆشییە ئاڕاستەیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی هەیە. ئەم خەسڵەتە پێکهاتووە لە: گەرموگوڕی، خوێنگەرمی، پێداگری، چالاکی، هەڵچوونی ئەرێنی و خرۆشانخوازی (١٤). فشارە بەردەوامەکان دەبنە هۆی کەمبوونەوەی ئەم خەسڵەتە (٢١) (٢٢) (٢٣).

هەندێک لە فشارە درێژخایەنەکان، وەکو دابڕانی کۆمەڵایەتی یان کێشەکانی پەیوەندیکردن، ڕاستەوخۆ دەبنە هۆی کەبوونەوەی دەرەوەخوازیی تاک (٢١). دەرکەوتووە کە ئەو کەسانەی کە ئەزموونی فشاریی درێژخایەن دەکەن، خۆیان لە کارلێک و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەدوردەگرن و لە چالاکییە پاداشت ئامێز و چێژبەخشەکان دوردەکەونەوە، وەکو ئاماژەی بۆ کرا یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم خەسڵەتە بریتییە لە خرۆشاویی و خوێنگەرمی، کە بەهۆی فشارەکانەوە کەمدەبنەوە (٢٢). لەهەمانکاتدا توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە فشاریی درێژخایەن دەبێتە هۆی گۆڕانی بەردەوام لە دەرەوەخوازیدا، بەتایبەت لەو کەسانەدا کە خۆیان ئامادەباشیی پێشوەختەیان هەیە (٢٣).

### ٢. ٤. تەباخوازی (Agreeableness):

هەریەکە لە لەخۆبردوویی و سۆزو خۆشەویستی و متمانە بریتین لە هەرە دیارترین ڕەفتارەکانی تەباخوازی. نزمبوونەوەی ئاستی تەباخوازی پەیوەندیی بە ڕەفتاری شەڕانگێزی، نەیاری، فرت و فێڵکردن و بێبەزەیی بوونەوە هەیە (١٤). بەهەمانشێوەی خەسڵەتەکانی تری کەسییەتی کە لە پێشەوە ئاماژەیان بۆ کراوە، فشاری درێژخایەن دەبێتە هۆی کەمکردنەوە و لاوازکردنی تەباخوازی (١) (٢٤). ئەم کاریگەرییەش بەهۆی ئەوەوەیە کە فشاریی درێژخایەن کاریگەری نەرێنی دەکاتە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، دەبێتە هۆی تێکدانی متمانە، ئەمەش پەیوەندی هەیە بە کەمبوونەوەی تەباخوازی (١). دەرکەوتووە ئەو کەسانەی کە فشاریی بەردەوامیان هەیە، لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کەسانی تردا گوماناوی دەبن و زیاتر خۆپارێز دەبن (٢٤). بە پێچەوانەشەوە بوونی پشتیوانی کۆمەڵایەتی و بەکارهێنانی ستراتیژە پەسەندەکانی خۆگونجاندن، دەبنە هۆی کەمبوونەوەی کاریگەرییە نەرێنییەکانی فشاریی درێژخایەن لەسەر تەباخوازی، نەرمینواندن و پەیوەستییە کۆمەڵایەتییەکان (٢٥).

### ٢. ٥. دەمارگیری (Neuroticism):

ئەم خەسڵەتە پێکهاتەیەکی فرەڕەهەندە و چەندین تایبەتمەندی لەخۆگرتووە، کە بریتین لە جێگیریی، دڵخۆشی، ئارامی، میانڕەویی، سەرسەختی، پشودرێژی، خۆگری، خۆکۆنترۆڵکردن و ئارامی (١٤). بەپێچەوانەی هەموو خسڵەتەکان، فشاری درێژخایەن دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئەم خەسڵەتە (٢) (٢٦) (٢٧).

توێژینەوە نوێیەکان، پەیوەندی نێوان فشاریی درێژخایەن و بەرزبوونەوەی ئاستی دەمارگیری دەردەخەن، واتە هەتا فشارەکان زۆرتر بن ئەم خەسڵەتە زیاتر دەبێت (٢٦). بۆنمونە توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە کێشەکانی پەیوەست بە پیشە یان بەرپرسیارییەتییەکانی چاودێریکردن، دەبنە هۆی زۆربونی دەمارگیری بەگوێرەی کات (٢). هۆکاری پشت ئەم گۆڕانکارییە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی فشار بە گۆڕانی پرۆسە بایۆلۆجی و دەمارییەکان، کۆنترۆڵکردنی هەڵچوون و میکانیزمەکانی خۆگونجاندنی تاک، کە بەهۆی فشارەکانەوە تێکدەچن (٢٧).

### ٦.٢. هۆکارە هاوسەنگکەرەکان (Moderating Factors):

لەکاتێکدا کە باسی کاریگەرییە نەرێنییەکانی فشاری دەروونی دەکەین، چەندین هۆکار هەیە کە کاریگەرییان لەسەر هاوسەنگکردن و کەمکردنەوەی کاریگەرییە نەرێنییەکانی فشاری درێژخایەن هەیە، بەشێوەیەک دەتوانن تاک لە زیان و مەترسییەکانی بپارێزن (٢٥) (٢٨) (٢٩). هۆکارە سەرەکییەکانیش بۆ کەمکرنەوەی کاریگەرییە نەرێنییەکان بریتین لە ڕەفتارە تاکەکەسییەکان وەکو متمانەبەخۆبوون (٢٩)، ستراتیژییەکانی ڕووبەڕووبوونەوە (٢٨)، پشتگیری کۆمەڵایەتی (٢٥) (٢٨)، کات و ماوەی بەرکەوتنی فشار (٩) (٢٨)، هەروەها شێوازەکانی چارەسەر و کەمکردنەوەی فشارەکان (٢٤).

### ٣. خەسڵەتەکانی کەسایەتی لە کوردستان:

هۆکارە بۆماوەیی و ژینگەییەکان، کاریگەرییان هەیە لەسەر کەسایەتی تاک (٧)، هەروەها بەگوێرەی توێژینەوەکان، خەسڵەتەکانی کەسایەتی لە نێوان وڵاتان و ناوچە جیاوازە جوگرافییەکاندا دەگۆڕێت، بەشێک لەو جیاوازییانە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری بۆماوەیی لەسەر دەرکەوتنی خەسڵەتەکان، لە توێژینەوەیەکدا بەهێزی کاریگەری بۆماوە لەسەر خەسڵەتەکانی دەمارگیری و کراوەیی دەرخستووە (٣٠). لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر ٥٦ نەتەوە کراوە، ئاماژە بە جێگیری زۆربەی خەسڵەتەکان دەکات، لەگەڵ هەندێک جیاوازی لەنێوان نەتەوەکان و کولتوورە جیاوازەکاندا لە دەرکەوتنی ئەو خەسڵەتانە. بۆنمونە دانیشتوانی کیشوەری ئەفریقا و ئاسیا جیاوازیان هەیە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکانی تری جیهان لەڕووی ئەرکناسییەوە، بەشێوەیەک لە ناوچەکانی ئاسیا و ئەفریقا ئەرکناسی ئاستی بەرزترە (٢٩). ئەم بابەتە پێویستی بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، هەتا بزاندرێت جیاوازییەکان کامانەن و چۆنن (٢٩) (٣٠).

لە هەرێمی کوردستان چەندین توێژینەوە لەسەر پێنج خەسڵەتە گەورەکان لەناو توێژە جیاوازەکانی وەکو قوتابیانی ئامادەیی (٣١) (٣٢)، خوێندکارانی زانکۆ (٦) (١٤)، مامۆستایانی زانکۆ (٣٣) ئەنجامدراوە. لەبەرئەوەی ئامانجی توێژینەوەکان بۆ بابەت و لایەنی تر بووە، تەنها دوو توێژینەوە لە ئەنجامەکانیاندا ئاماژەیان بە ڕێژەی بەربڵاوی و دەرکەوتنی خەسڵەتەکانی کەسایەتیی کردووە (٣١) (٣٣).

لە توێژینەوەیەک لەسەر نەوجەوانان لە قوتابخانە ئامادەییەکان، دەرکەوتووە کە

تایبەتمەندی زاڵ و بەربڵاو بریتییە لە دەرەوەخوازی، پاشان ئەرکناسی و کراوەیی. دەمارگیری لە هەموویان لاوازتر و کەمتر دەرکەوتووە (٣١). لە توێژینەوەیەکی تردا لەناو مامۆستایانی زانکۆدا، ئەرکناسی بەرزترین پلەی هەبووە، پاشان تەباخوازی و دواتر کراوەیی (٣٣). ناتوانین بەتەواوی لەم توێژینەوانەوە تایبەتمەندی زاڵ لە کۆمەڵگەدا دیاری بکەین، بەڵکو تەنها وەکو نمونەیەک ئاماژەمان پێداوە.

## ٤. دەرئەنجام:

فشاری درێژخایەن کاریگەری بەرچاوی لەسەر خەسڵەتەکانی کەسایەتی هەیە، دەبێتە هۆی گۆڕینی خەسڵەتە سەرەکییەکانی تاک. لێکۆڵینەوە نوێیەکان ئاماژەیان بەم پەیوەندییە ئاڵۆزە داوە، تیشکیان خستووەتە سەر گرنگی ڕەچاوکردنی جیاوازییە تاکەکەسییەکان و هۆکارەکانی کاریگەری. هەرچەندە لە کۆمەڵگەی کوردیدا خەسڵەتی دەمارگیری پلەی کەمی هەیە لەلای تاکەکان، بەڵام دەرکەوتووە کە فشاری دەروونی درێژخایەن دەبێتە هۆی زیادبوون و بەهێزبوونی تایبەتمەندی دەمارگیری و چوار خەسڵەتەکەی تر لاواز دەکات. ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆرتر و زیاتر هەیە بەتایبەت بۆ پسپۆڕانی بواری دەروونزانی هەتا بتوانن زیاتر دیاردەکە ئاشکرا بکەن و دەریبخەن. ئەم توێژینەوە پێشنیاز دەکات کە؛

١. دەسەڵات و دەوڵەت هەوڵی زیاتر بدەن بۆ کەمکردنەوەی فشارە بەردەوامەکان، بەتایبەت گەندەڵی و خراپی باری ئابووری تاکەکان و ململانێ سیاسییەکان و کێشە تەندروستییە باوەکان.

٢. میدیا و ڕاگەیاندن بە گرنگییەوە لەم دیاردە بڕوانن و کاریگەرییەکانی کەمبکەوە و ڕێگاکانی چارەسەر و کۆنترۆڵی فشارەکان بە تاک و کۆمەڵگە بناسێنن و ڕوونبکەنەوە.

٣. دامەزراوە زانستییەکان و پسپۆڕانی بواری دەروونزانی توێژینەوەی گەورە و فراوان لەو بوارەدا ئەنجامبدەن و ڕێگا چارە و پێشنیازی زانستی پێشکەش بکەن.

## سەرچاوەکان


1. Hengartner, M. P., van der Linden, D., Bohleber, L., & von Wyl, A. (2017). Big Five Personality Traits and the General Factor of Personality as Moderators of Stress and Coping Reactions Following an Emergency Alarm on a Swiss University Campus. Stress and health : journal of the International Society for the Investigation of Stress, 33(1), 35–44. https://doi.org/10.1002/smi.2671
2. Roberts, B. W., & Mroczek, D. (2008). Personality Trait Change in Adulthood. Current directions in psychological science, 17(1), 31–35. https://doi.org/10.1111/j.1467-8721.2008.00543.x
3. Bleidorn, W., Schwaba, T., Zheng, A., Hopwood, C. J., Sosa, S. S., Roberts, B. W., & Briley, D. A. (2022). Personality stability and change: A meta-analysis of longitudinal studies. Psychological bulletin, 148(7-8), 588–619. https://doi.org/10.1037/bul0000365
4. Lazarus, R. S., & Folkman, S. (1984). Stress, appraisal, and coping. New York: Springer.
5. McCrae, R. R., & Costa, P. T. (2008). The five-factor theory of personality. In O. P. John, R. W. Robins, & L. A. Pervin (Eds.), Handbook of personality: Theory and research (3rd ed., pp. 159–181). Guilford Press.
6. Kakamad, K., Mawlod, K. S., & Mohammed, M. H. (2024). Personality traits and language learning strategies among EFL students. Passer Journal, 6(1), 185-191. Retrieved from http://passer.garmian.edu.krd/
7. Franić, S., Borsboom, D., Dolan, C. V., & Boomsma, D. I. (2014). The big five personality traits: psychological entities or statistical constructs?. Behavior genetics, 44(6), 591–604. https://doi.org/10.1007/s10519-013-9625-7
8. Alderotti, Giammarco; Rapallini, Chiara; Traverso, Silvio (2021) : The Big Five Personality Traits and Earnings: A Meta-Analysis, GLO Discussion Paper, No. 902, Global Labor Organization (GLO), Essen. https://hdl.handle.net/10419/236201
9. Cohen, S., Janicki-Deverts, D., Doyle, W. J., Miller, G. E., Frank, E., Rabin, B. S., & Turner, R. B. (2012). Chronic stress, glucocorticoid receptor resistance, inflammation, and disease risk. Proceedings of the National Academy of






Sciences of the United States of America, 109(16), 5995–5999. https://doi.org/10.1073/pnas.1118355109
10. Kivimäki, M., Leino-Arjas, P., Luukkonen, R., Riihimäki, H., Vahtera, J., & Kirjonen, J. (2002). Work stress and risk of cardiovascular mortality: prospective cohort study of industrial employees. BMJ (Clinical research ed.), 325(7369), 857. https://doi.org/10.1136/bmj.325.7369.857
11. David, S., & Knight, B. G. (2008). Stress and coping among gay men: age and ethnic differences. Psychology and aging, 23(1), 62–69. https://doi.org/10.1037/0882-7974.23.1.62
12. McEwen B. S. (2008). Central effects of stress hormones in health and disease: Understanding the protective and damaging effects of stress and stress mediators. European journal of pharmacology, 583(2-3), 174–185. https://doi.org/10.1016/j.ejphar.2007.11.071
13. Zhang Y. (2022). The Relationship Between Corruption Perception and Depression: A Multiple Mediation Model. Psychology research and behavior management, 15, 1943–1954. https://doi.org/10.2147/PRBM.S370045
14. Babakr, Z. H. (2024). The Role of Personality Traits and Adverse Childhood Experiences (ACEs) in Risk-Taking. (Unpublished doctoral dissertation). Soran University.
15. Mõttus, R., Allik, J., & Pullmann, H. (2007). Does personality vary across ability levels? A study using self and other ratings. Journal of Research in Personality, 41(1), 155–170. https://doi.org/10.1016/j.jrp.2006.03.007
16. Yildirim, M., & Belen, H. (2019). The Role of Resilience in the Relationships between Externality of Happiness and Subjective Well-Being and Flourishing: A Structural Equation Model Approach. Journal of Positive Psychology and Wellbeing, 3, 62-76.
https://www.journalppw.com/index.php/JPPW/article/view/85
17. Fleeson, W., & Gallagher, P. (2009). The implications of Big Five standing for the distribution of trait manifestation in behavior: fifteen experience-sampling studies and a meta-analysis. Journal of personality and social psychology, 97(6), 1097–1114. https://doi.org/10.1037/a0016786
18. Murphy, M. L., Miller, G. E., & Wrosch, C. (2013). Conscientiousness and

stress exposure and reactivity: a prospective study of adolescent females. Journal of behavioral medicine, 36(2), 153–164. https://doi.org/10.1007/s10865-012-9408-2

19. Bogg, T., & Roberts, B. W. (2013). The case for conscientiousness: evidence and implications for a personality trait marker of health and longevity. Annals of behavioral medicine : a publication of the Society of Behavioral Medicine, 45(3), 278–288. https://doi.org/10.1007/s12160-012-9454-6
20. Soldz, S., & Vaillant, G. E. (1999). The Big Five personality traits and the life course: A 45-year longitudinal study. Journal of Research in Personality, 33(2), 208–232. https://doi.org/10.1006/jrpe.1999.2243
21. Lüdtke, O., Roberts, B. W., Trautwein, U., & Nagy, G. (2011). A random walk down university avenue: life paths, life events, and personality trait change at the transition to university life. Journal of personality and social psychology, 101(3), 620–637. https://doi.org/10.1037/a0023743
22. Hagger-Johnson, G., Roberts, B., Boniface, D., Sabia, S., Batty, G. D., Elbaz, A., Singh-Manoux, A., & Deary, I. J. (2012). Neuroticism and cardiovascular disease mortality: socioeconomic status modifies the risk in women (UK Health and Lifestyle Survey). Psychosomatic medicine, 74(6), 596–603. https://doi.org/10.1097/PSY.0b013e31825c85ca
23. Lahey B. B. (2009). Public health significance of neuroticism. The American psychologist, 64(4), 241–256. https://doi.org/10.1037/a0015309
24. Snippe, E., Dziak, J. J., Lanza, S. T., Nyklíček, I., & Wichers, M. (2017). The shape of change in perceived stress, negative affect, and stress sensitivity during mindfulness-based stress reduction. Mindfulness, 8(3), 728–736. https://doi.org/10.1007/s12671-016-0650-5
25. Boyraz, G., Legros, D. N., & Tigershtrom, A. (2020). COVID-19 and traumatic stress: The role of perceived vulnerability, COVID-19-related worries, and social isolation. Journal of anxiety disorders, 76, 102307. https://doi.org/10.1016/j.janxdis.2020.102307
26. Stanton, A. L., Luecken, L. J., MacKinnon, D. P., & Thompson, E. H. (2013). Mechanisms in psychosocial interventions for adults living with cancer: opportunity for integration of theory, research, and practice. Journal of





consulting and clinical psychology, 81(2), 318–335. https://doi.org/10.1037/a0028833

27. Fried, E. I., Bockting, C., Arjadi, R., Borsboom, D., Amshoff, M., Cramer, A. O., Epskamp, S., Tuerlinckx, F., Carr, D., & Stroebe, M. (2015). From loss to loneliness: The relationship between bereavement and depressive symptoms. Journal of abnormal psychology, 124(2), 256–265. https://doi.org/10.1037/abn0000028
28. Mancini, V., Rigoli, D., Roberts, L., & Piek, J. (2019). Motor skills and internalizing problems throughout development: An integrative research review and update of the environmental stress hypothesis research. Research in Developmental Disabilities, 84, 96-111. https://doi.org/10.1016/j.ridd.2018.07.003
29. Schmitt, D. P., Allik, J., Mccrae, R. R., & Benet-Martínez, V. (2007). The Geographic Distribution of Big Five Personality Traits: Patterns and Profiles of Human Self-Description Across 56 Nations. Journal of Cross-Cultural Psychology, 38(2), 173–212. https://doi.org/10.1177/0022022106297299
30. Power, R. A., & Pluess, M. (2015). Heritability estimates of the Big Five personality traits based on common genetic variants. Translational psychiatry, 5(7), e604. https://doi.org/10.1038/tp.2015.96
31. Ismail, A. A. (2016). Ways of coping and personality traits among Kurdish adolescents. International Journal of Psychology and Counselling, 8(1), 1-7. https://doi.org/10.5897/IJPC2015.0314
32. Mohamedamin, P. F., & Fatahi, N. (2022). Relationship Between Personality Traits and Violence Involvement: A Study of High School Students in Northern Iraq. Acta Informatica Medica, 30(3), 213-219. https://doi.org/10.5455/aim.2022.30.213-219
33. Hassan Khal Hamza, S. (2023). Relationship Between Personality Traits, and Desired Leadership Styles, their Impact on Lecturers in Classrooms Management at Salahaddin University, Erbil – Kurdistan Regional Government. Zanco Journal of Human Sciences, 27(5), 307–323. https://doi.org/10.21271/zjhs.27.5.20

ئەم نووسینە وەک لە ناونیشانەکەیدا دیارە پوختەیەکی پەرتووکی سایکۆلۆجیای کەسێتییە، کە تاڕادەیەکی زۆرباش هەڵسەنگاندن و ناساندنی تاکی کورد تیادا خراوەتە ڕوو، لەڕووی سایکۆلۆجییەوە. ئەم خستنە ڕووە، لەبەر ڕۆشنایی قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی دەروونزانیدایە کە هەموویان تەواوکەری یەکترین و هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکەوە سەیری مرۆڤ دەکات و مرۆڤ دەناسێنێت، تاکی کوردیش لەبەردەم ئاوێنەی ئەم نەزەرییە و قوتابخانە جیاوازانەی دەروونزانیدا دەتوانێت خۆی بپێوێت و شتێک لە خۆی حاڵی ببێت. هەریەک لەو قوتابخانانە بەجیا لە خوارەوە باس دەکەین:

### ١ - قوتابخانەی دەروونشیکاری فرۆید:

خەمی سەرەکی لای فرۆید هەمیشە عەقڵ بووە، نەیویستووە هەمیشە لەسەر بابەتی سێکس بوەستێت و بەردەوام باسی نەست بکات و چێژ بکاتە سەنتەر و جەستە هەموو شتێک بێت لای، بەڵکو ویستوویەتی لە ڕێی ئەمانە و هی تریشەوە عەقڵ بکاتە سەنتەری گرنگی پێدان و تۆخکردنەوەی وەک بابەتە سەرەکییەکە. فرۆید سێ لەو توخمانەی کە کەسێتی تاکی لەسەر بونیاد دەنرێت باس دەکات، کە بریتین لە (id)، من (ego)، منی باڵا (super ego).

(id)، ڕەمزی حەز و ئارەزوو و غەریزییەکانە، هێزێکی زۆر کاریگەرە و خۆی لە دوو بەشدا دەبینێتەوە کە غەریزەکانی ژیان و غەریزەکانی مردنن، غەریزەی ژیان کە سێکس تینیان دەداتێ و لە لیبیدۆشدا(١) چڕ دەبنەوە پێیان دەڵێن نیرۆس، لە بەرانبەردا غەریزەکانی مردن کە لە ڕەفتاری دژکاری و وێرانکاریدا خۆی دەبینێتەوە پێیان دەڵێن ساناتۆز، ئەم غەریزانە کاتێک دەورووژێن نە هاوسەنگی ئینسان دەترازێنن و گەر باش بەخێو نەکرێن کەم کەس هەیە بەرگەی گێچەڵەکانی بگرێت.

ego، وەک ناوبژیوانێکی هەرە ماندووی نێوان دوو هێزی شڵەژێنەری تاکە، ئیشی بەرهەمهێنانی سیستەم و ئۆردەری هەڵسوکەوتکردنی مرۆڤە، دەتوانین بڵێین سومبولی عەقڵ و بەهێزی ئەم توخمە واتە بەهێزی دەروون و کەسایەتی مرۆڤ.

Super ego ، هەموو ئەو بەها و باوەڕانەیە کە لە لایەن دایباب یان کۆمەڵگەوە پێماندراوە و زیاتر ڕۆڵی ڕەخنەگرتن و سانسۆرکردنی کەسایەتی دەبینێت و خۆشی لە کولتووردا دەبینێتەوە.

### (ID)ی کوردی

ئایدی تاکی کورد خراپ دەلەوەڕێ. ئەوەی بە ئاشکرا بۆی هەڵنەکەوێت، بە قاچاغەڕێی سەیر سەیر و مەترسیدار پێی دەگات، هەمیشەش کوتەک لەسەر ئاید ئامادەیە، لەکاتێکدا ئەو بەردەوام داوا لەسەر داوامان لێ دەکات و نایەڵێت وچان بدەین، لە ترسی منی باڵا (Super ego) زۆرجار خۆی دەخواتەوە و منی باڵاش لەژێر گوشاری ئاید هەمیشە لە بۆسەدان بۆ یەکتر. لەم کەین و بەینەشدا من (ego) سەرلێشێواو و نائارامە. ئاید گەر تەنگاو بکرێت و نەهێڵرێت هاوسەنگانە بە پیر بانگەوازەکانییەوە بچێت، ئەوە کەسەکە دەکەوێتە دۆخێکی کوڵانی فیسیۆلۆجی و دەروونییەوە و ئەمەش وادەکات ئەوەی دەیڵێت و دەیکات لە کار و کردەوەدا هاوسەنگ نەبێت و حزووری عەقڵی زۆر کاڵ بێ تێیدا. تاکی کوردی زیاتر بیری لەسەر ئاید و کانە بورکانەکانیەتی و زۆر حەز بە مەجلیسی منی باڵا (Super ego) ناکات و دڵی پێی خۆش نییە. لای ئۆرگانە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە ئاید خەمێکی پەروەردەیی نەبووە و نییە.

### (من)ی کوردی

من لە کۆمەڵگە نەریتییەکانی وەک ئێمەدا تەنها ئاماژەیەکی مەرجیانەیە بۆ جەستە، نە عەقڵ نە دەروون سەرنجمان ڕاناکێشن. لە (من)ی کوردیدا هەموو بوونی تاکەکە یەکسەر دەردەکەوێت و کە یەکێک بڵێ (من)، مانای وایە خۆی بە هەموو مێژوو و جوگرافیاکەیەوە لە بەردەمتدا حازرە و شتێکی نەماوە شاراوە بێ لە کەس. ئەم ساتە دەروونییە جۆرێک لە دابڕان لە خود و دواتر خۆبەستنەوە بە دەرەوەی خودی تیایە. (من) نۆردەرێکە بۆئەوەی سەنتەرێک بێ بۆ کۆنترۆڵ. کۆنترۆڵ بە مانا ئەرێنییەکەی، تا وەکو (من) لە هەموو جووڵە و بزۆزییەکانی دەروون و جەستە بەئاگا بێت و چارەنووسی بوونە مرۆییەکە نەکەوێتە ژێر هەژموونی هەڵچوون و سۆز و دیاردە نائیرادییەکانی دیکەوە.

هەڵە نیم ئەگەر پێموابێت تاکو ئێستا تاکی کورد (من)ی نییە، ئەمەش بە مانای ئەوەیە بوونەوەرێکین لە نێوان هێزە شەهوانییەکان لەلایەک و هێزە ستانداردە نەرێنییەکان لەلایەکی تر دێین و دەچین.

(من)ی ڕاستەقینە بەخێوکەرێکی ئەرێنی جەستە و دەروونە و بەرهەمهێنی (منی باڵا)یە، واتە منی باڵا لە کولتووردا خۆیمان بۆ نمایش دەکات.

تاکی کورد فەندەمێنتاڵییەتی لە زۆر لایەنەوە پێوە دیارە، لە ڕووی دەروونییەوە وەڵامدەرەوەیەکی ڕاستەوخۆی هەڵوێستە هەڵچوونی و سۆزییەکانە و زۆربەی هەرەزۆری ڕووبەرەکانی جووڵەی لە نێوان کار و کاردانەوە مەرجی و فیزیکییەکان پڕ دەکاتەوە، سایکۆلۆجیستییەکان بەم جۆرە تاکە دەڵێن هەڵچوو، کە ئەم تاکە بێ قووڵبوونەوە و بیرکردنەوە یەکسەر دەکەوێتە ژێر کاریگەری و وروژێنەرەکان و هەربۆیەش بە ئاسانی ڕام دەکرێت.

## (منی باڵا)ی کوردی

هەڵە نابین کە لەبری منی باڵا کولتوور بکەینە ئەلتەرناتیڤ، کولتووری ئێمە کولتوورێکی ترسا و شەرمنە، چونکە تاکەکانمان ترساو و شەرمنن، ترساوەکان زۆرترین پەنا بۆ شەڕانگیزی دەبەن، لەبەرئەوەی نەبادا ئەوانی تر بیانسڕنەوە، کەسی شەرمنیش خۆی و کۆمەڵگە تووشی ئایدزی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەکات و وای لێ دەکات بەرگەی هیچ نەگرێت، ئەم دوو خەسڵەتە لە پاڵ سنووردارنەکردنی شەڕانگێزی و خەرجنەکردنی عاقڵانەی غەریزەکانی تر، کولتوورێکی لەرزۆکی شەرمن و ترساوی بۆ هێناوینەتە ئاراوە، کە هەرگیز نەیتوانیوە کۆمەڵگە بکاتە خاوەنی سیستمێکی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی ئەوتۆ، کە ئیشی ئەوە بێ (من) ەکان وەک بوونەوەری عاقڵ بەرهەم بهێنێت و نامۆ نەبێت بە خودی خۆی.

منی ئێمە زۆر نامۆیە بە خودی خۆی و ئەمەش واتە ناتوانێت و ناوێرێت بیر بکاتەوە و ژیرانە بژی، وەک لە توێژینەوەیەکی مستەفای یوسف حەمەساڵحدا هاتووە (٢٠٠٩) دەربارەی نامۆبوون و کۆچ کردن، دەرکەوتووە ئەو گەنجانەی کە مەیلی کۆچکردنیان هەیە زیاتر لەوانی تر نامۆن بە خۆیان.

نامۆبوون ئەو دیاردە دەروونی و کۆمەڵایەتییەیە کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بوونی وجوودی و ئینسانی تاکەکانەوە و لێیەوە ترازانی (من) و (منی باڵا)ی تاک دەردەکەوێت، هەموو ئەمانەش ئاماژەن بۆ لاوازی منی کورد و سستی عەقڵانی بوونی ئەو تاکە. هەروەها لە توێژینەوەیەکی تریدا مستەفا (٢٠٠٩) بۆی دەرکەوتووە کە ناوەندی کۆنترۆڵی هەرزەکارەکان زیاتر دەرەکییە وەک لە ناوەکی، ئەمەش بەو واتایە دێت کە زۆربەی گەنج و هەرزەکارەکان بوونیان لە دەرەوەی خۆیانە و خاوەنی سەربەخۆیی نین لە هەڵسوکەوت و کاریاندا، هەرچیان بە سەردێت، ئۆباڵەکەی دەخەنە ئەستۆی دەرەوەی خۆیان و و بشیانەوێت هەر شتێک بکەن

پشت بە دەرەوەی خۆیان دەبەستن.

ئەم ئەنجامانە ئەوەمان بۆ پشتڕاست دەکەنەوە کە (من)ی کوردی و (منی باڵا) ی کوردی کە لە کولتووردا خۆی دەبینێتەوە لاوازن و ئەمەش تەواوی پەروەردەی کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی کۆمەڵگەی تێوە دەگلێت.

کۆمەڵگەی کوردی لە دۆخێکی سڕبووی دەستەپاچەیدایە، ئەم دیاردە سایکۆلۆجییە بە زۆربەی تاکەکانمانەوە دیارە، بە چاو دەبینین کە تاکەکانمان چەندە دەستەوسانن لە بەرانبەر بڕیارداندا، لە بەرانبەر هەستان بە کارێک، لە بەرانبەر خوێندن، بەردەوام بوون، خستنە بازاڕی سەرمایە، چوونە ناو پرۆژەی درێژخایەن، قسەکردن، جێبەجێکردنی ئەرک، داواکردنی ماف، کڕین و فرۆشتن، مانەوە لە وڵاتدا....

ئەم دۆخەش هەروا لەخۆڕا نەهاتووە، ئەمە بارێکی هزری قاڵبگرتووی عادەت پێوە گیراوە، کە کۆمەڵگە لە وەتەی هەیە بەرهەمی دێنێت و چین لە دوای چین هزری خۆی لەسەر بینا کردووە، دەستەپاچەیی قێزەونترین ستایلی ژیانە کە هەم تاک هەم کۆمەڵگە ناچار بە گرتنەبەری دەکات ئەم دیاردەی دەستەپاچەییە کە دەروونزانانی مەعریفی پێی دەڵێن learned Help lessness واتە دەستەپاچەیی فێر کراو، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا وەک باشترین ستایلی ژیان و مانەوەمان هەڵبژێدراوە و کەس لێی لانەداوە، تاکی ئێمە دۆخی هەڵچوون و سۆز و ورووژانی تێنەپەڕاندووە، ئەمەش بووەتە هۆی نائومێدبوون و پاسیڤ بوونیان، هەرئەمەشە وایکردووە نە خۆیان بناسن نە تواناکانیان، نە متمانەشیان بە خۆیان هەبێت.

پێداگری نووسەر لەسەر ئەم بابەتانە بۆ نائومێدکردن و ڕەشبینکردنی بەرانبەر نییە، بەڵکو هەوڵێکی هزری ستراتیژییە بۆئەوەی سەرەتاکانی دەرچوون بەرەو ئومێد و خۆشی دەستنیشان بکات، کاتێک کولتوورێکی ئاوا هێزی لەبڕ دەبرێت منێکی باڵای لاواز سەردەکاتە سەر تاکەکانی و عەقڵیان دەخەسێنێت و منی باڵای سست و لاواز توانای گونجانی عەقڵیان لەگەڵ دەرکەوت و دیاردە تازەکان نییە.

منێکی باڵای لەم شێوەیە هیچ کات بە گوێی عەقڵ ناکات، چونکە عەقڵ دنەی دەدات و بە ئاگای دێنێتەوە لەم هەمووە گێژاوخواردنە بە دەوری دەستەپاچەییدا، ئەمەش وا دەکات (من) لاواز بێت، ئەو کات بەهێزی منی باڵا بەمشێوە سەقەتە و ئایدی بەهێز زاڵ دەبن بەسەر تاکدا و ئیتر شەڕانگێزی شکست بە خۆشەویستی و ژیاندۆستی

دێنێت و ژیان یەکپارچە بە نەزعە و پاڵنەرە نەگریسەکانی بەڕێوە دەچێت.

لەمانەوە دەردەکەوێت، کە عەقڵی کوردی تەسلیمی هەژمونی هەڵچوونەکان بووە، ئەوەش هۆکاری هەموو ئەو ناڕێکوپێکی و ناسیستمییەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووریمانی تەنیوە، عەقڵی ئێمە زۆر کەمتەرخەم بووە لە داکوتینی دینگە بنچینەییەکانی وجوودی نەتەوەییمان و لێرەشدا بە دیاریکراوی دەسەڵاتی کوردی بەرپرسیارە و زیانی گەورەی لە هێنانەدی توخمە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەبوونمان داوە و نەیهێشتووە بیسەلمێنین کە عەقڵی ئێمەش توانای بونیادنانی دەوڵەت و قەوارەی سیاسی خۆی لە پاڵ کۆمەڵگەکانی تردا هەیە.

## ٢ - قوتابخانەی بوونگەرایی

کۆمەڵێک نەزەرییەساز هەن سەر بەم قوتابخانەیەن و کەسانی بەرجەستەن هەریەکەیان بە شێوازێک و لەچوارچێوەی ئەم قوتابخانەیەدا لە ئینسانی ڕوانیوە و لێکدانەوەی بۆ تاک کردووە، لەوانە کەسێکی وەکو ڤیکتۆر فرانکل، ئەو پێیوایە کاتێک دەتوانین بە تاکێک یان کۆمەڵگەیەک بڵێین ساغ لەڕووی دەروونییەوە کە تاکەکانی بتوانن ژیانێکی ماناداریان هەبێت، کاتێکیش ژیانیان مانادار دەبێت کە بتوانن مانا بۆ سات بە ساتی ژیانیان بدۆزنەوە، بە هەر شتێکەوە سەرقاڵ بوو ماناداری بکات، تەنانەت لە نارەحەتترین ساتە وەختەکانی ژیانیشیاندا مانا بۆ ناسۆر و ئازارەکانیان بدۆزنەوە، لەدەستدانی مانا یان کڵۆڵ بوونی تاک لە ئاست دۆزینەوەی مانادا بوونە ڕاستەقینەکەی ون دەکات و دەیخاتە نێو بەتاڵاییەکی بێ مانایی و تاک لەم بەتاڵاییەدا سەرسووڕما و نیگەران دەجووڵێت و دەخولێتەوە و دووچاری گرفتی جۆراو جۆری وجوودی دەبێت، ئەمەش وادەکات بەرگری بەرانبەر هەر وروژێنەر و کاریگەرییەکی دەرەکی لە دەست بدات، ناچار نامۆبوون و دەستەپاچەیی وەک میکانیزم بۆ هەڵکردنی هەڵدەبژێرێت، ئێمەی کورد ئەوەی هێناومانەتە بەرهەم لە مانا و گەیاندوومانەتە ئەمڕۆ، ئەو ستایلە کولتوورییەیە کە لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری، ئایینی، ئەدەبی و هونەری پێیگەیشتووین.

ئاستی گەشەی ئەم بوارانە، ئاستی هۆشیاریی و عەقڵبڕی تاکەکانمان نیشان دەدات بە خۆمان و دەوروبەرمان و جیهان، بێتوانایی ئێمە لە ئاست کولتوورە بەهێزەکانی دەوروبەرمان، بەشێکی زۆری پەیوەست بووە بە

سیستمی کارکردنی عەقڵی تاکی ئێمە لە گەڕان بە دوای ماناکانی ژیانی خۆی و بایەخدان بە هەر ساتەوەختێک کە کەسەکان دەیگوزەرێنن و بە هەر شوێنێک کە تێیدا ئامادە دەبن.

ڕۆلۆ مای، کە یەکێکی ترە لە سایکۆلۆژیستە بوونگەراکان و خاوەنی ئەم ڕستەیەیە کە دەڵێت: ((من ئێستا دەژیم و دەشتوانم سەر و کاری ژیانی خۆم بکەم))، پێیوایە تاکی دەروونساغ ئەو کەسەیە کە لە ئێستادا دەژی و ئێستای مانادار دەکات، ئەم لە ئێستادا ژیانە ڕێک تێڕوانینێکی وجوودیانەی پەتییە، لە ئێستادا ژیان لووتکەی عەقڵانییەتە، هەوڵی ئینسانە بۆ چیدی بەفیڕۆنەدانی کات، سەرقاڵبوونە بە پرۆژەکانی خودبوون، خەریکبوون بە ژیانی خۆتەوە، مانای سەربەخۆکردنی خود و سەندنەوەیەتی لەو هێزانەی لە دەرەوەی خۆی بوونیان سپاردووەتە نادیارەکان.

هەروەها مای پێیوایە کە بە تاکێک دەوترێت وجوودێکی ئەرێنی و چالاکییە کە پەیوەندییەکی باشی هەبێت لەگەڵ هەر سێ جیهانەکەیدا کە بریتین لە جیهانی خود، جیهانی دەرەوە (سروشت) و جیهانی ئەوانی تر (خەڵک)، ئەم ڕایە چڕبوونەوەی بۆچوونی زۆربەی سایکۆلۆجیستە سەربەم قوتابخانەیەن ئەگەر تاک بەرهەمهێنەرێکی نەرێنی بن بۆ ئەوەی ڕابردووە و هەر بە ئومێدی ئەوە بن سبەینێ دەروازەیەکی خێریان لێ بکرێتەوە، ئەوا هەم تاک و هەم کۆمەڵگەش لە بەتاڵاییەکی وجوودیدا دەیباتە سەر و دووچاری کێشە و شۆکی گەورە گەورە دەبێتەوە...

زۆربەی زۆری تاکەکانی کۆمەڵگەی ئێمە لە بۆشاییەکی وجوودی گەورەدان، بەرهەمهێنی ژیانێک نین ئێستا بگوزەرێت، بۆ ئەمڕۆیان ناژین، چێژ لە نۆستالیژیا و گەڕانەوە بۆ یادەوەرییە کۆنەکان وەردەگرن، هەربۆیەش بەو خەزینەیەی لە ڕابردوودا پڕیان کردووە لە بێمانایی، بۆ ئایندەیەک دەژین کە هەرگیز وەک خۆیان ویستوویانە پێی نەگەیشتوون و زۆرجار لە نەخوێندنەوەیان و پەی پێنەبردنیان دووچاری شۆکی گەورەی ئەوتۆ بوون و خستوونیەتە لێواری نەمانی ماتریاڵیستەوە.

کارڵ ڕۆجەرزیش، وەک یەکێکی تر لە نەزەرییە سازەکانی قوتابخانەی بونگەرایی، دەربارەی مرۆڤ بۆچوونی وایە، کە تەنها خودی خۆیەتی بتوانێت

چارەنووسی خۆی ئاراستە بکات و ببێتە بەڕێوەبەری خۆی، (تەنها) مەبەست لە ئەوە نییە کە ئیتر لە ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیدا پێویستی بە ئەوانی تر نییە، بەڵکو بەومانایەیە کە خۆی نەبێت کەس ناخی ئەوی پێ ناخوێنرێتەوە، ئەم تەرکیزکردنە سەر خودی خۆت بە مانای ناسینی خۆتە،، ناسین بەو مانایە نا کە من ناوم چییە و ئیشم چیە و جەستەم چۆنە، بەڵکو بە مانای شۆڕبوونەوە دێت بۆ قوڵایی ناخ، ناسینی ئەو شتانەی من دەورووژێنن و ئەزموونە کەسییەکانم پێکدەهێنن، واملێدەکەن بوونێکی سەربەخۆم هەبێت کە تەنها ئەم بوونەیە وادەکات ئاگاداری ناوەوە و قووڵایی خودی خۆت بیت و ڕەنگدانەوەی ئەوانی تر نەبیت.

## ئەبراهام مازلۆ

ئەم سایکۆلۆژیستە بونگەراییە بە (هەڕەم)ەکەی بەناوبانگە کە بوونی ئینسان پۆلێن دەکات بە سەر بوونی بایۆلۆجی، سایکولۆجی و کۆمەڵایەتیدا، هەرچی بوونی بایۆلۆجییە خۆی لە نیازە سەرەکی و فیزیکییەکانی مرۆڤدا دەبینێتەوە، کە پلەی یەکەمی هەڕەمەکەی گرتووە، پاشان بوونی کۆمەڵایەتی کە خۆی لە نیازەکانی وەک ئارامی و ئاسایش، خۆشەویستی و عەشق، دواتر بوونی سایکۆلۆجی کە خۆی لە نیازی ڕێز و بەهادا دەبینێتەوە، لەسەر ئەم بوونانەوە بوونێکی تر هەیە کە پێی دەوترێت بوونی تێرسێندڵێنتاڵ کە خۆی لە بەدیهێنانی خود و زانیارییە لوتکەییەکاندا دەبینێتەوە.

بە لای مازلۆوە ژیانێکی دروست و بە بەرهەم دەبەسترێتەوە بە هەلومەرجە هەنووکەیی و هەرە واقیعییەکانەوە و هەرگیز سازش لەسەر داخوازی و نیازەکانی جەستە و پێداویستە وجوودییەکان ناکات، بە لای ئەوەوە بوونی بایۆلۆجی بنەما و بناغەی هەموو بوونەکانی ترن دواجار ئەم پۆلێنبەندییە مرۆڤێکمان دەداتێ هاوسەنگ و ساغ و گونجاو و داهێنەر، بەختەوەر و شاد، لە خۆی تێدەگات و دەزانێت بۆ دەژی.

هەروەها مازلۆ وەک دەروونناسەکانی تری قوتابخانەکەی ئێستا و ئێرەی بەلاوە گرنگە و بە مەرجی دەزانێت بۆ گەیشتنە لوتکەی هەڕەمەکەی کە خۆی لە کەسی شاد و دەروونساغ و داهێنەر و خۆ بەڕێوەبەردا دەبینێتەوە، دیارە لای ئێمە خەڵک لە کوێی ئەم هەڕەمەدایە و هێشتا گرفتی لە پلەی یەکەمی بوونەکانیدا هەیە کە بوونی بایۆلۆجییە.

## ٣ - قوتابخانەی ڕەفتارگەرایی

ڕەفتارگەراکان تێڕوانینیان بۆ ئینسان زیاتر لەسەر بناغەی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانییەتی نەک بیر و هۆش و بۆماوە و ژیرییان، ئەمەش بەومانایە نایەت کە کاریگەری ئەمانە سفر بکەینەوە، پێیانوایە ژینگە وەک باکگراوندێکی سەرەکی سەرچاوەی پێکهاتن و دروستبوونی ڕەفتارە، چ باش چ خراپ ئەمەش بە هۆی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو وروژێنەرانەی کە لە ژینگەدا هەن.

لە دیدی سایکۆلۆژیستێکی وەکوو سیگنەردا، کاتێک تاک لە وەڵامی وروژێنەرێکدا ڕەفتارێک ئەنجام دەدات، سەیری ئەنجامی ڕەفتارەکە دەکات، گەر سوودێکی تیا بوو بۆی، ئەوا بەشێوەیەکی تر هەوڵی دووبارەکردنەوەی دەدات، هەر ئەو سوود و چێژ بردنەشە دەبێتەوە بە هاندان و دووبارە دەبزوون و ناهێڵن لە ئاستێکدا بوەستێت. سکینەریش ئەوەندە ئیشی لەسەر واقیع و ئێستای مرۆڤە ئەوەندە ئاوڕ لە ڕووداوەکانی ڕابردوو ناداتەوە. پێیوایە عەقڵ لەژێر کاریگەری وەرچەرخانەکانی ژینگەدایە و کاتێک لەڕووی ماتریاڵەوە ژینگە گۆڕانکاری بە سەرداهات، ئەوا ڕەفتاریش دەگۆڕێت و دواتریش عەقڵیش بەشێوەیەکی گونجاو دەگۆردرێت، ڕەفتاریزم لە هەموو ڕوانگەکانی دیکەی دەروونزانی زیاتر ئیش لەسەر یاسا و ڕێسا و سیستم دەکات، یاسا دەروونییەکان، یاسا ڕەفتارییەکان، سیستەمە سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتووریی و ئابوورییەکان...

ژیانی ئێمە هەر لە بنچینەوە کەمترین ئاشنایەتی لەگەڵ سیستەم هەبووە، پەرچەکردار بە زۆربەی ڕەفتارەکانمانەوە دیارە، چونکە خۆمان چالاک نەبووین و نەمانتوانیوە هاوسەنگانە پەیوەندی لەگەڵ بابەتە وروژێنەرەکانی دەرەوە ببەستین، هەروەک وەڵامدراوەیەکی پەرچەکرداری ماوینەتەوە و ئەو هەڵوێستانەشمان لە میزانی ڕەفتاری و زیندەگی خۆمان بە زۆر شتەوە کە ئێستا لەگەڵیان دەژین بۆ ماوەتەوە.

لە هەر ساتەوەختێکی تازەدا مرۆڤ شتی تازەتر لە هەڵوێست و ڕەفتاری جوداتر دەبینێت، دەنگی تر دەبیستێت، بۆنی شتی تر دەکات، کە جەستەی بەر شتێکی تر دەکەوێت، جیاواز لەوەی پێشوو بەری دەکەوێت، کەواتە هەردەم و ساتێ کەسەکان لە بارێکەوە دەچنە بارێکی تر، باشە ئەی مانای مانەوەی تاک لە بارێکی جێگیری نەگۆڕدا چییە؟ ئایا ئەوە خۆیانن پێیانوایە ناگۆڕێن؟ یان پەیمانێکە و داویانە، کێشەی کۆمەڵگە نەگۆڕەکان، کە هی ئێمەش دەگرێتەوە، ئەوەیە تاکو ئێستا پێمانوایە (نەگۆڕی) پرەنسیپێکی جوامێرانە و بژاردەیەکی ئەخلاقیانەیە بۆ ژیان، ئەم

تێگەیشتنە لە گوتاری کولتووریی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و و ئایینیشماندا ڕەگی داکوتاوە، مانەوە لە یەک باردا ململانێیەکی سەخت و گۆڕاوە لەگەڵ ژیان.

تاکی ئێمە دەبیستێت، بەڵام بڕیاریداوە گوێ نەگرێت، دەبینێت، بەڵام بڕیاریداوە کوێر بێت کێشەی ئێمە لەو نەگۆڕییەدا باش بەخێونەکردنی هەستەکان و دواتر شعورمانە. کە ئەم دووانەشمان پەروەردە نەکرد تا ماوین نازانین پەی بە شتەکان بەرین، ئەم نەبینین و نەبیستنە بە هیچ زانینی ئێستا و ئایندەیە و مانەوەیە لە ڕابردوودا، ئەم جۆرە مرۆڤانە خانەی شێرپەنجەیین و لەناو جەستەی کۆمەڵگەدا بە گۆڕینی ستایڵ و دواتر تایپی ڕەفتاریان نەبێ، هیچ ئومێدێک نییە بۆ شیفای حاڵی کۆمەڵگە.

ڕەفتارگەراکان ئەم تەمبەڵیەیان قبووڵ نییە و دەیانەوێت هەمیشە بەخەبەر بین، دەیانەوێت ژینگە بسازێنن و پڕی بکەن لەو وروژێنەرانەی ڕەفتارەکانمان ئاڕاستە دەکەن و ژیانمان بۆ سیستماتیک دەکەن، بەڵام بەداخەوە ئێمە حەزمان بە سیستم نییە و ئەو ناڕێکوپێکییەی لە واقیعی ژیانی ئێستاماندا هەیە باشترین بەڵگەی قەڵسبوونمانە بە سیستەم و خۆڕێکخستن. سەیری شارەکانمان بکە، نە لەڕووی نەخشەی شارسازی، نە لەڕووی هاڕمۆنیەتی فیزیکی و کۆمەڵایەتی و ئابووریشەوە، ئەوەی شاری ڕاستەقینە دەیەوێ بوونی نییە.

سەیری ترافیک و قەرەباڵغی شەقامەکان، شۆستەی هاتوچۆ و ئاوسانی شەقامەکان بە ئۆتۆمبێل بکە، ڕۆژ نییە فشاری هاتوچۆ و فشاری خەڵکیش بەرزنەکەنەوە و جەڵتە لە دڵی شار نەدات، ئەو بێسەروبەریی تێکەڵبوونەی لە بازاڕ و دووکانەکاندا دەبینرێت، تەڕە و میوەفرۆش، زێڕینگەر، دەستگێڕ و تەنەکەچی و چەرەسات فرۆش و بەهارات و مەخزەن... دۆخێکی وایان لە سەنتەری شارەکان هێناوەتە ئاراوە ئەوەی سیستم بێ ناچێ بە لایدا، ئەمەش دنیایەک وروژێنەری بێزارکەری بەرداوەتە گیانی خەڵک و تاکەکانیش وەک بازاڕ شڵەژاون و کاریگەری زەقیان لەسەر ڕوخسار و بەر لەوەش دەروونییان داناوە.

ڕەفتارییەکان کە سەرنجی سەرەکییان لەسەر سیستمە، بە مانایەک لە ماناکان قسەیان لەسەر عەقڵانییەتە بە دیوە ئەرێنی و مەتریاڵیەکەیدا، سیستم لە عەقڵانیەت زیاتر هیچی دی ناگەیەنێت، عەقڵیش مانای ڕێکوپێکی و خۆڕێکخستنەوە و دانانی هەر شتێکە لە شوێنی خۆی، کەسی شیاوە بۆ شوێنی شیاو.

ئەم ژیانەی لە وڵاتی ئێمەدایە چی دیکە ژینگەی ژیان نییە، زیاتر لە گۆڕستانی زیندووەکان دەچێت، ئەم سەرزەمینە کە هەر وروژێنەرێکی مردنێکت بیر دەخاتەوە

به چ یاسا و ڕێسایەک پێی دەوترێت شوێنی ژیان؟ ئاخر لێرە کێشەی دەروونی لە جۆری هەڵچوونی زیاد و تورەبوون و بوختان بۆ یەکتر هەڵبەستن و پاشملە قسە لەسەر یەکتر کردن و پاشقول لە یەکتر گرتن تا دێت زیاتر دەبێت، نەخۆشییە دەروونی و عوسابییەکانی وەک دڵەڕاوکێی نائاسایی و خەمۆکی و هستریا و مانێک و پارانۆیا و وەسواسی هزری و فۆبیا... لە ئەوجدان، ئەم بێ لە نەخۆشییە عەقڵییەکانی وەک خەمۆکی عەقڵی و هالۆسینەیشن و شیزۆفرۆنیا و سایکۆز.

ئەم هەمووو وروژێنەر و وریاکەرەوانەی چواردەورمان هەم لایەنی دەروونی و کۆمەلایەتی و هەم باری ئابووریی و سیاسی وڵاتیشی گەیاندووەتە ئەم ناسیستمی و شڵەژانە.

کۆمەڵگەی ئێمە لە دوای شەڕی کەنداو کە ڕاپەڕینی لێکەوتەوە، تا ئێستاش هەر لە دۆخی ڕاپەڕیندایە و نەنیشتووەتەوە، لەڕووی سایکۆلۆجییەوە نەمانتوانی ئەم هەلە دیفاکتۆ نێودەوڵەتییە بقۆزینەوە و بیکەین بەو شوێنەی لەوەتەی هەین خەونی پێوە دەبینین، ئێمە لە ئێستادا نەدەژیاین، هەربۆیە ئەوەندە بایەخمان بەم شوێنە نەدا تا بحەسێینەوە، یا لە ڕابردوویەکی تێکچڕژاو گێرەمان دەکرد و هەر لەبەر شان و باڵی پیاوانی پێش خۆمان هەڵدەدا فلان شەهید و فلان سەرکردە و فلان خەبات یان بۆ ئایندەیەکی نادیار دەمانکۆشا وەک لە وتاری سیاسیماندا دیارە، دروستکردنی کوردستانێکی ئاوەدان، بونیادنانی تاکە دەوڵەتی دیموکراسی لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست.. ئەم دوو جۆرە ژیانەش ڕاکردنێکی نەستیانە بوو لە ژیان و ژینگەسازی، بۆیە ڕەفتارگەرانیش دەیانەوێت مرۆڤ و مرۆڤایەتی سیستماتیزە بکەن، بۆئەوەی چیدی ئەم بوونەرە خاوەن ئامادەباشییە عەقڵییە نەکەوێتە بەر لێزمەی نەزانی و چیدی ون نەکردنی لە نێو نەبوونیدا.

### دەروونزانی ئەرێنی و چەمکی شادی لای کەسێتی کورد

قوتابخانەی دەروونزانی ئەرێنی قوتابخانە و ڕێبازێکە زیاتر قسە و باسیان لەسەر تاکی ساغ و عەقڵی هاوسەنگ و کەسانی داهێنەر و دواتر کەسی شادومان و خۆشگوزەرانە. ئامانجی ستراتیجی مرۆڤ لە بوون و بەردەوامی لە ژیانیدا، خۆش ژیان و هێنانە ئارای شادومانییە مرۆڤ بۆ ئەوە دەژی دڵخۆش بێت و هەموو ئەو هۆکارانەش فەراهەم بکات کە ژیانی ئەو خۆشتر دەکات.

بابەتی شادومانی لە ئێستادا لە نێوەندە ئەکادیمییە جیهانییە پێشکەوتووەکاندا بووەتە بابەتی سەرەکی و بە لایانەوە گرنگە ئەو فاکتەر و گۆڕاوانە بدۆزنەوە کە ڕۆڵیان هەیە لە پێکهێنانی تاک و کۆمەڵگەی شاد و ئارام. شادومانی جگەلەوەی دەروونی کەسەکان دەحەوێنێتەوە کاریگەری ڕاستەوخۆشی هەیە لەسەر بەرهەمهێنانی زیاتر و زیادبوونی دەستکەوتی مرۆڤ.

> **عەقڵی کوردی تەسلیمی هەژموونی هەڵچوونەکان بووە، ئەوەش هۆکاری هەموو ئەو نارێکوپێکی و ناسیستمییەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووریمانی تەنیوە.**

مارتن سلیگمان کە بە دامەزرێنەری ئەم مەدرەسەیە دادەنرێت بەمشێوەیە باس لە شادومانی دەکات، مرۆڤ پێویستی بە زیاتر لەوەیە کە تەنها هەڵەکانی ژیانی بۆ ڕاستبکەیتەوە، ئەوان ژیانێکی پڕمانایان دەوێت، نایانەوێت تا ماون شەڕ لەگەڵ لایەنە لاوازەکانی کەسێتی خۆیاندا بکەن، ئیدی کاتی ئەوەیە سایکۆلۆژیا لە هەڵچوونە نەرێنییەکان تێبگات و لایەنی هێز و بەهای جوان بۆ مرۆڤ فەراهەم بکات، ئەمەش بەو مانایە نایەت کە سلیگمان بیەوێت ڕوانگە سایکۆلۆژییەکانی پێش خۆی کە زیاتر تەرکیزیان لەسەر دیوە تاریکەکەی مرۆڤە کەمبایەخ بکات، چونکە هەردوو ڕوانگەکە بە ڕێگای خۆیان دەیانەوێت تاک بەرەو شادومانی بەرن.

فێربوونی شادومانی کردەیەکی درێژخایەنی مرۆییە و لە زۆر کۆمەڵگەی گەشەسەندوودا خراونەتە پرۆژەی وەبەرهێنان لەسەر تاک و دواتر لە کردەی کۆمەڵایەتیبووندا، ئەرکێکی ئەخلاقی و پەروەردەیی و تەنانەت زانستیشە، شادومانی پرۆژەیە بۆ ژیان و دەبێت لە بەرنامەی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتووری هەر کۆمەڵگەیەکدا لەناو پلانەکانیاندا جێی بکرێتەوە و بنەخشێنرێت.

## ماناکانی شادومانی

مانای کولتووری: کولتوورەکانی مرۆڤایەتی لێکجیان لە هێنانە کایەی شادومانی و فەراهەمکردنی بۆ تاک، لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا پابەندبوون بە پێوەرەکانی زۆرینە هەیە، کۆمەڵگەی کوردیش سەرمەشقی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانەیە، ئەم پابەندبوونە بە مانای کپکردنی مەیلی تاکە بۆ شادومانی، بەمەش تاک بۆ ئاستێکی بوهیمی ئەوتۆ بچووک دەبێتەوە کە هەر سک و بەرسکی خۆی دەبێتە پێوەرەکانی شادومانی و بۆی گرنگ نییە ئەوانی تر لە خۆشیدا بن یان هەر بارێکی تری دەروونی، بۆیە کولتوور کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر شێوازی ئەزموونکردنی شادی لەلایەن تاکەکانییەوە.

هەندێک کولتوور هەن کراوەتر و نیانترن لە هی دیکە و بە ڕووی گۆڕانکارییە جیهانی و دەرەکییەکاندا دانەخراون، هەربۆیە ئەم جۆرەیان زیاتر بەرهەمهێنە بۆ شادی و بایەخ بە گرنگی شادومانی دەدا لە گەشەی دەروونی تاکەکاندا، دواتر ئەمە کاریگەری دادەنێت لەسەر لایەنەکانی تری وەک ڕۆحی و دەروونی و کۆمەڵایەتی، بە پێچەوانەشەوە، ئەو کولتوورانەی داخراون و ناهێڵن تاکەکانی بێ ئاگاداری سەردارەکانی شاد بن. نەک هەر کێشەی دەروونی و عەقڵیان تیادا زۆرە، بەڵکو ئاستی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی.. تیایاندا نزمە و تاکەکانی لە خودی خۆیاندا دەچەقن و ناگەشێنەوە.

## مانای سیاسی شادومانی

فەرمانڕەوای باش، جوان ئیدارەدان، دادی کۆمەڵایەتی، هاوسەنگی لە نێوان ماف و ئەرکدا، بەشداری پێکردنی کارای تاک لە پرۆسەی سیاسیدا، ئەمانە تاک دەکەنە تەوەری پرۆژەی گەشەی مرۆیی، کە تاکیش هەستی کرد ئەو گرنگترین سەرمایەیە و هەرچی دەگوزەرێت لە وڵاتدا بۆ بەختەوەرکردنی ئەوە ئەوا کۆمەڵگە وەک ماشینێک بە جوانی هەڵدەسووڕێت.

لە سەرزەمینی ئێمەدا ئامانج و هۆکار بۆ ئیشکردن بەرەو بەدیهێنانی شادومانی تێکەڵی یەکتر بوون، تێکەڵبوونی ئەم دوانەش سیستەم دادەڕمێنێت و ئۆلیگارشیەتی ژیانی سیاسی لە وڵاتدا دادەپۆشێت، تەنها بەرژەوەندی تاکەکەسی و خۆشگوزەرانی ئەوان لەسەر تابلۆی سیاسی کۆمەڵگە دەردەکەوێت و تاکەکانی تر تووشی گۆشەگیری دەبن، ڕۆڵیان لە چالاکی سیاسیدا تەنها ژمارەیە.




## مانای ئایینی شادومانی

ئایین دۆخێکە لە ڕەزامەندی دەروونی، تاک پێویستی پێی بووە بۆئەوەی کاتێ وەڵامێکی ڕەزایەت بەخشی لێ دەستکەوت یەکسەر بیپەرژێتە سەر سەرقاڵییەکانی و بگاتە بارێک لە ئارامی ڕۆحی و دەروونی.

لە دنیادا ئایینەکان چوونەتە نێو ململانێکانی دەسەڵات، بۆئەوەی ڕووبەرێکی فراوانتری دەسەڵات بۆ خۆیان و باوەڕەکەیان فەراهەم کەن و ئەوانەی وەک خۆیان نین بیبەزێنن، ئەمەش زاڵ بووە بەسەر لایەنە ڕۆحییەکەی ئاییندا، کە مرۆڤ پێویستیەتی، ئەرکی ئایین شادومانکردنی تاکەکان نەبووە بەقەد ئەوەی ترساندن و تۆقاندنی تاکەکان بووە، ئەمانەش لەگەڵ ئامانجەکانی شادومانی و کامەرانی و خۆشگوزەرانیدا یەکناگرنەوە.

## مانای ئابووری شادومانی

ئابووری ئەو فاکتەرە گرنگەیە کە کۆمەڵگەکان دەگەیەنێتە گەشەی سیاسی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و دەروونیش. دروشمی زۆرترین شادومانی بۆ زۆرترین خەڵک بووەتە دروشمی سەرەکی لە زۆربەی وڵاتە گەشەسەندوو و پێشکەوتووەکاندا، بەداخەوە بەپێی ڕووپێوی UN لە ساڵی ٢٠١٥دا عێراق لە ڕیزبەندی (١٠٥)ەمین وڵاتی دنیادایە و زۆر لە دواویە. ئەمەش بەهۆی کەڵەکە بوون و ئاڵۆزبوونی کێشە سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان. وەبەرهێنانەکانی ئابووری دەبێت بچنە بواری وەبەرهێنان لەسەر مرۆڤ، چونکە سەرەنجام ئەگەر مرۆڤەکان ئاسوودە و ئارام و شاد نەبن، بە زەوق و شەوقەوە نایەنە نێو جووڵەی دینامیکی کۆمەڵگە و پێشکەوتنی.

## مانا کۆمەڵایەتییەکانی شادومانی

کۆمەڵگەی شاد بە لاساییکردنەوە یان حەز و مەیلی نۆستالیژیا و ژیانکردن وەک ئەو کەسانەی کە بوون بە ڕابردوو دروست نابێت، بەڵکو بە ژیانکردن لە ئێستادا وەڵامدەرەوەی دەرکەوتەو وروژێنەرە تازەکان بونیاد دەنرێت، چێژی شادومان زۆر درێژخایەن و ڕۆحییە و کەسەکە دەکات بە بوونەوەرێکی شادومان، کاتێک بە سیستمێک کە کۆمەڵگە بەڕێوەدەبات دەوترێت سیستم کە ئەم بارە دەروونییە بخولقێنێت، نەوەک شادی خۆی ببەستێتەوە بە شادی نەوەکانی ڕابردووەوە، لە کۆمەڵگە خۆرهەڵاتییەکاندا بە سیستمی پەروەردە و خوێندن و فێربوون،

ڕاگەیاندن، ڕێکخراو و حیزبە سیاسییەکان و حکومەت خەریکی نائومێدکردنی تاکن و کەمترین تێگەیشتن و تێفکرینیان هەیە بۆ پرۆژەی شادومانکردن.

ئەمانە چیدی پەیوەندییان بە سیستمەوە نییە، چونکە بەهێزترین توخمی سیستم گونجانە لەگەڵ بابەتە تازەکان و ڕاهاتنە لەسەر دەرکەوتەکان کە لای ئەمانە نییە.

## ئێمە لە کوێی شادومانیداین؟

بەپێی ئەم شیکردنەوە و ئارگۆمێنتە زانستییانە لەسەر شادومانی و هەلومەرجەکانی هاتنە ئارای و ڕۆڵی لە ژیان و فەزا جوداجوداکانیدا، ئاسانتر دەگەینە ئەم باوەڕەی کە تاکی ئێمە و کۆمەڵگەکەشمان شادومان نییە، چوون شادومانی دۆخێکی درێژخایەنە وەک لەوەی چێژبەرێکی ساتەوەختی(٢) بێت، تاکی ئێمە ماوەیەک شادومان و دڵخۆشە و پێدەکەنێت و ڕادەبوێرێت، دەیان ماوەی تر نایبینێتەوە، شادومانی کەشە دەبێت بخوڵقێت بۆئەوەی تیایدا هەناسە بدەیت و چالاک بیت.

شادومانی ئامانج نییە، بەڵکو پرۆسەیە و وەکو ڤیکتۆر فرانکڵ دەڵێت دەبێت مرۆڤ لە خۆیەوە لە خودی خۆیدا بەرەو شادومانی بچێت، ئەمەش بە دۆزینەوەی مانا بۆ ژیان فەراهەم دەبێت، واتە دەیەوێت مرۆڤ هەر ڕووی لە خۆی نەبێت و بەقەد هەوڵی بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی شادومانی بۆ خۆی هەوڵی فەراهەمکردنی بۆ خەڵکانی تر بدات بۆئەوەی کەمێک لە خۆی دابڕێت و بتوانێت لە دەرەوە کەش و فەزا بۆ دۆزینەوەی مانا بۆ ژیانی بسازێنێت.

ئێمە و تاکەکانمان، واتە سیستمی وڵات و خۆشمان وەک تاک شادومانی بەردەوام نین، یاخود دەکرێت بڵێین هەر شادومان نین، بەڵکو چێژبەرین و چێژبەریش شتێکی وای فەرق نییە لەگەڵ ئەو بوونەوەرانەی تر کە هەر بۆ ئەوە دەژین زیندوو بمێننەوە.

ساتەوەختەکانی خواردن و خواردنەوە، مووچە وەرگرتن و پارە دەستکەوتن، سەردانی ئەم و ئەو، ساتەکانی سێکس و بەشێک لە خەو.... هەموویان ساتەوەختەکانی شادییەکی هیدۆنیتین و ماوەیەک دەردەکەون و ماوەیەک نامێنن، سەرقاڵبوون بە پێویستییە بنچینەییەکان و نیازە بایۆلۆجیەکان و کردنیان بە ئامانج لای تاک و کۆی کۆمەڵگە، دوورخستنەوەیەتی لە ژیان و شادومانی عەقڵ و دەروون و ڕۆح.

شادومانی بارودۆخێکی ڕێژەییە و هەمیشە تاک دەبێت لە هەردوو سەرە جەمسەرەکەی شادی و ناشادی کێرڤەکە بەرەو شادی بەرێت، گەر وا نەکات ئەوا ئاستی شادومانی دادەبەزێت. بەکورتی، شادومانی بە تەنها بە لایەنێک و فەزایەکی ژیان فەراهەم نابێت، هەموو بوارەکان بەیەکەوە یەکێتییەک لە هەلومەرج دەخوڵقێنن و لە نێویدا زۆرترین هەستکردن بە شادی دەبێت.

لە بواری سیاسیدا کوردستان دابەشبووە بۆ حیزب و گرووپ و ڕێکخراوی سیاسی کە ئەم دابەشبوونە بەپێی فۆڕمی دیموکراسی و مەدەنی نییە، فۆرمی سیاسی و حیزبی لای ئێمە ڕۆحی عەشیرەت و هۆز چووەتە جەستەی، هەربۆیە حیزب وەکو عەشیرەت دەژی و عەشیرەت حیزبی وا لێکردووە تەنها بۆ خۆی و ئەوانەی سەربەون بژی، نەیتوانیوە سنوورەکانی حیزب تێپەڕێنێت و ئینتیمایان بۆ کۆی نیشتمان هەبێت نەک حیزب، تاک لە کاری سیاسیدا تەنها دەروێشە و بۆ خۆپارێزی پەنای بردووەتە ئەوێ نەک بۆئەوەی لە ڕێی حیزبەوە گەشە بکات و گەورە بیر بکاتەوە، لەبەرئەوە تاکەکان لەناو سیستمێکی وادا چۆن شاد دەبن و چۆنیش دەتوانن شادی ببەخشن بە سیستمەکە.

لەڕووی ئابووریشەوە، تاک بەکاربەرێکی پاسیڤە ڕۆڵەکەی بونیادنەر نییە. بوونی لە کایەی ئابووریدا بازاڕێکی بۆ خولقاندوین ناچێتە چوارچێوەی بازاڕی مەعقوولەوە.

شادومانی پایەیەکی ئەستووری لەسەر ئابوورییەکی هاوسەنگ دادەمەزرێت، ئەگەر ئەم هاوسەنگییە نەما، ئەوا حەز و خواستە نێرگزییەکان بە سەر فەزای ئابووریدا زاڵ دەبن و ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر دەروونی تاکەکان و دنیایەک کێشەی دەروونی و شڵەژانی کەسێتی و نەخۆشی عوسابی و عەقڵی یەخەی کۆمەڵگە و تاکەکانی دەگرێت.

لە بواری کۆمەڵایەتیشدا، عورفە بە میرات ماوەکان و دەستە تایەفی و عەشیرەتییەکان زاڵی سەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتین و تەکنەلۆژیا و تەکنیکیش نەیانتوانی کاریگەری لەسەر تایپی بیرکردنەوە و خەیاڵی کۆمەڵگەیمان هەبێت، یاساکان هەرگیز نەیانتوانیوە هەژموونی دابونەریت کەمبکەنەوە، هێشتا نەریت ئاڕاستەی ژیانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.

لە ڕووی کولتووریشەوە، لە جووڵەدا نین و لە بارێکی (وەسوەس)انەدا

وەستاوین، کولتوورەکەمان نەدەتوانیّ بۆ تازەبوونەوە هەنگاو بنێت نە توانای جێهێشتنی نەریتی هەیە، ئەم دوالیزمە بە بەرهەمەکانی نووسەران و شاعیرانیشەوە دیارە و تەنانەت لە کاری هونەریشدا ئەم دۆخە شیزۆفرۆنیایە دەبینرێت.

بەرهەمە شیعرییەکان ئومێد و خاڵی گەشاوەی شادومانییان تیا نابینرێت، زیاتر بە ڕەنگدەرەوەی دۆخە سایکۆلۆجییەکەی نووسەر و شاعیرەکانن.

لە هونەری گۆرانیشدا، تەنها لاوانەوە و نوزانەوە و لەدەستدان و میوزیکی هێواشە ئەگەر خێرا ڕۆییەکیش لە میوزیکدا هەبێت ئەوا تەنها چێژی ساتەوەختییە و دوای ئاهەنگ و بۆنەکان کەسەکان دەچنەوە بارە شڵەژاوە بەردەوامەکانیان. بەهۆی ئەو شڵەژانەی کە باری ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی گرتووەتەوە، کولتوور کولتوورێکی خەمناک و نیگەرانە و شادومانییەکانی ساتەوەختین.

دەرەنجامی دیاری ئەم باسە پێمان دەڵێت: هۆشیاری لە کۆمەڵگەی ئێمەدا شادومانکردنی تاکەکانی بەلاوە بە ئەندازەی خەمناککردنیان پێ گرنگ نییە، تا ئێستا کەسە خەمناک و خەمۆکەکان سەنگی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسییان زیاترە. کاتێک ناشادی لە کولتووردا زیاتر لە شادی بێتە بەرهەم، بەڵگەی ئەوەیە تاکەکانی کۆمەڵگە ئارەزووی جووڵە و بزۆزی عەقڵ ناکەن، لەوەشەوە سستی جووڵەی کۆمەڵگە و ئەرگانەکانی بەم زەوقییەی کە هەیە دەردەکەون.

**پەراوێزەکان**

١- لیبیدۆ: دەستەواژەیەکە لە دەروونشیکاریدا بەکاردێت بۆ وەسفکردنی ئەو وزەیەی، کە بەهۆی هێزی مانەوە و هێزی غەریزەی جنسی دروست دەبێت.

2- hedonist.







پ.ی.د. شۆخان محمود حسێن، مامۆستای زانکۆ/ پسپۆڕی کۆمەڵناسی

# تایبەتمەندی کەسایەتی کورد

## لەبەر ڕۆشنایی تێڕوانینی گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکاندا



سروشت و تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی مرۆڤ، یەکێکە لەو پرس و بابەتە گرنگ و هەستیارانەی کە ئەندێشە و سەرنجی زۆرێک لە بیرمەند و زانا و توێژەرانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و هەوڵیانداوە بەپێی پسپۆڕی و دونیابینی خۆیان، پێناسە و شرۆڤەکارییەکی ورد بۆ ئەو بابەتە بکەن، لەوبارەیەوە دەروونناسی بە ڕەگەز ئەمریکی گۆردن ئەڵپۆرت(١٨٩٧-١٩٦٧) بەجۆرێک پێناسەی کەسایەتی دەکات کە بریتییە لە: «ڕێکخستنێکی دینامیکی پەنهانی ناو ناخی تاک، کە بەرپرسە لە دیاریکردنی تایبەتمەندی و ئاکار و بیرکردنەوە و ڕەفتاری تاک»، ئەوەش دەخاتەڕوو کە کەسایەتی بریتییە لە : سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤ١، هاوکات دەروونناسی ئەمریکی(لۆرانس برافین) کەسایەتی بەوە پێناسە دەکات کە بریتییە لە: ڕێکخستنێکی ئاڵۆزی زانیاری و ویژدان و ئاکار، کە ئاڕاستە و سەمتێک بە ژیانی ئەو کەسە دەبەخشن، یاخود لە کۆمەڵێک بونیاد و کردەوەی ئەوتۆ پێکهاتووە، کە سروشت و شارەزایی ئەو کەسەی تێدا ڕەنگدەداتەوە٢، هاوکات (رایموند بیرنارد کاتل) دەروونناسی ئەمریکی، کەسایەتی بەو ڕەفتارە دیار و نادیارانە پێناسە دەکات، کە پێشبینی دەکرێت کەسێک لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا ئەنجامیانبدات٣، جێگەی سەرنجە کە پسپۆڕ و شارەزایانی بواری دەروونناسی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بۆماوە کاریگەریی و شوێنەواری توند لەسەر کەسێتی تاک جێدەهێڵێت و ڕەفتار و بیرکردنەوەی تاک ئاڕاستە دەکات.

ئەمەش لە کاتێکدایە بیرمەند و زانایانی کۆمەڵناسی و زانستە مرۆییەکان، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە پاڵ بۆماوە، ژینگەی سروشتی و جوگرافیا و کولتوور و کۆمەڵگە، سیما و تایبەتمەندی کەسایەتی تاک دیاری دەکەن، لەوبارەیەوە بیرمەند و کۆمەڵناسی فەرەنسی (ئەمیل دۆرکهایم) پێوایە کەسایەتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و کۆمەڵگە و عەقڵی دەستە جەمعی کار لەسەر چەسپاندنی کەسایەتی و سیما بنەڕەتییەکانی تاک دەکات، بەجۆرێک هەر لە منداڵییەوە تاکو پێگەیشتینی هەڵگری کۆمەڵێک سیفات و تایبەتمەندی کۆمەڵگاکەیەتی، ئەوەش دەخاتەڕوو کە

١ . الخليل، الدكتور أحمد محمود، الشخصيه الكورديه، المطبعة موكرياني، ط١، اربيل، ٢٠١٣، ص٢٥.

٢ . حەسەن، محەمەد فەریق، تایبەتمەندی تاکی کورد، چاپخانەی تاران، چ١، ٢٠٢٠،ل٤١-٤٢.

٣ . حسين، شۆخان محمود، کاریگەری ململانێ سیاسییەکان لە پێکهێنانی سیماکانی کەسێتی کورددا (توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری سلێمانی)، تێزێکە پێشکەشی بەشی کۆمەڵناسی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە، بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢، ل ١٩.

کەسایەتی لە ئەنجامی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەردەکەوێت و دەچەسپێت٤، هەر لەوچوارچێوەیەشدا کەسایەتی بە دیاردەیەکی مێژوویی لەقەڵەم دەدرێت کە بەپێی کات و شوێن لە گۆڕاندایە و بەوە پێناسە دەکرێت، کە بریتییە لە کۆی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندێتی و توانا جەستەیی و دەروونی و سۆزداریی و هزرییە بۆماوە و وەرگیراوانەی مرۆڤ، کە لە پرۆسەی گەشەکردنی مێژووییدا بەدەستی هێناوە و لە کەسانی دیکەی جودا دەکاتەوە٥.

لەم سەربەنەوە و بەرمەبنای تێروانینی شارەزایان دەکرێت بەوە پێناسەی کەسایەتی بکەین، کە بریتییە لە کۆی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری تاک، کە لەڕێگەی بۆماوە و ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتییەوە بەدەستیهێناوە و بەهۆیەوە لەوانی دیکە جیاواز دەردەکەوێت .

هاوکات شارەزایان بەهۆی ئاڵۆزیی و فرەڕەهەندی چەمکی کەسایەتییەوە، بەشێوەیەکی جیاواز لە کەسایەتی کۆمەڵ یاخود نەتەوەیی دەڕوانن، لەوبارەیەوە مێژوونوسی فەرەنسی (لوسیان فیفر١٨٧٨-١٩٥٦) پێیوایە کە کەسێتی نەتەوە یان گەل بریتییە لە هاوبەش بوونی تاکەکانی گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو لە کۆمەڵە سیفاتێکی ئاکاری، کە بەهۆیەوە جیای دەکاتەوە لە کەسێتی نەتەوەیەکی دیکە٦، بەوەش پێناسە دەکرێت کە بریتییە لە: سیما گشتییەکانی گەلێک یاخود نەتەوەیەک لەڕووی جەستەیی و مەزاج و بیرکردنەوە و  شێوازی ڕەفتار لە دۆخە جیاوازەکاندا. ٧

ئەگەرچی کورد یەکێکە گەلە دێرینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام مێژووی دراسەکردن و هەوڵدان بۆ ناسینی سیما و تایبەتمەندییەکانی کەسێتی تاکی کورد، دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی هەوڵ وچالاکییە فرە ڕەهەندەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە بەشێوەیەکی گشتی لە سەدەی نۆزدەدا بەمەبەستی پاراستنی بەرژوەندییە ئابووریی و سیاسییەکانیان و ناسینی(جوگرافیا، مێژوو، کولتوور، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ئاین و ئاینزاو ... )ی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، دەستیان بە کنەوپشکنین

---

٤ . حسین، شۆخان محمود، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٥ . شاوەیس، پ.ی.د. دلێر، کەسایەتی مرۆڤی کورد، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٢٦، ٢٠٠٠، ل ٢٣٢.

٦ . الخلیل، الدکتور أحمد محمود، المصدر السابق، ص٢٧.

٧ . حسین، شۆخان محمود، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

و لێکۆڵینەوەی مەیدانی کردووە، لەوچوارچێوەیەشدا بەشێکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکان لە ئەنجامی تێکەڵبوون و مانەوە لەنێو کۆمەڵگەی کوردی، شارەزاییەکی باشیان لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئایین و مێژوو و کەسێتی و خووڕەوشت و ڕەفتاری تاکی کورد بەدەستهێناوە و دواتریش تێڕوانینی خۆیان لەسەر کەسێتی تاکی کورد لە چوارچێوەی کتێب و بڵاوکراوەکانیاندا خستووەتەڕوو.

**دەزگا و ئامرازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی کوردیدا، نەیانتوانیوە کەسێتییەکی تەندرووست بۆ تاکی کورد بەدیبێنن.**

به بڕوای کوردناسی ڕووسی (ڕۆدینکۆ)، سروشتێکی هاوسەنگ لە کەسایەتی کورددا بوونی هەیە، لەڕووی سایکۆلۆجیشەوە پەسنێکی ڕوونی کەسێتی تاکی کورد دەکات و دەڵێت:» کوردەکان وشکن، بەڵام هەرگیز دڵڕەق نین، سەرکەش و سەربەرزن، بەڵام لەخۆبایی و لوت بەرزنین، عاتفی نین، بەڵام دڵسۆز و دڵپاکن، وردو بەسەرنجن..»٨، هاوکات ئارشاک سافراستیان، ڕۆژهەڵاتناسی ئەرمەنی، لەبارەی کەسێتی کوردەوە دەڵێت:» کوردەکان خاوەنی هەست و ڕوویەکی گەش و بەخەندەن، لەڕووی جەستەییەوە تەندرووستن و هیچ نیشانە و ئاسەوارێکی دڵەڕاوکێ و دەمارگرژییان پێوە دیار نییە»٩. ئەمەش لەکاتێکدایە کە هەندێک لە

٨. عثمان، هەردی حمەسعید، کەسێتی کوردی لە دیدی کوردناسانی ڕووسیا و یەکێتی سۆڤیەتدا ١٨٥٠-١٩٣٩ ، نامەی ماستەر پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە، بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢، ل١٢٦.

٩. سافراستیان، ئارشاک، کورد و کوردستان، و. ئەمین شوان، چاپخانەی ئاراس، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥،ل ١٤٦ ؛ کاکە سوور، نادیە عمر، بنەماکۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی کەسایەتی کوردی توێژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژییە لە هەرێمی کوردستانی عێراق، تێزی دکتۆرایە پێشکەشی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی

ڕۆژهەڵاتناسەکان سیمای ئازایەتی و بەهەیبەتی ودڵنیایی لە کەسێتی تاکی کورددا بەدی دەکەن، لەوبارەیەوە گەشتەوان و بازرگانی فەرەنسی(ژان باپتیست تاڤێرنی) لە ساڵی ١٦٣٢دا بە کوردستاندا تێپەڕیوە و کەسێتی بەهێز و کاریگەری میرێکی کورد سەرنجی ڕاکێشاوە و دەڵێت:» میری بەتلیس لە میری هەموو وڵاتێکی دیکە بەهێزتر و سەرنجڕاکێشترە، لەبەرئەوەی نەسەر بۆ سوڵتانی عوسمانی دادەنەوێنێ و نە پاشای فارسەکانیش بەهیچ دەزانێت، ئەمەش لە کاتێکدابوو کە هەموو میرەکانی دیکە سەربە یەکێک لەم دوانەبوون»١٠، هاوکات (ڕۆدینکۆ) ئاماژە بە بوێری و چاونەترسی و ڕاستگۆیی کورد دەکات و دەڵێت:» هیچ کوردێک لەوە ناترسێت ڕاستییەکان چەندێک تاڵ و ڕەقیش بن لەڕووی فەرمانڕەوایەکدا چەندیش بە دەسەڵاتیش بێت بڵێت، هەرگیز دانابەزێتە ئاستی درۆ و فێڵبازیکردن»، ئەوەش دەخاتەڕوو کە کورد لە مەیدانی جەنگ و ئازایەتیدا کەس ناتوانێت شان لە شانی بدات ١١.

هاوکات هەندێک لە کوردناس و ڕۆژ هەڵاتناسەکان سیمای ژیریی و زیرەکی لە کەسێتی کورددا بەدی دەکەن و پێیانوایە تاکی کورد ژیر و بەتوانان، لەوبارەیەوە بەدرخان سندی ئاماژە بە تێڕوانینی هەریەکە لە (مێجەر سۆن و تۆمابواو باسیل نیکیتین) دەکات کە تاکی کۆمەڵگەی کوردی بە ژیرو زیرەک ناودەبەن، تەنانەت میجەرسۆن کورد بە زیرەکترین گەل ناوی دەبات١٢.

لەلایەکی دیکەوە زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان کۆکن لەسەرئەوەی کە کورد گەلێکی ڕووخۆش و دەم بەخەندەن و هەمیشە ئارەزووی گاڵتەوگەپ دەکەن و کەیفیان بە بەزم و خۆشی و شادی دێت، لەوبارەیەوە هامڵتۆن ئاماژە بەوە دەکات کە:» وێڕای ئەوەی کورد دوورە پەرێزن و مەیلەو ڕەوشتی سکۆتلەندین، بەڵام شەیدای گەمەو گاڵتەن»، کە ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی دەروون درووستی تاک. ئەمە جگەلەوەی کە سیمای ڕێزگرتن لە گەورە و ژنان و میواندۆسی کورد،

سەلاحەددین کراوە ، بڵاونەکراوە، ٢٠١٢.ل٧١-٧٢.

١٠. پیربال، د. فەرهاد، کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١١٣.

١١ . عثمان، هەردی حمەسعید، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦-١٢٩.

١٢ . سندی، پرۆفیسۆر بەدرخان، کۆمەڵگەی کوردەواری لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسیدا، چاپخانەی خانی، چ١، دهۆک، ٢٠٠٨، ل١٥-١٦.

یەکێکە لەو بابەتانەی کە گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکانی تووشی سەرسوڕمان کردووە، لەوبارەیەوە باسیل نیکیتین سەرسامی خۆی بەرامبەر ڕێزی منداڵ بۆ گەورەکان دەخاتەڕوو، کە پێیوایە:»مۆرکی ڕێزلێنان پەیوەستە بە مرۆڤی کوردەوە»١٣، سەبارەت بە میواندۆستی و دڵفراوانی کوردیش، ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی (خاچاتۆرۆف)، ئەوە دەخاتەڕوو کە میوانداری تایبەتمەندییەکی جوان و گەرمی نەریتی نێو کوردەکانە، کەسیان دەست بۆ میوان نابەن و زیانی پێناگەیەنن، ئەگەر دوژمنی سەرسەختیشی بێت، بەباشی مامەڵەی لەگەڵ دەکات١٤.

بەشێوەیەکی گشتی سیما و تایبەتمەندییەکانی کەسێتی کورد، مۆرک و سروشتێکی چەسپاو و هەمیشەیی نییە، بەڵکو بەپێی کات و شوێن و لەژێر کاریگەری کارتێکەرە سروشتی و سیاسی و کولتوورییەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە، ئەمەش لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە، کە هەریەکە لە هۆکارەکانی(مێژوو، جوگرافیا، کولتوورو کۆمەڵگە) ڕۆڵیان لە خەملێن و چەسپاندنی سیماکانی کەسێتی کورددا هەیە. ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە مێژوو و پاشخانی مێژووی کورد کاریگەری نەرێنی توندی لەسەر کەسێتی کورد جێهێشتووە، چونکە بەدرێژایی مێژوو کورد و کوردستان لەلایەن گەل و دەسەڵاتە زلهێزەکانی ناوچەکەوە داگیرکراو بوون و بەشێوە و ئامرازی نادرووست مامەڵەی لەگەڵدا کراوە و هەمیشە بوون و پێگەی ڕەتکراوەتەوە. هەرئەمەش وایکردووە کە لەلایەکەوە هەمیشە تاکی کورد لە دۆخی بەرگریدابێت لەپێناوی مانەوە و ڕزگاری خۆیدا، لەلایەکی دیکەوە ئەم دۆخە مێژووییە وای لە تاکی کورد کردووە کە هەمیشە لە ترس و ناسەقامگیری و دڵڕاوکێدا بژی و بۆتە هۆی دەرکەوتنی سیمای نەرێنی لە کەسایەتییاندا١٥.

فاکتەری جوگرافیاش، یەکێکی دیکەیە لە هۆکارانەی کاریگەری لەسەر کەسێتی کورد داناوە، بەجۆرێک سەختی هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان و تۆبۆگرافیا و جیاوازی پلەی گەرمی بەپێی وەرزەکان، سیمای سەرکێشی و گیانی بەرەنگاری و ئازایەتی و دوورەپەرێزی و پتەوی جەستەیی بە کەسێتی کورد بەخشیوە، چونکە پرسی مانەوە لە ژیان، خەڵکی ناوچەکەی ناچار کردووە کە خۆی لەگەڵ ئەو

---

١٣ . سندی، پرۆفیسۆر بەدرخان، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦-٣٨.

١٤. عثمان، هەردی حمەسعید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.

١٥ شاوەیس، پ.ی.د. دلێر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٢-٢٣٣.

جۆرە جوگرافیا و ئاووهەوایەدا بگونجێنێت، لەلایەکی دیکەوە سەختی هەڵکەوتەی جوگرافی لە ڕابردوودا هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ دابڕاوی ناوچە و هەرێمەکان لەیەکتری، هەر ئەمەش وایکردووە کە تاڕادەیەک ناوچە و هەرێمە جیاوازەکانی کوردستان خاوەنی جۆرێک لە کولتوور و نەریتی و شێوەزاری تایبەت بەخۆیان بن[١٦].

کولتوور یەکێکی دیکەیە لەو فاکتەرە سەرەکیانەی کە ڕۆڵی سەرەکی و بەرچاو دەبینێت لە بونیادنانی کەسایەتی تاکدا، کە بە بڕوای ئەنسرۆپۆلۆجیستی ئینگلیزی(ادوارد بیرنت تایلور١٨٣٢-١٩١٧)، بریتییە لە گشتێکی ئاڵۆز لە زانست و زانیاریی و هونەر و هزر و بیروباوەڕ و یاسا و دیسپلین و دابونەریت و ترادسیۆن، یاخود بە دەربڕینێکی تر بریتییە لە گشت ئەو فێربوون و نەریتانەی کە مرۆڤێک وەک ئەندامێکی کۆمەڵگە وەریدەگرێت[١٧]، واتا و ناوەڕۆکی چەمکی کولتووریش، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە کولتوور بابەتێکە ڕاستەوخۆ بە ڕەفتار و بیرکردنەوەی تاکەوە بەستراوەتەوە و لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا کاریگەری لەسەر کەسێتی تاک دروست دەکات، کە بێگومان هەرئەمەش هۆکارێکە بۆ جیاوازی کەسێتی نەتەوەکان، هەربۆیە لەژێر کاریگەری بەجیهانی بوون و هەژموونی کولتووری خۆرئاوا، بەشێکی زۆر لە بەها و دابونەریتە جوانەکانی کۆمەڵگەی کوردی کاڵ بوونەتەوە یاخود گۆڕانیان بەسەرداهاتووە، هەرئەمەش کاریگەری لەسەر سیما و تایبەتمەندییەکانی کەسێتی تاکی کورد دروستکردووە.

فەیلەسوف و زانای کۆمەڵناسی فەرەنسی(ئیمیل دۆرکهایم١٨٥٨-١٩١٧ )، ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤ بۆئەوەی لە کۆمەڵگاکەیدا شوێنی شیاوی هەبێت و لەنێو گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا نرخی بۆ دابنرێت، هەوڵدەدات لەگەڵ بەهاو بنەما و ئاڕاستە باوەکاندا کارلێک بکات، هەربۆیە مرۆڤ لە منداڵییەوە لە خۆگونجاندنی بەردەوام و فێربوونی زمان و ئەو نیشانە و ئاماژانەدایە کە لە کۆمەڵگاکەیدا پەیڕەوی دەکرێن، کە بێگومان پێویستی بە پرۆسەیەکی دوور مەوداو سەختی کۆمەڵایەتی و کولتووری هەیە کە بە پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ناسراوە، کە پرسەیەکە بۆ پێکهێنانی کەسایەتییەک کە لەچوارچێوەی کولتووردا توانای

---

١٦ کاکە سوور، نادیە عمر، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣-٧٦.

١٧ محەمەد، د.کامەران، ڕەنگدانەوەی کەلتوور، چاپخانەی کارۆ، چ١، سلێمانی، ٢٠٢٠، ل٦٠.

کارلێکی کۆمەڵایەتی هەبێت، کە ئەمەش پرۆسەیەکی لەسەرخۆیە و لە ڕێگەی دەزگا و فەرمی و نافەرمییەکانی وەک(خێزان، قوتابخانە، گرووپی هاوڕێیان، دەزگای ئاینی، ڕاگەیاندن، حزبی سیاسی، ڕێکخراوەکان ...)ەوە، تاک کەسایەتی کۆمەڵایەتی خۆی بەدەستدێنێت.١٨

بەرمەبنای ئەوەی کە خرایەڕوو، دەکرێت ئاماژە بەو ڕاستییە بکەین کە دەزگا و ئامرازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی کوردیدا، نەیانتوانیوە کەسێتییەکی تەندرووست بۆ تاکی کورد بەدیبێنن، چونکە هەروەک ئاشکرایە هەرێمی کوردستان زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە لە گێژاوی قەیرانە ئابووریی وسیاسیەکاندایە و نەیتوانیوە زەمینەسازی بۆ فەراهەمکردنی خێزانێکی خۆشگوزەران و تەندرووست بکات، کە یەکەم دامەزراوەی گرنگە بۆ پێگەیاندنی تاکێکی تەندرووست. جگەلەوەش بەهۆی خراپی ڕەوشی پەروەردە و فێرکردن و نەبوونی دونیابینییەکی گەش و فراوان و قەیرانە بەردەوامەکانی ناوچەکە، قوتابخانە و دەزگا پەروەردەییەکان نەیانتوانیوە بەشێوەیەکی درووست لە پێکهێنانی کەسێتی تاکی کورددا ڕۆڵ ببینن، هاوکات بەهۆی هەژموونی بەرژەوەندیخوازیی و کولتووری کۆمەڵگەی وڵاتان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی، گرووپی هاوڕێیان بەشێوەیەکی نەرێنی شوێنەواری خۆی لەسەر کەسێتی منداڵ و گەنجی کۆمەڵگەی کوردی درووست کردووە، چونکە توێژینەوە زانستییەکان سەلماندوویان کە هاوڕێ گەورەترین کاریگەری لەسەر منداڵ و هەرزەکار درووست دەکات، ئەمەش لە کاتێکدایە کە دەزگا ئاینییەکانیش بەهۆی هەژموونی ئایدۆلۆجیای حزبی و سنوورداری چالاکییەکانیانەوە، نەیانتوانیوە بە ڕۆڵی ئەرێنیانەی خۆیان هەستن.

هەرچی سەبارەت بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش لە ئێستادا گەورەترین کاریگەری نەرێنییان لەسەر کەسێتی تاکی کورد درووستکردووە، بەتایبەتیش تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی ئەوەی سنوور و سانسۆری نییە، تاڕادەیەکی زۆر کاریگەری نەرێنی لەسەر کەسێتی تاک بەگشتی و کەسێتی کورد بەتایبەتی دروستکردوو .

---

١٨ . کاکە سوور، نادیە عمر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢-٢٣.





## سەرچاوەکان


پیربالّ، د. فەرهاد، کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦.

حسین، شۆخان محمود، کاریگەری ململانێ سیاسییەکان لەپێکهێنانی سیماکانی کەسێتی کورددا توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شاری سلێمانی، تێزێکە پێشکەشی بەشی کۆمەڵناسی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە، بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢.

حەسەن، محەمەد فەریق، تایبەتمەندی تاکی کورد، چاپخانەی تاران، چ١، ٢٠٢٠.

الخلیل، الدکتور أحمد محمود، الشخصیە الکوردیە، المطبعة موکریانی، ط١، اربیل، ٢٠١٣.

سافراستیان، ئارشاک، کوردو کوردستان، و.ئەمین شوان، چاپخانەی ئاراس، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥.

سندی، پرۆفیسۆر بەدرخان، کۆمەڵگەی کوردەواری لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسیدا، چاپخانەی خانی، چ١، دهۆک، ٢٠٠٨.

شاوەیس، پ.ی.د. دلێر، کەسایەتی مرۆڤی کورد، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٢٦، ٢٠٠٠.

عثمان، هەردی حمەسعید، کەسێتی کوردی لە دیدی کوردناسانی ڕووسیا و یەکێتی سۆڤیەتدا١٨٥٠-١٩٣٩)، نامەی ماستەر پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە، بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢.

کاکە سوور، نادیە عمر، بنەماکۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی کەسایەتی کوردی توێژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژییە لە هەرێمی کوردستانی عێراق، تێزی دکتۆرایە پێشکەشی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین کراوە، بڵاونەکراوە، ٢٠١٢.

محەمەد، د. کامەران، ڕەنگدانەوەی کەلتوور، چاپخانەی کارۆ، چ١، سلێمانی، ٢٠٢٠.





پ.ی.د.کامەران محەمەد

# داگیرکاریی و نامۆبوون

(ڕۆڵی ڕێکەوتنامەی سایکس پیکۆ لە قوڵکردنەوەی نامۆبوونی خودی کوردیدا)

## دەسپێک

ئەگەر نامۆبوونی خود ئەو دۆخە بێت کەوا لە مرۆڤ بکات، نەبێتە (چەق)ی جیهانەکەی خۆیی و وەک دروستکەری کردار و هەستەکانی خۆی ژیان نەگوزەرێنێت، واتە دەسەوسان بێت لەو شوێنەی کە پێویستە مرۆڤ لە ژیاندا بۆ خۆی داگیری بکات و هەست بە شوێنکەوتەیی یاخود پەیوەندیدارێتی بۆ کەسێکی تر یان دەستەیەکی تر بکات. ئەوا نامۆبوونی خودی کوردی لە مێژوودا قوڵایی خۆی هەیە و تەنها بۆ کاتێکی دیاریکراو ناگەڕێتەوە! چونکە دروستبوونی ئەو دۆخە ترسناکە (کە نامۆبوونە) پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە سرووشتی ژێردەستەیی کوردەوە هەیە. کوردستانیش بەشێوەیەکی گشتی داگیرکراو و بەشێوەیەکی واقیعی جوگرافیایەکی پەرت بووە. لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژوو گۆڕەپانی پێکدادانی زلهێزەکان بووە!

نامۆبوونیش وەک چەمکێکی فرە واتا و فرە ڕەهەند ڕۆڵی گەورەی لە بەدیهێنانی کێشەگەلێکی قوڵی (وجودی) سەبارەت بە مرۆڤ گێڕاوە. مرۆڤی کوردی لە خود داماڵیوە و هەستکردن بە کۆیلایەتی و تێکشکان و لاوازیی و دەسەوسان بوون لە بڕیارداندا و گۆشەگیریی و شێواندنی گونجانی کۆمەڵایەتی و پەرتکردن و ملکەچپێکردن ... تاد، لە ناخدا چاندووە. تا ئێستا نامۆبوون لە ئەدەبیاتی ئێمەدا وەک بابەتێکی نێو کایەی دەروونناسی یان کۆمەڵناسی لێی ڕوانراوە! بە دەگمەن بەرچاومان دەکەوێت، مێژوونووسێک ئاماژەی بۆ ئەو پرسە کردبێت! ئەمە لەکاتێکدا ئەوەندەی دروستبوونی ئەو دۆخە پەیوەستە بە مێژوویەکی ماوە درێژەوە ئەوەندە هەڵقوڵاوی واقیعێکی کۆمەڵایەتی کتوپڕ و هەنوکەیی نییە!

نامۆبوونی خودی کوردی لە بەشێکی گەورەی مێژوودا ئامادەیی هەبووە، بەڵام لە دوای ڕێکەوتنامەی سایکس- پیکۆ(١٩١٦)وە ئەو دۆخە خودی کوردی تووشی کێشەی ئێجگار قوڵکرد، کە هەرگیز لە پێش ئەو ڕێکەوتنامەوە ئەو دۆخە نەگەیشتبووە ئەو ئاستە ترسناکەی کە لە دوای ئەو ڕێکەوتنامەوە ئەو خودەی ڕووبەڕووبوویەوە! بەتایبەت ئەو ڕێکەوتنامەیە بۆ یەک سەدەی تەواو کوردستانی پارچە پارچە کرد و هەر پارچەیەکیشی بۆ دەسەڵاتێکی بەهێز ملکەچپێکرد. بۆیە جێی خۆیەتی کە ئێستا و دوای تێپەڕبوونی سەدەیەک بەسەر ئەو ڕێکەوتنامەیەدا هەڵوێستە لەسەر جێکەوتەکانی ئەو دۆخە بکرێت و تەواوی شوێنەوارەکانی لەسەر کەسێتی و بزووتنەوەی مرۆڤی کورد لە ژیاندا بخرێتەڕوو.

## هەلومەرجی مێژوویی کوردستان و نامۆبوونی مێژوویی کورد

وشەی (نامۆبوون)ی کوردی بەرانبەر بە وشەی (الاغتراب)ی عەرەبی و (Alienation) ئینگلیزی و (Alienation) فەرەنسی و (Entfremdung) ئەڵمانی بەکارهاتووە. هەردوو وشە ئینگلیزی و فەرەنسییەکە لە وشەی لاتینی (Alientio) داتاشراوە[١]. ئەوەش ناوێکە واتاکەی خۆی لە فرمانی (Alieare) ەوە وەرگرتووە، کە واتای گواستنەوەی موڵکییەتی شتێک بۆ کەسێکی تر و داڕنین یاخود لابردنی دەگەیەنێت. ئەم فرمانەش لە وشەیەکی دیکەوە (Alienus) وەرگیراوە، کە واتای پەیوەندیداریێتی (انتماء) بۆ کەسێکی تر، یا خۆهەڵواسین پێوەی دەگەیەنێت. ئەمیشیان لە کۆتایدا لە بێژەی (Alius)ەوە هاتووە و گوزارشت لە (ئەویتر) دەکات، جا ئەو کەسە ناو بێت یاخود ئاوەڵناو[٢].

ئەگەر گواستنەوەی موڵکییەتی شتێک بۆ کەسێکی تر و داڕنین و زەوتکردن و لابردنی، (نامۆبوون) بگەیەنێت، ئەوا مێژووی کورد لە ڕووخانی (دەوڵەتی ماد) ەوە تا ئێستا مێژوویەکە بە بەردەوامی نامۆبوونی بەرهەمهێناوە. بەواتایەکی تر مێژووی نامۆبوونە! چونکە هەڵکەوتەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان و بوونی بە گۆڕەپانی بەریەککەوتنی زۆرینەی ململانێکانی نێوان زلهێزان لەڕووی سەربازیی و هەوڵە فراوانخوازییەکانیان، وایکردووە لە کۆنەوە و لە زۆربەی قۆناغە مێژووییە جیاجیاکاندا پارچەکراو و ژێردەستەی دوو هێزی پاوانخواز و داگیرکار بێت[٣]، لە پێش هاتنی سوپای ئیسلامیدا کوردستان گۆڕەپانی پێکدادانی ئیمپراتۆریێتی (ئێرانی – گریکی، ئێرانی – ڕۆمانی) بووە. دواتر دەبێتە گۆڕەپانی تێپەڕبوونی سوپای ئیسلامی بۆ خۆرهەڵات و باکوور، کاتێکیش دەسەڵاتی خەلافەت لە (دیمەشق، بەغداد) بەهێز دەبێت، کوردستان دەبێتە مۆڵگەی بزووتنەوە بەرهەڵستکارەکانی خەلافەت! دواتر کۆی ئەو جەنگ و بەیەکدادانەی لە ماوەی پێنج سەدەدا و لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتەکانی ئێران (سەفەوی، ئەفغانی، ئەفشاری، زەندی، قاجاری) ڕوویداوە، بیست و چوار جەنگ بووە، کە بە جەنگی چاڵدێران

---

١. فيصل عباس: الاغتراب الانسان المعاصر وشقاء الوعي، ط١، بيروت، ٢٠٠٨، دار المنهل اللبناني، ص١٩.

٢. ريتشارد شاخت: الاغتراب، ترجمه: كامل يوسف حسين، المؤسسة العربية للدراشاتت والنشر، ط١، بيروت، ١٩٨٠، ص٦٣.

٣. هیوا عزیز: دابەشبوونی کوردستان و کاریگەری لەسەر ستراتیجی ناسیۆنالیزمی کوردی، گۆڤاری زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی، بەرگی ٢، ژمارە١، ٢٠١٦، ل٤٣٢.

له ساڵی ١٥١٤ دەستیپێکرد، تا سەردەمی فەتح علی شای قاجار (١٧٩٧-١٨٣٤) بەردەوام بوو، گۆڕەپانی تەواوی ئەو جەنگانەش خاکی کوردستان بوو.٤ تەنانەت ئەو میرنشینە کوردییانەی لە سەردەمی ئیسلامی و دواتر لە سەردەمی نوێدا دادەمەزرێن، بەشێوەیەکی گشتی سەربەخۆنین و گەر بەناویش بێت بۆ دەسەڵاتە ئیمپراتۆرێتییەکە دەگەڕێنەوە.٥

لێرەوە دەتوانین بڵێین بەدرێژایی ئەو ماوە دورودرێژە کوردستان داگیرکراو بووە و کوردەکان خاوەنداریێتی خاکەکەی خۆیان بە زۆر و ناچاری لەدەستداوە و وەک نامۆیەک لە نیشتمانەکەی خۆیاندا مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە. سەرەڕای ئەوەش بە چەندەها هۆکار هەوڵدراوە لە خشتە ببرێن و پەیوەنداریێتییان (انتماء) بۆ (بەرانبەر) نەک (خود) تێدا دروستبکرێت و بەردەوام تۆخ بکرێتەوە. واتە نامۆبوون لە کۆمەڵگەی کوردیدا بە پلەی یەکەم دەرهاویشتەی بارودۆخێکی نائاساییە کە کۆمەڵی کوردەواری پێیدا تێپەڕیوە، ئەویش هەلومەرجی ژێردەستەیی کورد و زەوتکردنی خاکی کوردستان بووە.

هەرچەندە وشەی نامۆبوون ڕیشەکانی بۆ بەشێک لەو تەرزانە دەگەڕێتەوە، کە هەندێ لە فەیلەسوفەکانی یۆنانی وەک سوکرات و ئەفلاتون خستوویانەتەڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرا بۆ (کتێبی پیرۆز- پەیمانی کۆن) دەگەڕێتەوە٦. کارەساتی مرۆیی تایبەت بە هەڵەی یەکەم و کەوتنی مرۆڤ و خواردنی بەرهەمە قەدەغە کراوەکە لەلایەن ئادەم و حەواوە و دەرکردنیان لە بەهەشت. ئەو سەربەنانە بوون کە بیرۆکەی نامۆبوون لە میانەیاندا دەرکەوت. دواتر ڕووبەڕووبوونەوەی ژیانی دوالیزمی ڕاوەستاو لەسەر ئەو ململانێیەی لە نێوان جەستە و ڕۆحدا دروستبووە و سەرپێچی کردنی خودا لەلایەن ئادەمەوە٧. هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەو جیابوونەوەیەی لە نێوان مرۆڤ و خودادا لە ئەنجامی تاوانەکەدا دروست بوو.

هەروەها دۆخی جیابوونەوە لە نێوان جیهانی زەمینی و جیهانی ئاسمانی

---

٤. ه.س، ل٤٣٢.

٥. شەمسی محەمەد ئەسکەندەر: مێژووی کورد لەسەدەی شانزەهەمدا، هەولێر، ١٩٨٨، ل٧٦-٧٥. بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە: زرار صدیق تۆفیق: هۆز و دەسەڵاتە هۆزەکییە کوردییەکانی چاخی ناوەڕاست، و.ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ١، هەولێر، ٢٠١٠.

٦. فیصل عباس: م.س، ل٢٠.

٧. پەیمانی کۆن، پەرتووکی پەیدابوون، ٣،٢.

لەو نامەیەدا دەبینینەوە کە قەشە پۆلس بۆ خەڵکی ئەفسوسی نارد، کە دەڵێت:» ئەوان لە تاریکی نەزانیاندا ڕۆچوون، بەهۆی دڵڕەقی و ئەوەی کە لە ناویاندایە، بەرانبەر بە ژیانی خوداوەند نامۆبوون».[8] دەتوانرێت بەکارهێنانی هزرییانەی وشەی نامۆبوون بۆ لاهوتی پرۆتستانتی بگێڕدرێتەوە، بەتایبەت بۆ لۆثەر و کالڤن. ئاینزای پرۆتستانتی بیرۆکەی ناوەندگەری لە نێوان خودا و مرۆڤدا ڕەتدەکاتەوە، هاوکات جەخت لەسەر بەردەوامبوونی پەیوەندی نێوان خودی خودا و خودی مرۆڤ - بەبێ هیچ ناوەندیگەرییەک- دەکاتەوە و ئەو پەیوەندییە بە شیاو دەزانێت. هەروەک بە گرنگی دەزانێت کە بەسەر (نامۆبوونی نێوان خودا و مرۆڤ)دا زاڵبێت[9]. کالڤن دەڵێت:» بێگومان مردنی ڕۆحیی جگە لە نامۆبوونی ڕۆح لە خوددا شتێکی تر ناگەیەنێت[10]». لە سەردەمی ڕێنیسانس و سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم چەمکەکانی (نامۆبوون) و (جیابوونەوە) لە پانتایی لاهوتەوە بۆ فەلسەفە گوازرانەوە، واتە لە گەرمەی کەشی ململانێی لاهوتیدا و ململانێی زانستی- لاهوتیدا. ئەمەش یا بۆ گونجاندنی لاهوتی کاسۆلیکی بوو بۆ پێداویستییە بۆرجوازییە هەڵکشاوەکان، یاخود لەپێناو خودی خواستەکاندا و بۆ دەرکردنی لاهوت لە گۆڕەپانی ماف و ئاکار و فەلسەفەدا بوو[11].

لە گەرمەی ئەو ململانێیەدا کۆمەڵە ئاڵۆزییەک لە نێوان پەیوەندی تاک و کۆمەڵگە، ئازادی تاک و ئازادی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگەی سیاسیدا دەرکەوت. ئازادی تاکەکەس ڕێگەی خۆی کردەوە بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی و لە شێوەی ئازادی تاکی بۆرجوازی و تەواوی کۆتە فیوداڵی و کۆمەڵە پیشەییەکانی تێپەڕاند.

لە سەربەنی ئەو واتایانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە (دابڕان) و (جیابوونەوە) ئەو پرۆسانەن کە نامۆبوون دروست دەکەن و بە ئەندازەی فراوانبوونیان دۆخی نامۆبوونەکە قوڵتر دەکەنەوە، جا ئەو نامۆبوونە دەشێت لە نێوان مرۆڤ و خودا، یان تاک و کۆ یاخود مرۆڤ و نیشتماندا ڕووبدات.

شوێن یەکێکە لە ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی دروستبوونی مێژوو و لە ئاڕاستەکردنی

---

٨. فیصل عباس: م.س، ص ٢٢.

٩. ن.م، ص ٢١.

١٠. ریتشارد شاخت: م.س، ص٧٠.

١١. فیصل عباس: م.س، ص٢٢.

ڕووداوەکانی مێژوودا بە تەنها سەکۆیەکی بێ چرپە و بێ کاریگەرێتی نییە، بەڵکو کاریگەری گەورەی لەسەر بزووتنەوەی مرۆڤ لە ژیاندا جێهێشتووە، وەک ڕەگەزێکی بنەڕەتی بوونی ژیان ئەو زەمینەیە بووە کە مرۆڤ تێیدا ژیانی گوزەراندووە و پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانی خۆی لێوە چنگخستووە[١٢]. واتە بەردەوام پەیوەندییەکی بەهێز و یەکانگیر لە نێوان مرۆڤ و نیشتمانەکەیدا هەبووە، بەڵام کاتێک هێزگەلێکی دەرەکی و نامۆ دێن و دەستبەسەر نیشتمانەکەدا دەگرن و وەک مۆڵکی خۆیان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن و خەڵکەکەی دەکەنە کۆیلە، ئەوە جگە لە نامۆبوون شتێکی تر چاوەڕێی دانیشتوانە بەکۆیلەکراوەکە ناکات، چونکە یەکێک لە بنەڕەتیترین کاری داگیرکەر هەوڵدانە بۆ بچڕاندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و نیشتمانەکەی. بە ئەندازەی سەرکەوتنی داگیرکەر لەم پرۆسە ترسناکەدا، سەرکەوتوو دەبێت لە نامۆکردنی گەلە ژێردەستەکە بە نیشتمان و کولتوورەکەی. بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئامانجەش چەندەها ڕێگە دەگیرێتە بەر، وەک: بەستنەوەی داگیرگەکە بە نیشتمانی زلهێزەکەوە و ناساندنی وەک بەشێک لە خۆی و بڵاوکردنەوەی کولتووری هێزە داگیرکەرەکە و تەنانەت ڕاگواستن و گۆڕینی ناوی شار و شارۆچکە و گوند و تەنانەت چیا و گرد و ڕووبارەکانیش.

لێرەدا هەندێ جار ترسناکی پرۆسەکە لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە ئەم داگیرکارییە درێژخایەن بێت، واتە دەشێت داگیرکارییەکە سنوورەکانی نامۆبوون تێبپەڕێنێت و بەرەو قڕکردنی بایلۆجییانە ئاڕاستە وەربگرێت. کوردستانیش دیارترین نموونەی بەرجەستەبوونی ئەم ڕاستییەیە.

## ڕۆڵی ڕێکەوتننامەی سایکس- پیکۆ لە قوڵکردنەوەی نامۆبوونی خودیی کورددا

ڕێکەوتنامەی سایکس- پیکۆ لە شێوەی چەند یاداشتنامەیەکی دیپلۆماسییانەی نێوان بەریتانیای مەزن و فەڕەنسا و ڕووسیادا بە ئەنجام گەیەندرا، ئەو یاداشتنامانەی کە دەسەندەی بەریتانیا و فەڕەنسای لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانی پاش دابەشکردنی دەستنیشان کردبوو لە ڕۆژانی ٦ و٩ ی مایسی ١٩١٦ ئاڵوگۆڕیان پێکرا[١٣]. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبدرێت، بریتییە لەو ناوچە کوردییانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون، کە پەیمانی سایکس پیکۆ گرتبوویەوە:

---

١٢. کامەران محەمەد: لە نێوان مرۆڤ و شوێن و کاتدا، ل٥٦ و دواتر.

١٣. فازیل حسین: کێشەی ویلایەتی موسڵ، و.محەمەد شاکەلی، چ٢، کەرکوک، ٢٠٠٧، ل١٤.

١) بەپێی نەخشەی سایکس- پیکۆ ویلایەتی مووسڵ (باشووری کوردستان) لەگەڵ ویلایەتی شام و حەلەب بەر فەڕەنسییەکان کەوتبوو (لە دوای تەواوبوونی جەنگ ئینگلیزەکان ویلایەتی موسڵیان لە دەست فەڕەنسییەکان دەرهێنا، بەرانبەر بە هەندێ شوێنی تر کە بە فەڕەنسییەکان درا)١٤.

٢) باکوری کوردستان ( لە پەیمانی سایکس پیکۆدا بە کوردستانی مەرکەزیی ژوروو ناوبراوە)، بۆ ڕووسیای قەیسەری دانرابوو (لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و کشانەوەی ڕووسیا لە جەنگی جیهانی وازی لەو پەیمانە هێناو مایەوە سەر سیاسەتی بەریتانیا)١٥.

ئەوەی جێی تێڕامان بووە لەنێو ڕێکەوتننامەکەدا سەبارەت بە کورد ئەوەیە، کە لە ڕێکەوتننامەکەدا باس لەوە دەکات کوردەکان هەستییان بۆ نەتەوە نییە! کارێکی نەکردەیە دەوڵەتی کوردستان دابمەزرێت، پێیانوابووە کە هیچ هۆکارێک نییە ڕێگر بێت لە بەردەم دابەشکردنی کورد کاتێک بتەوێت سنوور بسەپێنیت، یان بۆچی وا دابنێین کە کورد گەلێکە پێویستی بە پاڵپشتییە١٦. هەرچەندە ئەم ڕێکەوتننامەیە خاڵەکانی یەکەم، دووەم، چوارەم، نۆیەمی تایبەت بوو بە کوردستان و بەهۆیەوە کوردستانی دابەشکرد و پرسی کوردی پشتگوێ خست. هاوکات ڕێکەوتنەکە بەردەوامیدا بە دابەشکردنی کوردستان١٧.

بەڵام ئایا دەشێت ڕێکەوتێننامەیەکی سیاسی وەک سایکس- پیکۆ ڕۆڵێکی گەورە لە نامۆکردنی خودیی نەتەوەیەکدا بگێڕێت؟ بێگومان ئەو ڕێکەوتننامەیە تەنها مێژوویەکی ڕووداوئامێزی ماوە کورت نەبوو، کە تەنها پەیوەندی نێوان دوو وڵات یا چەند وڵاتێک بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ڕێکبخات. بەڵکو (مێژووییەکی سیاسی) بوو، کە بایەخی بە پرسگەلێکی قوڵتر لە (مێژووی ڕووداو) دەدا، لەجیاتی گرنگیدان بە کەسایەتی و زنجیرەی ڕووداوەکان توانی بچێتە بوارگەلێکی فراوانی توێژینەوەی میکانیزمە کۆمەڵایەتییەکانی دەسەڵات و پەیوەندی نێوان دەوڵەت و

١٤. محەمەد ڕەسوڵ هاوار: کورد و باکووری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهانی، ب١، چ٢، بەڕێوبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٦، ل٥٣٧.

١٥. ە.س، ل٥٣٨.

١٦. سعید بشیر اسکندەر: من التخطیط الی التجزئة، سیاسة بریطانیا العظمی تجاه مستقبل کردستان١٩١٥-١٩٢٣، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٦٢.

١٧. سعید بشیر اسکندەر: م.س، ص٦٦.

کۆمەڵگە. ئەمەش لە ڕێگەی کەناڵگەلێکی جۆراوجۆرەوە بەدەستهات: گرنگیدان بە سیاسەت وەک شێوەیەکی کۆمەڵایەتی و کولتووری، نزیکخستنەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆجی لە دامەزراوە سیاسییەکان و بەرچاوڕۆشنی دەربارەی ڕۆڵی ئایدیۆلۆجیا لە پێکهێنانی کایەی سیاسیدا.

سایکس–پیکۆ زۆر بە وردی کاری لەسەر (قوڵکردنەوەی) شێوازە جیاوازەکانی نامۆکردنی خودی کوردی کردووە، هەربۆیە زیادەڕەوی ناکەین گەر بڵێین مێژووی کورد لە سەد ساڵی تەمەنی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا مێژووی نامۆکردنی خودی کوردییە. گرنگترین ئەو شێوازانەش بریتین لە:

## یەکەم - گوێڕایەڵی یاخود ملکەچکردن بۆ کۆ:

پرسی ملکەچکردن بۆ کۆ یەکێک بووە لە تەوەرە سەرەکییەکانی بیرکردنەوەی فەیلەسوفە بوونگەراکان، بەتایبەتیش (کیرکیجارد و هایدگەر ١٨٨٩–١٩٧٦)، زۆر بەتوندی ملکەچکردنی تاک بۆ کۆییان ڕەتکردووەتەوە و بەجۆرێک لە جۆرەکانی نامۆبوونی خودیان داناوە١٨.

هایدگەر بەکارهێنانی وشەی نامۆبوون بە چەمکگەلێکی بنەڕەتی وەک (کەوتن –السقوط) و (ساختە – الزیف) دەبەستێتەوە١٩. لەو سەربەنەشەوە (منطلق) جیاوازی لە نێوان دوو جۆر بوونی مرۆیدا دەکات:

یەکەم– بوونی بنەڕەتی (Authentique): ئەو بوونەیە، کە خۆی دروست دەکات و هەست بە ئازادی تەواوی خۆی دەکات و پشت ئەستوور بەخۆی ڕاوەستاوە. هاوکات لە میانەی بوونی پەیوەندیداریتییەکی ڕاستەقینە بۆ بڕیار و بژاردەکانی، ئاڕاستەکانی خۆی دیاری دەکات. بەوپەڕی ئازادییەوە و بە بوونی هۆشیارییەکی تەواو بەرانبەر بە بارودۆخی جەوهەری ژیانی مرۆیی هەنگاو دەنێت٢٠.

دووەم– بوونی ساختە (Inauthentique): ئەو بوونەیە، کە تێیدا خود هەست بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵکیدا و چوونە ناو کۆمەڵ و خۆهەڵدانە ناو باوەشی

١٨. حسن محمد حماد: الاغتراب عند ایرک فروم، ط١، المؤسسة الجامعة للدراسات والنشر، ط١، بیروت، ١٩٩٥، ص٩٠.

١٩. شاخت: الاغتراب، ص٢٦٢.

٢٠. فیصل عباس: م.س، ص٢٦١.

کەسانی ترەوە دەکات. تا لێرەوە بتوانێت لە بەرپرسیارێتی و ئازادییەکەی هەڵبێت و لەو دڵەڕاوکێیەش ڕزگاری بێت، کە هەستی پێدەکات.

واتە (بوونی ساختە) ئەو بوونەیە کە دەستبەرداری بەرپرسیارێتی خۆی دەبێت لە هەڵبژاردنی تواناکانیدا و ئەم ئەرکە بۆ کەسانی تر جێدەهێڵێت، ئەم بوونەش ملکەچی نە ناسراوێکە کە پێیدەوترێت خەڵکی یان جەماوەر یاخود کۆمەڵ. لەبەرئەوە بوونی ساختە لەو ژیانە گشتییەدا دەژی کە تەواوی جیاوازییەکان ڕەتدەکاتەوە و هەموو هەستکردنێک بە ڕەسەنایەتی لەناو دەبات و مرۆڤ لە تەواوی ئەو توانایانەی بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و ڕای ئازاد و بڕیاردان دادەماڵێت٢١.

ئەم بوونە مرۆڤ بۆ جیهانێکی (هاوشێوە) دادەبەزێنێت، ئەو مرۆڤەی لە (کۆ)دا ون دەبێت، ئازادی و سەربەخۆیی خۆی لەدەست دەدات و ئەوە دەکات کە خەڵکی دەیکەن. لێرەوە ئەو مرۆڤە بوونە بنەڕەتییەکەی لەناو دەبات و سازش لەسەر ئازادی و تاکێتی خۆی دەکات و تەنها دەبێتە شتێک لەنێو شتەکاندا. ئەمەش بە هەدەردانێکی تەواوی بەها و حەقیقەتی مرۆڤی لێدەکەوێتەوە٢٢.

لە سەربەنی ئەو پۆلێنکردنەی هایدگەر بۆ بوونی بنەڕەتی و بوونی ساختە ئەنجامیدا، دەتوانین بڵێن سایکس پیکۆ بە ئەندازەیەکی گەورە زەمینەی بۆ سڕینەوەی بوونی بنەڕەتی خۆشکرد و بوونی ساختەش بووە ئەو واقیعەی کە تا ئەندازەیەکی گەورە گوزارشت لە خودی کوردی بکات! چونکە پەرتکردنی کوردستان بۆ چوار پارچە و لکاندنی هەر پارچەیەکی بە سنورێکی فراوانترەوە و لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە نوێیانەی کە بانگەشەی دەوڵەتی نەتەوەییان دەکرد، فارس و تورک و عەرەبی کردە باڵادەست و زۆرینە! کوردەکانیش وەک کەمینەی ناو ئەو دەوڵەتانە کەوتنەبەر ڕەحمەتی ئەو زۆرینانەی کە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی بە بەرزترین ئاست گەیشتبوو. هەرچی دەوڵەت – نەتەوەیە وەک چۆن پیشاندەدرێت فۆڕمی سەرەکی دیموکراسی، ئازادی و مافەکانی مرۆڤ نییە، بەڵکو سیستمی نکۆڵیکردنی ئەو بەهایانەیە٢٣. واتە ئەگەر ئەرکی دەوڵەت نێوانێکی بێلایەن بێت لەنێو گرووپە

---

٢١. فیصل عباس: م.س، ص٢٦٢

٢٢. ن.م، ص ٢٦٢.

٢٣. عەبدوڵڵا ئۆجەلان: مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک، پەرتووکی چوارەم، و.لوقمان عەبدوڵڵا، چ١، ٢٠١١، ل٢٥٦.

پێشبڕێکارەکان و تاکەکانی کۆمەڵگە، هاوکات وەک ناوبژیوانێک وابێت، کە بتوانێت هەر هاوڵاتییەک بپارێزێت لە هێرشی هاوشارەکەیی و قەوارەیەکی بێلایەن بێت و لەپێناو بەرژەوەندی هەمووان کار بکات بۆ ئەو شتەی کە پێی دەوترێت (باشی گشتی) یاخود (بەرژەوەندی گشتی)٢٤. ئەوا ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی لە ئەنجامی ڕێکەوتنامەی سایکس پیکۆوە دروستکران و کوردیان بەسەردا دابەشکرا، نەک هەر دەسەوسان بوون لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەدا، بەڵکو سنورەکانیان کردە دیواری زیندانێکی گەورە بۆ کوردەکان و ناو، زمان، کولتوور، شوناسی کوردیی لەسەر زەمینی باب و باپیرانی خۆی قەدەغەکرا٢٥.

سیاسەتی بە (عەرەب، تورک، فارس)کردن، واتە سەپاندنی کولتووری زۆرینە و یەک شێوازی ژیانکردن و شێواندنی دیمۆگرافیای کوردستان و ڕاگواستن و نیشتەجێکردنی نەژادە سەردەستەکان لە خاکی کوردستاندا برەوی پێدرا٢٦. واتە ڕاکێشانی هێڵی سنوور بەسەر کوردستاندا و بەپێی ڕێکەوتنامەی سایکس پیکۆ، ئاکامی زۆر خراپی بەدوای خۆیدا هێنا، ڕۆڵێکی بنەڕەتی گێڕا لە دروستکردنی بوونێکی ساختە لە خودی کوردیدا و دواتر قوڵکردنەوەی هەستی نامۆبوون لەو خودەدا. ئەمەش دوای ئەوە بەدیهات کە دۆخی دیمۆگرافی – ئابووری شێوا، زۆربەی خێڵ و عەشیرەتەکانی سەر سنوور لێکدابڕان. موڵک وماڵیان دابەشکرا، ژیانی ئاساییان تێکدرا، شیرازەی یەکگرتوویی ئابووریی و کۆمەڵایەتییان لە گرێژنە چوو، بازرگانی ناوخۆی کوردستان لە کزی دا٢٧.

ئەوەی زیاتر نامۆبوونەکەی قوڵترکردەوە ئەوە بوو کە دەوڵەتە نوێیە دروستکراوەکان ئامادە نەبوون لە وڵاتەکەیاندا! ناوی خاکی کوردستان وەخۆگرن، شتێکیان بەناوی (کوردستانی ئێران)و (کوردستانی عوسمانی)و... لەناو سنووری وڵاتەکەیاندا بۆ جارێکیش نەسەلماند، چونکە واتا و چەمکی ئەو زاراوە سیاسییانە

---

٢٤. ئاندرو هێیوود: تیۆری سیاسی، و.گۆران سەباح، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٣٢.

٢٥. سۆزان کەریم مستەفا: لێکدانەوەی ڕاسیزم بۆ مێژوو(کەمالیزم، بەعسیزم وەک نمونە)، تێزی دکتۆرا(بڵاونەکراوە)، پێشکەشی بەشی مێژووی سکوڵی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە، ٢٠١١، ل١٩٢.

٢٦. کامەران محەمەد: کورد لە دەستووری تەرکیا (١٩٢٤-١٩٣٨)، گۆڤاری (نوێبوون)، ژمارە(٦)، بەشی ڕووناکبیری و مەڵبەندی (١)ڕێکخستنی سلێمانی (ی.ن.ک)، ٢٠٠٩، ل١٧٨ ودواتر.

٢٧. حسین مەدەنی: کوردستان و ستراتیجی دەوڵەتان، ب١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٥.

بۆ هیچ کامیان قابیلی قبووڵ نەبوو.

بەڵام لە ئێراندا بەناوی (کوردەکانی ئێران- کردهای ایران و کردهای خودمان)، وەک کۆمەڵە خەڵکی ناو ئێران پێناسەی ناسیۆنالیزمی ئێرانیان پێ بەخشین. لە سووریاش وەک نەتەوەی کۆچکرد و لە کوردەکانیان دەڕوانی. کاربەدەستانی ئەم وڵاتە ڕایانگەیاند:» کورد لە سوریا بێ نیشتمانە و لەسەر خاکی وڵاتی خۆی نییە»٢٨. دەوڵەتی سووریا پێی ڕەوا نەبینین ناسنامەی سوریایان بداتێ و بە هاوڵاتییان بناسێ. بەڵام دۆخەکە لە عێراق جیاواز بوو، حکومەت لە کاتی دروستبوونی عێراقدا بوونی کوردی لە وڵاتەکەدا سەلماند. بەندی پێنجەمی دەستووری کاتی عێراقیش لە ساڵی ١٩٧٠دا دانی بەوەدا نا کە :» گەلی عێراق لە دوو (نەتەوە)ی سەرەکی پێکدێت، ئەویش عەرەب و کوردە»٢٩. بەڵام دەوڵەتی عێراقیش لە بەکارهێنانی زاراوەی (کوردستانی عێراق) خۆی بوارد و لە نەرێکردنەوەی خاڵی (١)ی بەندی پێنجدا گونجاندنی:» عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب»٣٠، ئەمەش ئەو واتایە دەگەیەنێت کە گەلی کورد لە عێراقدا بێ نیشتمانە و لەسەر خاکی عەرەب دەژی. لە نووسراوە فەرمییەکانی دەوڵەتیشدا لە جیاتی بەکارهێنانی (کوردستانی عێراق)، زاراوەی (شمال العراق)یان برەو پێدا. هاوکات ئەم دەوڵەتانە، وێڕای نکۆڵیکردن لە بەشێکی خاکی کوردستان لەنێو سنووری دەسەڵاتدارێتیاندا، سیاسەتی تاراندن و پەرش و بڵاوکردنەوەیان و تواندنەوەیان لەناو زۆرینەی باڵادەستدا ڕەچاو کرد. لە جێگۆڕکێ پێکردن و ڕاگواستن و تا دەگاتە دابڕاندنی ناوچە کوردنشینەکان، هەوڵیاندا لە بەڕێوەبردنی کوردستاندا پرۆژەی ڕێگاوبان و ئاوەدانکردنەوە و سەرمایە دانانی ئابوورییان بە جۆرێک دارِشت، کە نیاز و پەیوەندی خەڵکی کوردستان بەیەکتری لەناو سیستمێکی نا پەیوەست و زۆر لاوازدا ڕاگرن٣١.

ئەم دۆخە بەتەواوی ئەو دوو دیاردەیەی دروستکرد، کە (هیگڵ) لەژێر ناونیشانی (نامۆیی)دا جێگەیان دەکاتەوە:

١. جەوهەری کۆمەڵایەتی نامۆ بە تاکی بەدیهێنا.

٢٨. حسین مەدەنی: س.پ، ل١٦.

٢٩. ه.س، ل١٦.

٣٠. ه.س، ل١٦.

٣١. ه.س، ل ١٧.

٢. نامۆبوونی تاک یاخود سازشکردنی لە تاکێتی خۆی بۆئەوەی لەگەڵ جەوهەرە گشتییەکەدا یەک بگرێت، ڕاستر خۆی بگونجێنێت٣٢.

هاوکات ئەو واقعەی (سایکس- پیکۆ) دروستی کرد، بەتایبەت لەم شێوازەدا کە ملکەچکردنە بۆ کۆ، تەواو لەگەڵ ئەو پێناسەیەدا وێکدێتەوە کە مارکس بۆ چەمکی (نامۆبوونی خود) خستویەتییە ڕوو. بەلای مارکسەوە نامۆبوونی خود بە دوو واتا هاتووە:

١. بەو واتایەی کە کاری مرۆڤ و بەرهەمەکەی گوزارشت لە ژیانی دەکەن، بۆیە هەرکاتێک مرۆڤ پێیان نامۆکرا، ئەوا بە هەمان شێوە بە خودی خۆشی نامۆ دەبێت٣٣. هەربۆیە بەدەگمەن مرۆڤی کورد دەبینین بەدرێژایی تەمەنی ئەو دەوڵەتانەی لە ئەنجامی ئەو ڕێکەوتنامەیدا پەیدابوون، بەشێوەیەک لە شێوەکان بەکاری خۆیان نامۆ نەکرابن.

٢. دابڕانی مرۆڤ دەگەیەنێت لەو ژیانە مرۆییە ڕاستەقینە یاخود سرووشتە جەوهەرییەکەی مرۆڤ، لێرەدا مەبەستی مارکس لە نامۆبوونی خود، لەدەستدانی تەواوی مرۆڤایەتیبوونە، بۆیە بەم واتایە نامۆبوونی خود لای مارکس دەبێتە هاو واتای (دارنینی مرۆڤایەتیبونی مرۆڤ (Dehumanization) لێرەدا سێ تایبەتمەندی هەیە کە لای مارکس سرووشتی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەردەخەن، ئەوانیش (تاکگەرایی Individuality)، (کۆمەڵایەتیبوون Sociality)، (هەستیارییبوونێکی شکۆدار Cultivated Sensibility). بەمشێوەیە نامۆبوونی خود واتا دارنینی مرۆڤایەتی بوونی مرۆڤ لەو بوارانەی ژیان کە بەرانبەری ئەو تایبەتمەندییانەن: بەرهەمهێنان، ژیانی کۆمەڵایەتی، ژیانی هەستی٣٤. بێگومان خودی کوردیش لە سایەی ئەو دەوڵەتانەی بەرهەمی ڕێکەوتنامەی سایکس – پیکۆ بوون و بەدرێژایی سەدەیەک ڕووبەڕووی تەواوی ئەو دارنینانە بوونەوە و هەستی نامۆبوونی لە خودی کوردیدا بەسوێتر کرد.

---

٣٢. میخائل إنوود: معجم مصطلحات هیجل، ت. إمام عبدالفتاح إمام، التنویر للطباعة والنشر، بیروت، ٢٠١١، ص٨٢.

٣٣. یحیی عبدالله: الاغتراب (دراسة تحلیلیة لشخصیات الطاهر بن جلون الروائیة، المؤسسة العربیة للدراسات و النشر، ط١، بیروت، ٢٠٠٥، ص٣٢ ؛ جیرار بن سوسان- جورج لابیکا: معجم الماركسیة النقدي، ترجمة جماعیة، دار الفارابی، ط١، بیروت، ٢٠٠٣، ص١٠١ و دواتر.

٣٤. یحیی عبدالله: ن.م، ص٣٢.

### دووەم: ملکەچکردنی سادیی - ماسۆشیی:

ئەریک فرۆم پێناسی سادیزم بەمشێوەیە دەکات:» حەزکردنە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتییەکی بێسنوور، بەسەر هەر بوونەوەرێکی زیندوودا، جا ئەو بوونەوەرە ئاژەڵ، منداڵ، پیاو یاخود ئافرەت بێت، ئەمەش بە ئامانجی زۆر لێکردنیان لەسەر چەشنی ئازار و سەرشۆڕێتی بەبێ ئەوەی توانای بەرگریکردن لە خۆیان هەبێت٣٥.

بەڵام (ماسۆشیزمMasochism ) بەلای فرۆمەوە واتای ملکەچبوونی کەسێک دەگەیەنێت، بۆ هێزێکی گەورەتر و مەزنتر لە دەرەوەی خۆی، کە مرۆڤ ئازادیی و ڕێز و شکۆی خۆی تەسلیم دەکات و لە بەردەمیدا هەست بە دەسەوسانی دەکات٣٦.

سەرەڕای ئەو جیاوازییە ڕووکەشییەی لە نێوا ن سادیزمو ماسۆشیزم بەدیدەکرێت، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان لە یەکدی جیاناکرێنەوە و هەردووکیان لە یەک پێداویستی و لە یەک چاوگەوە سەرچاوەیان وەرگرتووە، ئەویش ڕاکردنە لە هەڵوێستێک کە بەرگەی ناگرن، واتە هەستکردنی تاکە بە تەنهایی و دەسەوسانی و دڵەڕاوکێ، ئەو هەستەی کە لە ئازادی سلبییەوە سەرچاوە دەگرێت و وا لە مرۆڤ دەکات بە تەنهایی ڕووبەڕووی جیهانێکی نامۆ ببێتەوە٣٧.

لە ملکەچی ماسۆشیزمدا تاک لە ڕێگەی قوربانیدان بە ئازادی و ڕزگاربوون لە خودی خۆی هەوڵدەدات، بەسەر هەستی داماو(عجزء)یی و تەنهاییدا زاڵ بێت. ئەم دۆخەش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ملکەچکردنی سادێتیدا نییە. مرۆڤی سادی ئەو کەسەیە هەست بە داماوی و لاوازی دەکاتو بەلایەوە ژیان واتایەکی ئەوتۆی نییە، هەربۆیە هەوڵدەدات لە ڕێگەی هەژموونکردن بەسەر کەسانی تردا قەرەبووی ئەو هەژارییەی خۆی بکاتەوە. بۆیە (فرۆم) گووتەنی ئەو دەیەوێت ئەو (خود)ەی کە بەلایەوە لە مێروویەک زیاتر شتێکی تر نییە، بۆ خودایەک بگۆڕێت٣٨. هەرئەوەندەش نا، بەڵکو جیاوازی لە نێوان سرووشتی ملکەچکردنی سادێتی و

٣٥. حسن محمد حسن حماد: م.س، ل٩٣.

٣٦. أريك فروم: الخوف من الحرية، ت.مجاهد عبدالمنعم مجاهد، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ط١، ١٩٧٢، ص١٢٧ و دواتر.

٣٧. ن.م، ل ١٢٤ و دواتر.

٣٨. حسن محمد حسن حماد: م.س، ص٩٣.




سرووشتی ملکەچکردنی ماسۆشیدا نیە، مرۆڤی سادیی پێویستی بە کەسێکە کە بەسەریدا زاڵبێت، واتە پێویستییەکی لە ئەندازەبەدەری بەو کەسە هەیە، بەوپێیەی هەست بەوە دەکات، کە هێزێکی شاراوەی ئەوتۆ لە ناخیدایە و دەیکاتە گەورەی مرۆڤێک٣٩. جا کۆیلایەتیکردنی سادێتی بۆ ماسۆشێتی هیچی کەمتر نییە لەو کۆیلایەتییەی کە ماسۆشێتی بۆ کەسێک یا ئەو هێزەی کە گەورەیی بەسەرەوە دەکات٤٠.

لێرەوە دەردەکەوێت کە سادیزم و ماسۆشیزم دوو ڕووی یەک هەڵوێستن، ئەویش هەستکردنە بە داماویی (العجزء)و ناتەواوی (النقص)، واتە هەریەکە لە سادیی و ماسۆشی پێویستیان بە کەسێکی تر هەیە کە ناتەواوییەکەیان پڕبکاتەوە. سادیی بوونەوەرێکی تر دەکاتە درێژبووەوەی خۆی، بەڵام ماسۆشی خۆی دەکاتە درێژبووەوەی بوونەوەرێکی تر٤١.

**سایکس-پیکۆ زۆر بەوردی کاری لەسەر (قوڵکردنەوەی) شێوازە جیاوازەکانی نامۆکردنی خودی کوردی کردووە، هەر بۆیە زیادەڕەوی ناکەین گەر بڵێین مێژووی کورد لە سەد ساڵی تەمەنی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا مێژووی نامۆکردنی خودی کوردییە.**

لەم سەربەنەوە دەتوانین بڵێین، ڕێکەوتنامەی سایکس–پیکۆ بەشێوازێک سنووری ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەردا دابەشکرابوو، ڕەنگڕێژ کرد، تیایاندا قەوارە نوێیەکان بوونە کێڵگەی گەشەکردنی تۆوی سادیزم و ماسۆشیزم کە دوو شێوازی (نامۆکردنی مرۆڤ بە خودی خۆی) بوون.

---

٣٩. أريك فروم: م.س، ص١٢٠.

٤٠. حسن محمد حسن حماد: م.س، ص٩٤.

٤١. حسن محمد حسن حماد: م.س، ص٩٤.

ئەو حکومەتانەی پێکهێنران، لەبەرئەوەی بونیادێکی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، کولتووری پتەویان نەبوو، هاوکات لە ئەنجامی پرۆسەیەکی درێژخایەنی مێژووییدا دروست نەببوون و ئەو فەرمانڕەوایانەش پشت ئەستوور و بەهێزی سرووشتی خۆیان نەهاتبوونە سەر کورسی دەسەڵات، هەربۆیە هەمیشە هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی هەژموون و زاڵبوون بەسەر (بوونی کورد) لە دەوڵەتەکانیاندا هەستی داماویی و لاوازیان بشارنەوە. لە بەرانبەر کورددا وەک ئیمپراتۆرێک خۆیان دەنواند. هەروەها (بوونی کورد)یش هەستی گەورەبوونی لە ناخدا تۆخ دەکردنەوە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین، ئەو دەسەڵاتانەی بەرانبەر بە کورد دروستبوون، دەسەڵاتێکی سادیی بوون و چێژیان لە داهێنانی هونەری چەوساندنەوە و ئازاردانی کورددا دەبینییەوە.

لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستییەش فەرامۆش نەکەین، کە توێژێک لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا سرووشتێکی ماسۆشییان بۆ دروست ببوو، چێژیان لە ملکەچکردنی خۆیان بۆ دەوڵەت وەردەگرت و ئازادی و ڕێز و شکۆی خۆیان بەو بەخشیبوو! ئەمەش لەو هەستکردن بە لاوازیی و ناتەواوییەوە دروست ببوو، کە بەرانبەر بە دەوڵەت هەیانبوو، ڕێکەوتنامەی سایکس- پیکۆش بەدرێژایی سەد ساڵی بەرقەراربوونی قوڵتری کردبووەوە.

هەروەها ئەم دەسەڵاتە سادیی- ماسۆشییە بەشێوەیەکی هەڕەمی لە لوتکەی دەسەڵاتەوە تا نزمترین ئاستی کۆمەڵایەتی دادەبەزییە خوارەوە. واتە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ڕاڤەیەکی دروستی بەشداریکردنی دەیان هەزار چەکداری کورد لە پرۆسەی ئەنفالی گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا بکەین. هەر ڕاوێژکارێک (مستشار) بەرانبەر بە دەسەڵاتی حکومەتی عێراق خۆی بە ماسۆشی دەزانی و بەرانبەر بە چەکدارەکانی خۆی و دانیشتووە بێدەسەڵاتەکەی خۆی بە سادیی دادەنا. ئەم دیاردەیە (خیانەت و جاشێتی) لە تەواوی دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران، سوریا بوونی هەبوو. لەژێر سایەی ئەم قەوارە سادیی- ماسۆشییانەدا بەشی هەرە زۆری تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ شتگەلێک لە دەرەوەی خۆیاندا ملکەچ کرابوون، کە ئەمەش گوزارشت لە جەوهەری نامۆبوونی خودی مرۆڤ دەکات.

### سێیەم: ملکەچکردن بۆ دەسەڵاتە نادیارەکان

بەلای فرۆمەوە دەسەڵات چەند شێوەیەکی هەیە، دەسەڵاتە دەرەکییەکان لە وێنەی

کەسێک، دامەزراوەیەک، یاخود یاسا ... تاد خۆ دەنوێنن، بەڵام لێرەدا شێوەیەکی دیکەی دەسەڵات بوونی هەیە کە دەسەڵاتی ناوەکییە، ئەویش ئەو دەسەڵاتانەیە کە بەناوی ئەرک یا ویژدان یا منی باڵاوە کار دەکات٤٢. بەشێوەیەکی گشتی ئەم دەسەڵاتە بەهێزترە لە دەسەڵاتە دەرەکییەکان. ناوەڕۆکی ئەو کاروبارانەی لە ناخی تاکەکانەوە سەرچاوە دەگرن، زۆر جار گوزارشت لە حەز و خواستەکانی دەروونی تاکەکان ناکەن. بەڵکو دەربڕی کەلتوور و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانن، ئەمە لەکاتێکدا تاکەکان وادادەنێن، کە ئەوە خۆیانن بڕیار لەسەر کاروبارەکان دەدەن، بۆیە هەرگیز ناتوانن دژ بەو کاروبارانە یاخی ببن، مرۆڤ چۆن دژ بەخۆی یاخی دەبێت٤٣؟

فرۆم (دەسەڵاتە نادیارەکان) بە نەبوونی ئازادی ئەرێنی لێکدەداتەوە، کە لە ئازادبوونی ناوەوەی تاک خۆ دەنوێنێت. بەواتایەکی تر دەرکەوتنی (دەسەڵاتە نادیارەکان) بە گەشەکردنی ئازادی نەرێنی لێکدەداتەوە، کە مرۆڤ تەنها لە ڕووکاردا ئازاد دەکات، بەڵام دەیکاتە نێچیرێک بۆ گۆشەگیریی و دڵەڕاوکێ و ئامرازێکی ئاسان بۆ ملکەچکردنی (دەسەڵاتە نادیارەکان)٤٤.

بەمشێوەیە مرۆڤی ملکەچ بۆ (دەسەڵاتە نادیارەکان) ئەو مرۆڤەیە کە ئازادیی و سەربەخۆییبوونی خۆی لەدەستداوە، ئەو بەناوی دەسەڵاتێکی باڵاتر لە خۆی کاردەکات، بەڵام ناتوانێت بەناوی خۆیەوە کار بکات.

لەبەرئەوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی بەهۆی هەلومەرجی مێژوویی و سرووشتی داگیرکاریی و پارچە پاچەکردنی کوردستان کە لە سایەی ڕێکەوتننامەی سایکس پیکۆ دەگاتە ترۆپک و زاڵبوونی سیستمی خێڵایەتی لە کوردستاندا، بەبێ توانایی و «مقدمات»ێک ماوەتەوە،٤٥ واتە ئەوانە هۆکارێک بوون کە تاکی کوردی والێبکەن هەموو هەوڵدانێکی بۆ بەدەستهێنانی ئازادییە ڕووکەشییەکان بەگەڕ بخات و سەرنجی بەلای ئازادکردنی ناخی خۆیدا نەچێت، بۆیە ئەو واقعە داگیرکاریی و پارچە پارچەبوونەی کە سایکس پیکۆ قوڵتری

---

٤٢. فیصل عباس: م.س، ل٣٧٣.

٤٣. أریک فروم: م.س، ل١٣٦.

٤٤. حسن محمد حسن حماد: م.س، ل٩٥.

٤٥. کامەران محەمەد: رامانێک لە سیستەمی خێڵایەتی و سیستەمی خێڵایەتی لە کوردستاندا، ل٢٥١.

کردەوە نەیتوانیوە یارمەتی تاکی کوردی بدات بۆ گەشەکردنی کەسایەتی و بەرزکردنەوەی ئاکارەکانی، لەبەرئەوە «خەفەبوون و کپبوون» بووەتە کۆتی گەردنی مرۆڤی کورد و وەک ئامرازێک بۆ دەسەڵاتە نادیارەکان بەکارهێنراوە، هەربۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە زۆرجار لابدات و بەمەبەستی دەربازبوون لەو کۆتانە هەڵەی گەورە بکات! بەمەش زیان لە کۆمەڵگەی کوردی – بەشێوەیەکی گشتی- بدات. کپبوونی تاکەکان هەر لەو چاوگەوە سەرهەڵدەدات کە تاکی خێڵەکی لەژێر سایەی خێڵدا پەروەردە دەبێت، و «بەها»و «خوو نەریت»ەکانی لەوەوە وەردەگرێت٤٦.

بەمشێوەیە تاکی کوردی پەیوەندارێتی «إنتماء»ی بۆ خێڵ دەبێت و لەگەڵیدا کۆک دەبێت، لە ئامانج و بنەما و شێوازەکانی بیرکردنەوە و ژیان تێیدا، لەبەرئەوەی دەوروبەر ڕێگای جوڵەی پێنادات، و ئامرازەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی بۆ ئامادە ناکات و گەشەی کەسایەتییەکان سنوردار دەکات! بۆیە تاکی کوردی لە نامۆبوونێکی ڕاستەقینەدا ژیان بەسەردەبات.

---

٤٦. کامەران محەمەد: رامانێک لە سیستەمی، ل٢٥١.

کەسایەتی گوزارشتە لە کۆمەڵێک سیما trait و میکانیزمی دەروونی تایبەت بە تاک کە شێوەیەکی ڕێکخراویان وەرگرتووە، ئەو سیما و میکانیزمانە بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە تاکدا بەردەوامیان هەیە و کاریگەریی لەسەر ژینگەی دەروونی، ماددی و کۆمەڵایەتی دروست دەکەن. بەپێی پسپۆڕان و بیردۆزداڕێژانی کەسایەتی، سیماکان دەکرێت ڕوانگەیەکی کولتووریان هەبێت، هەرئەمەشە وایکردووە کەوا ڕەنگدانەوەی سیماکانی کەسایەتی لەسەر تاکەکان بە پێی کولتوورە جیاوازەکان بگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسەکردن بەشێوەیەکی گشتی لەسەر کەسایەتی سەر بە کولتوورێکی تایبەت لەوانەیە کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبێت.

سیما بریتییە لە کۆی ئەو تایبەتمەندییە کەسییانەی خەڵکی هەیانە و پێی لە کەسانی دیکە جیا دەکرێنەوە. لە زانستی دەروونزانیدا چەندین سیستەمی کەسایەتی بۆ سیماکان گەشەیان پێدراوە، کە لە هەموو سیستەمەکاندا سیماکانی کەسایەتی ڕوانگەیەکی دوو جەمسەریان هەیە. بەپێی بۆچوونی بیردۆزداڕێژانی کەسایەتی، سیماکان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر ڕەفتارەکانی تاک هەیە و ئەو کردەوانەی مرۆڤ ڕۆژانە ئەنجامیان دەدات، سەرچاوەکەی بۆ سیماکانی کەسایەتی دەگەڕێتەوە. ئەمەش بەومانایە دێت، لە ڕێگەی سیماکانەوە دەکرێت جیاوازی لە نێوان کەسەکاندا بکرێت، بە هەمان شێوەش لە ڕێگەی سیماکانەوە جیاوازی لە نێوان کەسایەتی کولتوورە جیاوازەکاندا کراوە، تەنانەت بەستنەوەی کەسایەتی بە سیماکان، واتە ڕێگەدان بە باسکردنی جیاوازی نێوان تاکەکان بەشێوەیەکی زانستی.

دید و بۆچوونە زانستییەکانی ئەم سەردەمە ئاماژە بەوە دەکەن کەوا کەسایەتی تاک، هەم لەژێر کاریگەری ژینگەدایە، هەمیش پەیوەندییەکی بەهێزی بە بۆماوەوە هەیە. تەنانەت لە بیردۆزی جینۆمیکی کۆمەڵایەتی sociogenomic theory ئاماژە بەوە کراوە کەوا ژینگە دەکرێ کاریگەری لەسەر ژێناتی genes تاکەکان دروستبکات و گۆڕانکاری تیادا ئەنجام بدات، بە مانایەکی دیکە واتە DNA لەژێر کاریگەری ژینگەدایە، و ژینگە دەتوانێ گۆڕانکاری بەسەر سیفتە بۆماییەکانی تاکدا بێنێت و سیستەمی بایۆلۆژی تاک دروستبکات، کە ئەمە بۆ هەموو کەسێک لە هەموو کولتوورێک وەک یەکە. هەربۆیە دەکرێ تاکی کوردی خاوەن کۆمەڵە تایبەتمەندییەک بێت، کە جیایبکاتەوە لە کەسایەتی تاکی کولتوورەکانی دیکە، کە

ئەم تایبەتمەندییانە دەکرێت تایبەت بە کولتووری کوردی بن و لە ڕێگەی ژینگەوە کاریگەری لەسەر ژێناتی کۆی گشتی خەڵکی دروستکردبێت و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە گوازرابێتەوە. بۆیە کاتێک سەرنج لە ڕەهەندەکانی هەر سیمایەکی کەسایەتی دەدەیت، دەکرێت زۆر بەڕوونی تاکی کوردی تیادا بدۆزیتەوە، بەڵام ئەگەر ئەم دۆزینەوەیە لەسەر بنەمای توێژینەوەی زانستی بێت، ئەوا بیرۆکەکان سەبارەت بە کەسایەتی تاکی کورد چاکتر جێگەی خۆیان قایم دەکەن.

توێژینەوەکان ئاماژەیان بەوە کردووە، کەوا کەسایەتی تاک زۆر کاریگەرە بە ئەزموونی ڕابردووی. ئەو ئەزموونە ناخۆشانەی کەسەکان لە تەمەنی منداڵیدا تاکو ١٨ ساڵی پێیاندا تێپەڕ دەبێت، جیاوازە لەو ڕووداوە ناخۆشانەی دوای تەمەنی ١٨ ساڵی خەڵکی ئەزموونی دەکەن، بەڵام لە هەردوو بارەکەدا، کاریگەری و جێپەنجەی خۆیان لەسەر کەسایەتی جێدەهێڵن. ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە کەوا تاکی کورد لە مێژوویەکی دوور و نزیکدا، بە کۆمەڵ ڕووداوێکدا تێپەڕیوە کە پێیاندەگوترێت ڕووداوە زەبر ئامێزەکان، ئەم ڕووداوانەش هەموو کۆمەڵگەیەک ئەزموونی نەکردوون، هەر لەبەرئەمەشە لەوانەیە تایبەتمەندییەکی بێوێنەی بە کەسایەتی تاکی کورد بدات و جیایبکاتەوە لە کەسایەتی تاکی کولتوورێکی دیکە.

مەکرا و کۆستا ئاماژەیان بەوە کردووە کەوا نۆرمی کۆمەڵایەتی، ڕووداوەکانی ژیان کاریگەریان لەسەر دروستکردنی ڕووەچەکانیfacet سیماکانی کەسایەتی هەیە، لەهەمانکاتیشدا لە ڕێگای بۆماوەوە کاریگەری لەسەر مەیلە بنەڕەتییەکانی تاک (کۆی سیماکان) دروستدەکەن. ئەم جیاوازییەش لەوانەیە بۆ هۆکاری بەهاکانی کۆمەڵگە بگەڕێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی کەس ناتوانێت نکۆڵی لەوە بکات کەوا تاکی کورد لەلایەن ڕژێمە یەک بەدوای یەکەکانەوە دووچاری ناسۆریی و زەحمەتی زۆر بووەتەوە، تاکوو کار گەیشتە سەر ئەنفال و کیمیاباران کە کۆمەڵکوژی گشتین و تاکەکان بەبێ جیاوازی تەمەن و ڕەگەز کەوتوونەتە بەر شاڵاوی سڕینەوەی نەژادی.

کورد کۆڕەوی بە کۆمەڵی کردووە، بە شەڕی ناوخۆدا تێپەڕیوە و دابڕان و بێبەش بوون و ئاوارەیی ئەزموون کردووە. هەژاری بەشێکی دانەبڕاو بووە لە ئەزموونی مرۆڤی کورد، بەتایبەت لە کۆتا دەیەی سەدەی ڕابردوو، کە هەموو ئەو ڕووداوانە کاریگەری لەسەر سیماکانی کەسایەتی دروستدەکەن. توێژینەوەکان ئەوەیان دووپاتکردووەتەوە کەوا ئەزموونە ناخۆشەکان کاریگەریان بەشێوەیەکی

ڕاستەوخۆ لەسەر کەسایەتی تاک هەیە. کاتێک تاکێک کورد بەو ئەزموونە ناخۆشانەدا گوزەر دەکات، ئەوا چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێت کاریگەری لەسەر سیماکانی کەسایەتی تاکی کورد دروستبکات. یەکێک لە سیماکانی کەسایەتی بریتییە لە تەباخوازی agreeableness کە ناوەڕۆکەکەی گوزارشتە لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی گونجاو prosocial behaviour و ئاڕاستەی هاوبەش (کۆمەڵی) Communal orientation.

زۆربەی خەڵکی لەگەڵ ئەوەدان ناکۆکییەکان چارەسەر بکرێن، بەڵام جیاوازی لە نێوان خەڵکیدا لە بارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشە و ململانێکاندا هەیە. ئەم جیاوازییەش پەیوەندی بە کەسایەتی تاکەوە هەیە، بۆیە توێژەران ئەوەیان بۆ دەرخستووین کەوا چۆنیەتی چارەسەرکردنی ململانێکان لە نێوان کەسانی خاوەن نمرەی بەرزی تەباخوازی و خاوەن نمرەی نزمی تەباخوازی هەیە. هەرچەندە ناتوانرێت گشتاندن ئەنجامبدرێت، بەڵام لەناو کەسایەتی تاکی کوردیدا ناتەباخوازی antagonism هەستی پێ دەکرێت، ئەمەش پێچەوانەی کەسایەتیەکی تەندروستە. لەناو تاکی کوردیدا زۆرێک لە کێشە و ململانێکان بەشێوەیەکی نادروست چارەسەر دەکرێن و توندوتیژی و گرتنەبەری ڕێگای نادروست لە کاتی بوونی کێشە و ململانێکاندا، بە ئەگەرێکی زۆر ئامادەییان هەیە. مرۆڤی کورد بەگشتی هەڵچوونی لە ئاستێکی بەرزدایە، ئەمەش دیسان پەیوەندییەکی بەرچاوی بە سیمای ناتەبایی antagonism هەیە، کە پاڵنەری ستراتیژیەتی تێکدەری (زیانگەیەن) destructive tactics لای تاک گەشە پێ دەدات. هەرکاتێک ئاستێکی نزمی سیمای تەبایی لە تاکدا ڕەنگیدایەوە، کە سروشتێکی هەرەمی هەیە، ئەوا سەر بۆ زیاتر درێژکردنەوەی ناکۆکییەکان دەکێشێت.

لە کۆمەڵگەی کوردیدا، پەیوەندی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا، بەتایبەت پەیوەندی نێوان باوان و منداڵ بەشێوەیەکی تەندروست ڕەگی لەناو خێزانی کوردیدا دانەکوتاوە. مۆدێلی مامەڵەکردن جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا خەڵکی لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانەدا بن، ئەوا لەژێر کاریگەری یەکتریدان و یەکێک دەکەوێتە ژێر کاریگەری یەکێکی دیکەوە. بۆیە بەپێی ئەم بۆچوونەش بێت ئەوا ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا هەیە، بەتایبەت پەیوەندی نێوان باوان و منداڵ کاریگەرییەکی گەورە و بەرچاوی لەسەر کەسایەتی تاک دروست دەکات.

توێژەران ئاماژەیان بەوە کردووە کەوا شێوازی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دایک و باوکان ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی لە گەشەپێدانی سیمای تەباخوازی هەیە.

بەڵام وەک ئەوەی لە توێژینەوەکاندا ئاماژەی پێکراوە بەڕێژەیەکی بەرز، لەناو خێزانی کوردیدا توندوتیژی و پشتگوێخستنی تاک هەبووە، کە ڕێژەکەیان لە نێوان ٧,٧٪ بۆ ٤٥,٥٪ بووە. ئەمەش بەو مانایە دێت کەوا توندوتیژی یەکێکی دیکەیە لە تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی تاکی کورد. کە ئەو جۆرە توندوتیژیانە کە لە بەرانبەر ئەوانی دیکەدا بەکاردەهێنرێت، بەشێوەیەکی نەرێنی کاریگەری لەسەر کەسایەتی دروست دەکات، بەتایبەت ئەو کاریگەرییە لەسەر سیمای تەباخوازی بەڕوونی ڕەنگدەداتەوە. یەکێک لە ئاماژەکانی هەبوونی ئەو ڕێژە بەرزە لە خراپ مامەڵەکردن لەناو خێزانی کوردیدا، گوزارشت لە پەیوەندی نێوان باوان و منداڵەکانیان دەکات، کە پێدەچێت کەسایەتی تاکی کورد بە جۆرێک بێت زۆر پەیوەندییەکی گەرم و گوڕیان لەگەڵ منداڵەکانیان وەک پێویست نەبێت.

لەبارەی پەیوەندی باوان و منداڵەکانیان، توێژەران ئەوەیان دۆزیوەتەوە کەوا سیمای تەباخوازی پەیوەندییەکی نەرێنی بە توندوتیژی دایک و باوکان بەرانبەر بە منداڵەنیان هەبووە. ئەمەش بەو مانایە دێت هەرکاتێک توندوتیژی و خراپ مامەڵەکردن لەناو خێزاندا هەبوو، ئەوا ئاستی تەباخوازی وەک سیمایەکی کەسایەتی دەهێنێتە خوارەوە. هەر لە هەمان توێژینەوەدا ئەوەشیان بۆ دەرکەوتووە کەوا دایک و باوکی خاوەن ئاستێکی بەرزی سیمای تەباخوازی زیاتر پاڵپشتی و چاودێری منداڵەکانیان دەکەن و پەیوەندییەکی ئەرێنیش لە نێوان چاودێریکردنی منداڵ و سیمای تەباخوازی هەبووە. هەروەها لە توێژینەوەیەکی تردا ئەوە دووپاتکراوەتەوە کەوا تەباخوازی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ پەیوەندی بە گەرم و گوڕی پەیوەندی باوان و بەشێوەیەکی نەرێنیش پەیوەندی بە کۆنترۆڵکردنەوە هەبووە.

لەکۆتاییدا دەتوانرێت بگوترێت کەوا، تاکی کوردی هەرچەندە کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی زۆر باشی هەیە، بەڵام لە هەندێک تایبەتمەندی سیمای تەباخوازی پێدەچێت کێشەی هەبێت. هۆکاری ئەمەش پەیوەندی بە کۆمەڵە فاکتەرێکەوە هەیە، بەڵام دیارترینیان لەوانەیە بریتی بێت لە کاریگەری ئەو ڕووداوە ناخۆش و زەبرئامێزانەی کە تاکی کوردی ئەزموونی کردوون و لە نەستی تاکەکاندا ڕەگیان داکوتاوە و پاڵ بە تاکەوە دەنێت بۆئەوەی ڕەفتار ئەنجامبدات.

## سەرچاوە سوود لێ وەرگیراوەکان


Atherton, O. E., & Schofield, T. J. (2021). Personality and parenting. In O. P. John & R. W. Robins (Eds.), Handbook of personality: Theory and research (pp. 352–366). The Guilford Press.

Babakr, Z., & Fatahi, N. (2023). Risk-taking Behaviour: The Role of Dark Triad Traits, Impulsivity, Sensation Seeking and Adverse Childhood Experience. Acta Informatica Medica, 31(4), 292–299. https://doi.org/10.5455/aim.2023.31.292-299

Costa Jr., P. T., & McCrae, R. R. (2009). The Five-Factor Model and the NEO Inventories. In J. N. Butcher (Ed.), Oxford handbook of personality assessment (pp. 299–322). Oxford University Press. https://doi.org/10.1093/oxfordhb/9780195366877.013.0016

Gottman, J. M., Coan, J., Carrere, S., & Swanson, C. (1998). Predicting marital happiness and stability from newlywed interactions. Journal of Marriage and the Family, 60, 5–22. https://doi.org/10.2307/353438

Graziano, W. G., Jensen-Campbell, L. A., & Hair, E. C. (1996). Perceiving interpersonal conflict and reacting to it: The case for agreeableness. Journal of Personality and Social Psychology, 70, 820–835. https://doi.org/10.1037/0022-3514.70.4.820

O'Connor, B. P., & Dvorak, T. (2001). Conditional Associations between Parental Behavior and Adolescent Problems: A Search for Personality– Environment Interactions. Journal of Research in Personality, 35(1), 1–26. https://doi.org/10.1006/jrpe.2000.2295

Prinzie, P., Stams, G. J. J. M., Deković, M., Reijntjes, A. H. A., & Belsky, J. (2009). The relations between parents' Big Five personality factors and parenting: A meta-analytic review. Journal of Personality and Social Psychology, 97, 351–362. https://doi.org/10.1037/a0015823

Roberts, B. W. (2018). A revised sociogenomic model of personality traits. Journal of Personality, 86, 23–35. https://doi.org/10.1111/jopy.12323

Sameroff, A. (2009). The transactional model. In A. Sameroff (Ed.), The transactional model of development: How children and contexts shape each other (pp. 3–21). American Psychological Association. https://doi.org/10.1037/11877-001

Tackett, J. L., Hernández, M. M., & Eisenberg, N. (2019). Agreeableness. In D. P. McAdams, R. L. Shiner, & J. L. Tackett (Eds.), Handbook of personality development (pp. 171–184). The Guilford Press.




کەسایەتی یەکێکە لە بابەتە زانستییە ئاڵۆزەکان، زۆرێک لە زانستەکان بابەت و توێژینەوەی تایبەتیان هەبووە و هەیە لەسەر ئەم لایەنەی مرۆڤ، وەک زانستەکانی سۆسیۆلۆجیا و سایکۆلۆجیا و ئەنسرۆپۆلۆجیا، هەروەها فەیلەسوفان لە بواری زانستی فەلسەفەشدا زۆرێک لەم بابەتانەیان خستووەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، بۆ نموونە ئەرستۆ کە باسی کەسایەتی کردووە، کردوویەتییە دووبەشی سەرەکی کە کەسایەتییەکانی (الفاضلة والرذیلة)، هەروەها سیفاتی هەریەکێکیان دەخاتە ڕوو، لە هەموو فەیلەسوفان زیاتر خوێندکارەکەی کە زۆر بەدوورودرێژی باسی کەسایەتییە جیاوازەکانی مرۆڤی کردووە و زیاتر لە (٣٠) جۆری کەسایەتی خستووەتە ڕوو، ئەویش فەیلەسوفی بەناوبانگ (سیوفراستبوس)، لە کتێبەکەیدا بەناوی (طبائع الشخصیات).

کەسێتی (الشخصیة) پێناسەیەکی جێگیر و یەکگرتووی نییە، بەڵکو بەپێی زانست و پسپۆڕییە جیاوازەکان جۆرەها پێناسەی بۆ کراوە، لەلایەکی دیکەوە ئەو زانستانەی مرۆیین ناتوانیت بەشێوەیەکی ڕەهایانە باسی بکەیت یان بیانناسێنیت، چونکە مرۆڤ دروستکراوێکی گۆڕاوە و جێگیر نییە وەک زانستە سروشتییەکانی دیکە، بەپێی کولتوور و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەکە مرۆڤەکان کەسایەتییان دەگۆڕێت. زاراوەی کەسێتی لە (persuna)ی لاتینییەوە هاتووە کە بەواتای ئەو دەمامکە هاتووە کە ئەکتەرەکان لەکاتی نمایشکردندا بەکاریانهێناوە، لەژێر ئەو دەمامکانەیاندا توانیویانە کۆمەڵێک ڕەفتاری تایبەتی بنوێنن بۆ بینەران، هەندێک لە زانایانی کۆمەڵناسی لایانوایە کە خودی ژیانی مرۆڤ بەگشتی جۆرێکە لە تەمسیل و نواندن بۆ ڕازیکردنی ئەوانی دیکە، ئەمەش تیۆری تایبەتی لەسەرە لە زانستی کۆمەڵناسیدا.

جۆردن ئەلبیرت، کە یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکان، زیاتر لە (٥٠) پێناسەی جیاوازی بۆ کەسێتی دیاریکردووە، کەسێتی بەشتێکی ڕاست و واقیعی دەزانێت کە لە ئەسڵدا لە بەشی ناوەوەی تاکەکاندایە، دیدگاکان بۆ ئەم بابەتە جیاوازە، هەندێک لە زاناکان لە لایەنی لاشعورییەوە بۆی دەڕوانێت، هەندێکی دیکەیان لەلایەنی بایۆلۆجییەوە شیکاری بۆ دەکەن، بۆ نموونە فرۆید کە باوەڕی وایە کەسێتی لە لاشعور دایە (الهو، والانا، والانا الاعلی)، لێرەدا باس لەم بابەتە ناکەین، سورۆکین بەهەمان شێوە باسی کەسێتی کردووە و بە پێکهاتەیەکی سەرەکی دادەنێت لە

هەموو نەسەقە کۆمەڵایەتییەکان و سەقافەی ئەو کۆمەڵگەی کە تاکەکەی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی لە کاریگەری لایەنی بۆماوەیی نەکردووە لەسەر کەسێتی مرۆڤەکان، ڕوونە کە قوتابخانەی ڕەفتاری هەتا سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەجۆرێک دانی نەدەنا بە کاریگەرییەکانی ژینگە لەسەر کەسێتی مرۆڤ، بەڵام لەکۆتاییدا تاڕادەیەک ئەو باوەڕەیان بۆ دروستبوو کە ژینگەش بەشێکی کاریگەرە لەسەر کەسێتی مرۆڤەکان، بەڵام سوروکین تەئکید لەوەش دەکات سەرەڕای سەقافەی کۆمەڵگە و نەسەقە کۆمەڵایەتییەکان ڕۆڵی بۆماوەیی بایۆلۆجیش کاریگەری هەیە، زۆربەی زانایان بەگشتی هاوڕان لەسەر ئەوەی کەسێتی مرۆڤ لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە، ئەویش سیفات و ڕەفتارە بۆ ماوەییەکانە لەگەڵ سیفاتە وەرگیراوەکان لە کۆمەڵگەوە کە ئەو تاکە تیایدا گەورە بووە و تیایدا دەژی. لەلایەکی دیکەوە (مالینوفسکی) زانای ئەنترۆپۆلۆجی بەریتانی، زۆر باوەڕی بەلایەنی دەروونی هەیە کە کۆمەڵگە و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانن دروستکەری ئەو پێکهاتەیەن کە کەسێتی مرۆڤەکان دروست دەکەن، هەروەها (راد کلف براون) زانای ئەنترۆپۆلۆجی، زۆر تەئکید لە کاریگەری سیستەم و نەسەقە کۆمەڵایەتییەکان دەکات لەسەر دروستکردنی کەسێتی مرۆڤەکان و چۆنێتی ڕەفتار و کردارەکانیان.

بابەتی (الثقافه) کولتوور، یەکێکی دیکەیە لە بابەتەکانی باسەکەمان، چونکە هەندێک لە زانایان دەڵێن: (الثقافة روح الامه)، ئەو جیاوازیی و تایبەتمەندیانەی لە نێوان گەلانی جیهاندا دەبینرێت، زۆربەیان لە کولتوورەوە سەرچاوەی گرتووە، بەناوبانگترین پێناسەکانیش بۆ کولتوور (الثقافه) پێناسەکەی (تایلور) ە، دەیناسێنی بەوەی:» گشتێکی ئاڵۆزە کە هەموو ئەمانە لەخۆدەگرێت، مەعریفە، بیروباوەڕەکان، هونەر، ڕەوشت، تەشریع، عورف، هەموو لێهاتوییەکانی دیکە لە نەریتە وەرگیراوەکان لەلایەن مرۆڤەوە بەوبڕوایەی ئەندامێکی کۆمەڵگەیە«. هەروەها (لینتون و کاردینەر) توێژینەوەی زۆریان لەم بوارەدا ئەنجامداوە، ئەم دوو زانایەش پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە کەسێتی بەرهەمی کولتووری کۆمەڵگەکەیە، بەڵام ئەمان لایانوایە پێکهاتەی کەسێتی مرۆڤەکان بریتییە لە(لایەنی بایولوجی + سیفاتی سایکۆلۆجی) ئەمانە کارلێک لەگەڵ ژینگەکەیاندا دەکەن، پاشان کەسێتی دروست دەبێت، ژینگەش جۆری زۆرە، بەگشتی ژینگەی سروشتی و ژینگەی مرۆیی یان کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، بەهەموو ئەمانەوە پێکهاتەی کۆتایی

بۆ کەسێتی مرۆڤەکە دروست دەبێت.

لە ئەنثرۆپۆلۆجی و کۆمەڵناسیدا لە بابەتی (کولتوور و کەسێتیدا)، تیۆری زۆر هەن کە بەدیدگای جیاوازەوە بۆ ئەم بابەتە دەڕوانن، لە دەروونناسیشدا بەهەمان شێوە، چەندین تیۆر هەن باس لەم بابەتە دەکەن، لە ئەنسرۆپۆلۆجیدا زۆر کار لەم بوارەدا کراوە، دوو بوار کە زۆر جێگای گرنگی پێدانن لای زۆرێک لە ئەنسرۆپۆلۆجستەکان بریتین لە: (الاتجاهات و الشخصية الاساسية)، و هەندێکیان باسیان لە (الشخصيه المنوالية)ش کردووە.

**کرداری تاکەکان بەپێی ڕۆڵ و پێگە و واجبات و مافەکانیان دەگۆڕێت، وەڵامی ئەمانەش بۆ کارتێکەرەکان جیاواز دەبێت بەپێی ئەو ڕۆڵ و پێگە و ئەرکانەی لەسەر شانیانە.**

وەڵامدانەوەی مرۆڤ لای ئەنسرۆپۆلۆجستەکان لەخۆوە (تلقائی) نین، بەڵکو کارتێکەر هەیە بۆ وەڵامدانەوەی کەسەکان، کە بەبڕوای زۆرێکی زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجی وەڵامدانەوەکان کولتوورین، لەناو تاکەکانی کۆمەڵگەکەدا پێشوەختە چێنراون، بۆیە توێژەر و زانای ئەمریکی (ڕۆبیرت میرتۆن) لایوایە ئاڕاستە مرۆییەکان ئامادەکردنێکی پێشوەختەیە بۆ تەعبیرکردن لە بۆچوونەکانی کەسەکە، هەروەها زانا (مایر) دەڵێت: ئاڕاستە زەمینەسازییە بۆ کردار و ڕەفتار و بۆچوونەکان، ئەمیش بەستراوە بە (الانفعال) و (الوجدان)، بەهەردووکیانەوە ئاڕاستە دروست دەکەن، چونکە ئاڕاستە کاریگەری لەسەر بۆچوونەکانی تاکەکە هەیە، بۆچوونیش کاریگەری لەسەر هەڵسەنگاندن و تەقیم هەیە، قۆناغی دوای هەڵسەنگاندن و تەقیم، حوکم و بڕیاردانە، بۆنموونە لەناو زۆرێک لە کۆمەڵگەکاندا دژایەتییەکی پێشوەختە لە نێوان بوک و خەسودا دروستکراوە، پێش بوونی بەبووک یان خەسوو، ئەمە ئەو ئاڕاستەیەیە کە پێشوەختە لە تاکەکاندا دروستبووە، لە

داهاتووشدا ئەم ئاڕاستەیە لە دەروونیدا دروستکراوە، کاریگەری خۆی لە نێوان ئەم دووکەسەدا دروست دەکات ئەگەر بە وتنیش بێت، یان کەسێک خۆشحاڵ نەبێت بە کەسێکی دیکە، ئەگەر بەرامبەر هەر قسەیەک یان کردارێک بکات ئەوا کەسی بەرامبەر بە هەڵە و حەساسیەتێکەوە قسەکانی لێوەردەگرێت، چونکە پێشوەختە لە بەرامبەر ئەو کەسەدا ئاڕاستەیەکی بۆ دروستبووە، یەکەم کاری پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) گۆڕینی ئاڕاستەی فیکری پەرستن بوو لە بتەکانەوە بەرەو خوای تاک و تەنها، لە نەسەقی دەروونی تاکەکانەوە دەستیپێکرد، پاشان دەچووە سەر کەسێتی ئەساسییان، لە ئاڕاستەکانیانەوە گۆڕانکارییەکانی دەستپێکرد، هەتا شکاندنی گەورەترینی بتەکان لەلایەن حەزرەتیئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) بۆ قسەکردنی بێباوەڕان بوو لۆژیکییەن لەگەڵ خۆیاندا هەتا بزانن ئاڕاستەکەیان هەڵە و پووچە، بۆیە ئاڕاستە عونصورێکی کاریگەرە لە نەسەقی دەروونی تاکەکان، ڕەنگە نەبینرێت، بەڵام شوێنەوارەکانی ئاڕاستە دەروونییەکانی مرۆڤ هەستی پێدەکرێن و زۆرجاریش شوێنەواریان دەبێت لە پەرچەکردارەکاندا.

بەشی دووەم، کە ئەنسرۆپۆلۆجستەکان گرنگی پێ دەدەن بریتییە لە (الشخصیة الأساسیة)، زانایانی ئەم بوارە تێبینی ئەوەیانکردووە کە تاکەکانی کۆمەڵگەیەک، کۆمەڵێک کردار و ڕەفتاری هاوبەشیان هەیە، کە وەک یەکە، نانخواردن و پۆشاک و دانیشتن و ڕێزگرتن و میوانداری و چەندین ڕەفتاری دیکە، کاردینەری زانا کەسێتی ئەساسی دەناسێنێ بەوەی (سیفاتە کولتوورییە هاوبەشەکانی کۆمەڵگەیە، هەروەها بەدەوری کەسێتی ئەساسیدا کەسێتییەکی شوێنیمان هەیە (الشخصیة المکانیة)، ئەم کەسێتی شوێنییە خاڵێکی گرنگە، چونکە کرداری تاکەکان بەپێی ڕۆڵ و پێگە و واجبات و مافەکانیان دەگۆڕێت، وەڵامی ئەمانەش بۆ کارتێکەرەکان جیاواز دەبێت بەپێی ئەو ڕۆڵ و پێگە و ئەرکانەی لەسەر شانیانە، بۆ نموونە پێگەکان جۆراوجۆرن لە ژیانی مرۆڤەکاندا، پێگەمان هەیە واجبکراوە، بۆ نموونە ناتوانیت کە هاوسەر و منداڵت هەبوو نەبیتە باوک، یان ئەبیتە خاڵ ئەبیتە مام و ... هتد، کۆمەڵێک پێگەمان هەیە بەدەستهێنراون لەناو کۆمەڵگەدا، بۆ نموونە، ئەبیتە مامۆستا یان دکتۆر یان پارێزەر ... هتد، ئەم دوو جۆرە ئەگەر تێکەڵییەکی ناتەندروستی بۆ دروست ببێت ئەوا کێشە لە ڕۆڵەکاندا دروست دەکات، بۆیە پێویستە هەر پێگە و ڕۆڵێک کە مرۆڤ هەیەتی یان بەدەستیدەهێنێت بەپێی پێگەکەی کارتێکەر و وەڵامدانەوەکانی جیاوازە و دەگۆڕێت، بازنەی سێیەم بریتییە

لە کەسێتی (فەردی). هرسکۆفیتش باس لەم لایەنە دەکات بەوەی، کەسێتی تاک خۆیەتی و بە (طبعی) کولتووری بە تەنها ناتوانرێت لاببرێت و ئەو توانایەیی نییە بتوانێت گۆڕانکاری تەواوی تێدا بکات، هەندێکجار پەروەردە و پێگەیاندن بەتەنها خۆی ئەویش ناتوانێت ئەو کەسێتییە تاکەیە بگۆڕێت، بەڵام بە کولتوور و پەروەردە و پێگەیاندن لەگەڵ عەقڵی جەمعی و فشارە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگەکەی بەبێ ئەوەی تاکەکە بەئاگا بێت لێی بۆخۆی دەیسەپێنێت، واتە جێگیر دەبێت تیایدا و ناتوانێت خۆی لابدات لێی.

لە نووسینی هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناساندا، ئاماژەدراوە بە کەسێتی تاکی کوردی، وەک (بیندەر، سۆن، میلینکن، مینۆڕسکی، کریستوف، باسیلی نیکیتین ... هتد)، هەروەها توێژینەوە ئەنسرۆپۆلۆجییەکەی (هنری فیلْد) لە باشووری کوردستان، کە باسی سیفاتی سروشتی فیزیکی و کۆمەڵایەتی و کەسێتی کوردی کردووە، زۆرێکیان باسی کوردیان کردووە لەڕووی چەند سیفاتێکەوە وەک (ئازایەتی، تۆڵەسێنن، خۆڕاگرن، پابەندی پەیوەندی خێڵەکین، پارێزگارن لەڕووی دابونەریت، میواندۆستن، کراوەن، خۆشەویستیان بۆ خاک و نیشتیمانیان زۆرە، زۆر ڕێز لە خێزانەکانیان دەگرن، خاوەن بەڵێنن و چەندین سیفاتی جوانی دیکەیان باسکردووە).

شارەزایانی دیکەی وەک د.علی وەردی، کە چەندین توێژینەوە و پەرتووکی لەم بوارەدا هەیە، پەرتوکەکانی (کەسێتی تاکی عێراقی/ طبیعة المجتمع العراقی)، هەروەها (د.شاکر موستەفا سەلیم) کە بۆ یەکەمجار زانستی ئەنسرۆپۆلۆجیای هێنایە عێراق، چەندین توێژینەوەی هەیە لەسەر نەریت و کەسێتی تاکی عێراقی، هەروەها (د.علاالدین جاسم البیاتی) و (د.قەیس نوری)، ئەمانە لە بابەتە زانستییەکانیاندا باسی سروشتی مرۆڤ و پەیوەندییەکانیان و کەسێتی مرۆڤیان کردووە کە هەندێکیان لەسەر کۆمەڵگەی عێراقین، گەلی کوردستانیش بەشێکە لە کۆمەڵگەی عێراقی و لەژێر کاریگەری هەندێک لە نەریت و عورف و شێوازەکانی ژیانی عێراقدایە. سنوری جوگرافی و ستراتیژیەتی خاکی کوردستان وایکردووە کە پێکدادانی کولتووری زۆری بۆ دروست ببێت، ئەوانیش لەگەڵ نەتەوەکانی وەک (تورک، عەرەب و فارس)، ئەمەش سەختییەکی لە ناسینی کەسێتییەکان لەناو کۆمەڵگی کوردیدا دروستکردووە، چونکە تێکەڵی و (هەجینە)یەکی لە کەسێتی تێدا بنیادناوە کە فرەجۆرییە لەکەسێتی. دکتۆر عەلی وەردی ئاماژەی بە هەندێک لەو

بابەتانە داوە، کۆمەڵگەی عێراقی لای ئەو لە دوو پێکهاتەی سەرەکی پێکهاتووە، ئەسڵی کۆمەڵگەی عێراقی کە ئەخلاقییاتێکی شارستانییانەی هەبووە، لەلایەکی دیکە ئەخلاقی (البداوە)، کە کۆچەریی و دەوارنشینەکانن، ئەم دووانە بوونەتە بناغەیەک بۆ کۆمەڵگەی عێراقی بەگشتی، هەرێمیش بەهەمان شێوەی عێراقە، (هنری فیلد) دەڵێت:» کۆمەڵگەی کوردی لە سێ گرووپدا خۆیان دەبیننەوە کە بریتین لە: شەڕکەر، جوتیار، شوان»، ئێستاش ئەم سێ چینە لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا زۆرینەی کۆمەڵگەکەیان پێکهێناوە، کەواتە ئەمە تاڕادەیەک لەناو کەسێتی تاکی کوردیدا جێگیربووە، هەتا ئەمە لە پیادەکردنی حوکمداری هەرێمدا زۆر بەڕوونی هەستی پێ دەکرێت.

یەکێک لەڕۆژهەڵاتناسان دەڵێت:» تاکی کوردی لایوایە دونیا بۆ بەهێزەکانە«، بۆیە ئەم جۆرە دیدگایە بەشێکی سەرەکییە لە کەسێتی تاکی کوردی، ئەم بابەتانە ڕێژەییە و ڕەهایانە بڕیار نادرێت، بەڵام تاکی کوردی هەندێک سیفاتی تێدایە کە بەئاشکرا لە ئەزموون و ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر بەڕوونی هەستی پێدەکرێت و دەبینرێن، لەوانە تاکی کوردی زۆر (تکیف طلب)ین، واتە هەمیشە داوا لە بەرانبەر دەکەین بگونجێت و ئەو خۆگونجێنەر بێت نەک ئێمە، ئەمەش زۆر هۆکاری هەیە لە سروشتی ژیان و پەروەردە و مامەڵەی دەوروبەر لەگەڵیدا سەرچاوەی گرتووە، بەدەگمەن بە ڕێکەوتن دەگەینە ئامانج، بەتایبەتی لە ناوخۆی خۆیدا زۆر ئەستەمە هیچ ڕێکەوتنێک پەسەند بکات.

(تکیف) شوێنکەوتەیی دروست دەکات، واتە دەبێت بەرانبەر لەگەڵ مندا بسازێت، ئەگەر نەسازا ئیتر یان بەنەزان سەیر دەکرێت یان بە خیانەتکار، ئەم سیفاتە لەناوماندا زۆر بەئاشکرا دەبینرێت، بەڵام (توافق) واتە ئاڵوگۆڕ و ڕێککەوتن لەسەر هەندێک شت کە پێمباشە، وازهێنان لە هەندێک لە ماف و داخوازییەکانت بۆ بەرانبەر، هەروەها بەرامبەریش بەهەمان شێوە، واتە بە بەرژەوەندی هەردوولا بێت نەک تەنها لایەنێک، ئەو خواستی خۆگونجاندنی بەرانبەر و پێداگری لێی زیانی لە پەیوەندی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی داوە.

یەکێکی دیکە لە جۆری کەسایەتی لەنێو کورددا کەسایەتیەکی هیواخوازە، لە لۆژیکدا دوو جۆر هەیە، لۆژیکی تیۆری (عقلية النظرية)، ولۆژیکی کرداری (عقلية العملية)، تاکی کوردی بەڕێژەیەکی زۆر لۆژیکی تیۆری تیایدا زاڵە، ئەم جۆرە

لۆژیکەش کاتێک بەتەواوی کاری پێدەکرێت کە ئەرکێکی پێ بدەیت، بۆیە تاکی کوردی لەڕووی زانین و زانیارییەوە تاڕادەیەکی باش بەتوانایە، بەڵام کاتێک دەکەوێتە سەر بواری کرداریی و ئەرکێکی پێ بدرێت تاڕادەیەکی زۆر دەسەوسان دەبێت، یان بەدەمەوەچوونی بۆی زۆرکەم دەبێت.

بەئاینکردنی شتەکان یەکێکی دیکەیە لە سیفاتەکانی تاکی کوردی و هەتا ئاستێکی زۆر هەستی پێدەکرێت، بۆ نموونە لە ئایینی ئیسلامدا جێگیر و گۆڕاوەکانمان هەیە، تاڕادەیەک تاکی کوردی هەوڵدەدات کە گۆڕاوەکانیش بکاتە چەسپاو و نەگۆڕ، بەڵام بەوشێوەیەی کە خۆی مەبەستییەتی، هەتا (هینری فیلد) کە باسی باشووری کوردستان دەکات دەڵێت: لە کۆمەڵگەی کوردیدا هەموو سەرکردە کوردیەکان هەوڵیانداوە سوود لە پێگەی ئاینی وەربگرن، چونکە تاکی کوردی وابەستەیی بەدینەوە زۆرە، ئەوەش وایکردووە زۆربەی سەرکردەکان هەوڵیانداوە سوود لەمە وەربگرن.

سیفاتێکی دیکەی تاکی کوردی ئەوەیە، تاڕادەیەکی زۆر دژە دەسەڵات و دەوڵەتن، ئەمە ڕاستە ڕێژەییە، بەڵام بەئاشکرا ئەم سیفاتە لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا بینراوە و دەبینرێت، چونکە وەک یەکێک لە توێژەرانی ئەنسرۆپۆلۆجی عێراقی دەڵێت:» دەوڵەت لای خەڵکی عێراق بەم مانایانە دێت، ئاژەڵەکانی لەگەڵدا دابەشبکات و لێی داگیربکات، باج و ڕسوماتی لەسەر دابنێت، بەرهەمی ساڵانەی لەگەڵدا دابەش بکات، ئەم شتانە بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ گەلی عێراق، کە کوردیش بەشێکە لێی بووەتە یادەوەریی و شێوە و وێناکردنێکی زۆر ناشیرینی دەوڵەتی داوەتە خەڵکی»، ئەم سیفاتەش هەتا ئاستێکی زۆر کاریگەری لەسەر کەسێتی تاکی کوردیش هەبووە، کە دەڵێیت دەوڵەت یەکسەر دابەشکاریی و داگیرکاریی و بەرژەوەندی کەسانی سەربەدەوڵتیان دێتە پێشچاو، بۆیە خێرا دژی دەوەستنەوە.

فره کەسێتی، کە لە تاکی عێراقیدا دکتۆر علی وەردی باسیکردووە، ئەم حاڵەتە لە خەڵکی کوردستانیشدا تاڕادەیەک هەستی پێدەکرێت، ئەم حاڵەتە پەروەردەی خێزانی کاریگەری زۆری هەیە لەسەری، هەروەها ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاوە کەسایەتی (موزیف) و ناواقیعی هاتوونەتە بوون کە پێگە و سایتیان بۆ دادەنرێت، هەڵدەستن بە گەورەکردن و فووکردنە کەسێک، کە لەڕاستیدا بەوشێوەیە نییە کە دەخرێتە ڕوو، ئەوەش کاریگەری لەسەر پێگە

و ڕۆڵەکان کردووە لەناو ناخی تاکی کورددیا و تووشی چەندین گرفت بووە. بەگشتی مرۆڤەکان هەڵگری ئەو سیفاتانەن کە لەنێو کولتوور و سیفاتی خودی و ژینگەکەیدا بەدەستیهێناون، (روس بندکت) زانای ئەنسرۆپۆلۆجی لای وایە: تاک پەڕەیەکی سپییە، هەر کولتوورێک بیەوێت کاری تێدەکات، و دەتوانێت تەبعی تایبەتی خۆی تێدا دروستبکات، هەروەها بۆچوونی وایە کە بۆ تەفسیری شێوەی کولتووری زۆر پێویستمان بە دەروونناسیی و مێژوو هەیە و هیچ یەکێکیان ناتوانێت جێگای ئەوی دیکەیان بگرێتەوە.

## سەرچاوەکان


١_ د.عاطف وصفي، الانثروبولوجيا الاجتماعية، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨١.

٢_ د. فاروق اسماعيل، المدخل الى الانثروبولوجيا، دار المعرفة الجامعية _ الاسكندرية ،١٩٨٧.

٣_هنري فيلد، جنوب كردستان دراسة انثروبولوجية، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار آراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠١٣.

٤_ د.علي وردی، شخصية الفرد العراقي، منشورات دار ليلي، ١٩٥١.

٥_ د.رياض الزغل، مقدمة في علم النفس الاجتماعي والسلوك التنظيمي، دار قتيبة.

٦_ طوماس اريكسون، محاط بالحمقى، ترجمة: عمر فتحى، دار صفصافة للنشر والتوزيع والدراسات، ٢٠٢١ .





پ.ی.د. ماجید خەلیل

# بەراوردی وێنای ژنانی کوردستان

## لە بینینی ئەولیا چەلەبی و کوردناسە ناموسڵمانەکاندا

## پێشەکی

وەک چۆن شوناس، بابەتگەلی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان دیاری دەکات، بەوجۆرەش شوناس شیکاری دیدگا جیاوازەکانی پەیوەست بەچۆنییەتی چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکات.

زەمینەیەکی زۆر پانوبەرینی کاری کوردناسەکان لەسەر لۆژیکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی و کولتووریی کورد لە کوردستاندا بوونی هەبووە، ئەمە ئەندێشەیەکی هەم سیاسی، هەم ئایینی هەم ئابووریی لە پشتەوە بووە. کوردناسەکان بە دەگمەن بەشێوەیەکی هەوانتە و هەروا گەشت و گەڕانەکانیان گیانی کۆمەڵایەتی کوردی بەسەر نەکردووەتەوە، نەخێر نیازی ئەوان ڕۆشنە، ڕوانگەی ئەوان ئەستەمە ئیمانێکی سیاسی و مەڵامەتێکی دیاریکراوی لەپشتەوە نەبووبێ، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیارە، ئێمەی کورد کەی کارەکانی ئەوان ئەدەینە بەر نەشتەری چارەسەرێکی چارەنووسسازانە تاوەکو کرۆکی کارەکانیان بخوێنینەوە؟ تاکەی لە داوی دنیابینی ئەواندا قەتیسین و قەدەری شکڵ و شێوەی کۆمەڵایەتیمان لە دەستی ئەوانە؟ ئایا بەڕاستی واین، کە ئەوان ئەیڵێن؟ ئایا بەردەوام بابەتی زانستی توێژینەوە و تێڕامانەکانمان لە تورەکەی لۆژیکی واندا دەردەهێنین و بەس، ئەوەی ڤاسیلی نیکیتین و مارتین ڤان برۆنەسن و مارک سایکس دەیڵێن ڕێک وایە؟ ئەی ئەوەی ئەوان نووسیویانە نیازی چی تاوی داوە؟

بەگشتی لەم توێژینەوەیەدا تەمای بەراوردێکی زانستی زەمینەیەکی زیهنی بۆ ڕەخساندووین، دەمانەوێ بەراودی سەنا و سیمای ژنی کورد لە لێدوان و نووسینی ئەولیا چەلەبی و هەموو ئەوانی تردا بکەین. ڕەنگە پرسیار بکەین، بۆچی هەموو ئەوانی تر و ئەولیا چەلەبی؟ ئەولیا چەلەبی و چەندانی تر کاتێک هاتوونەتە کوردستان ژنی کوردیان دیوە، بەڵام هەریەکەیان لە لۆژیکی خۆیەوە خەریکی خەریتەیەکی کێشانی کۆمەڵایەتییانەی ژنی کورد بوون. ئەولیا چەلەبی وەک موسڵمانێکی پابەند بە بابەتی ئایینی و لەسەر ڕێچکەیەکی سوننەگەڕاوە، سۆنگەی خۆی خزاندووەتە ناو نیشاندانی ژنی کوردەوە، ڕێک بێ لە وەسف و سەنا، هەڵبەتە لە تێگەیشتنی خۆیەوە شتێکی تری نەوتووە، هەموو ئەوانی تریش هەروەها هەر وەسف و سەنای ژنی کوردیان کردووە، باسیان لە بابەتی ئازادی و ئەخلاق و ئیمانی ژنی کورد کردووە، کەچی خۆدزینەوەیەکی لە واقیعی حاڵ و حەکایەتی

ژیانی ڕاستەقینەی ژنی کورددا بوونی هەیە کە کەسیان دەستی بۆ نەبردووە. کوردناسەکان بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە پێگەی ژنی کوردیان بەرز ڕاگرتووە، لەکاتێکدا پێگەی ژنی کورد لە خواری خوارەوەی ژیانێکی ئینسانییەوە بووە، کە دەبوو هەیبێت. لەم توێژینەوەیەدا دەمانەوێت فاکتەرەکانی کوشتنی ڕەخنە باس بکەین، ئەو فاکتەرانەی کە پاڵنەری سەرەکی دروستبوونیان پەیوەندیدارە بەو وەسف و وێنە کۆمەڵایەتییەوە کە کوردناسەکان بۆ ژنی کورد هەیانبووە.

ئەم توێژینەوەیە بەراوردی: یەکەم: جۆر و جێکەوتەی جوڵانەوە کۆمەڵایەتییەکەی ژنانی کورد دەکات لە دیدی هەردوو بەرەکەدا، بەرەی ئەولیا چەلەبی و بەرەی کوردناسە ناموسڵمانەکان. دووەم: بۆچی هەردوولا وەسفی ژنی کورد دەکەن، ئایا جیاوازی وەسف و ستایشەکەیان لەکوێدایە؟ ئایا بەڕاستی ژنی کورد لەو ئاستی لۆژیکەی ئەواندا بووە؟ ئەی بۆچی هەردوولا هێمایان بە جوانی و جیاوازی ژنی کورد کردووە؟ ئەمە و چەندین پرسیاری تر لەم توێژینەوەیەدا تەڕحکراون و شیکراونەتەوە.

## تەوەری یەکەم: شوناسی کۆمەڵایەتی و شیکاری دۆخی مێژوویی ژنی کورد

### یەکەم: شوناس و شوناسی ژنی کورد

بەگشتی هەموو تایبەتمەندییەکانی تاک، کۆمەڵ، ڕەگەز یان چوارچێوەکانی چینی کۆمەڵایەتی لە شێوەی شوناسدا بەرجەستە دەبێت، چونکە شوناس پەیوەستە بە دینامیکی ئازادییەوە، یاخود پەیوەستە بە دیالێکتیکی بوونەوە. ئەم داینامیکە سەرچاوەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەیە. بۆیە بەردەوامیش بەپێی تایبەتمەندی و پێویستی کات و شوێن خۆی نوێدەکاتەوە. لەلایەکی ترەوە دروستبوونی شوناس پەیوەستە بە پەیکەری کۆمەڵایەتییەوە. تێکڕا پەیکەری کۆمەڵگە، ئایدۆلۆژیا، باوەڕ، کولتوور، سیاسەت، هەموو چەمک و تیۆر و دامەزراوەکان پێناسەی شوناس دەکەن. لەگەڵ ئاڵۆزبوونی پەیکەری کۆمەڵایەتیش، شوناسیش ئاڵۆزتر دەبێت.

لەڕاستیدا پێوەرەکانی تێگەیشتن لە ناسنامە جیاوازن، بۆ نموونە لە کۆمەڵگەیەکی سروشتیدا شوناس لە ڕێگەی چەمکەکانی خێڵ و خێزان و خوێنەوە دەردەکەوێت، لەکاتێکدا لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا لە ڕێگەی نەتەوە، ئایین، دەوڵەت یان تاکەوە دەردەکەوێت. لێرەدا کاریگەریی شوێن یان جوگرافیا و تایبەتمەندییەکانی سەردەم

و پێداویستییەکانی کۆمەڵگە گرنگییەکی بەرچاویی هەیە. سیاسەتی ناسنامە کاریگەری لەسەر هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵگە هەیە، تەنانەت کاریگەرییەکان بەشێوەیەکی جیاواز و قووڵیش دێنە پێشەوە.

هەرچەند کە پەیوەندی نێوان گۆڕانی خێرا لە پێناسەکانی ناسنامە و جیهانگیریی هاتووەتە ئاراوە. کوردستان خودان خەسڵەتی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنە، ڕاستە خێزان و خێڵ و خوێن لە فۆرمە فیوداڵییەکەدا بوونی بەرچاوە، بەڵام پرسی ئافرەت، ئاوێتەی ئەدەبیاتێکی مۆدێرن کراوە، بەڕادەیەک ڕاسان و ڕیفۆرم هەر ئەدگارێکی تری ئازادی لە نەخشی نەریتە کوردییەکەی ژناندا، خۆی لە لۆژیکێکی سەردەمیانەدا دەبینێتەوە.

نەتەوەی کورد، لە کوردستاندا بەگشتی جوگرافیاکەی جەستەیەکی بریندار و کەوتووی نێو کەڵەهەرزی کولتوورەکانی دەوروبەرە، کە بە سیاسەتی لەناوبردن و نکۆڵیکردن و شەڕ و داگیرکاری و دیپۆرتکردن دراوەتە دەست قەدەرێکی قاتڵ.

کورد گەلێکە، بە پەیمانی زەهاو لە سەدەی ١٧دا بەسەر دوو کیشوەر و بە پەیمانی لۆزان لە سەدەی بیستەمدا بەجارێ کەرت کەرت کراوە بەسەر چوار چارەنووسی لێکجیاوازدا. بۆیە بەردەوام بوونی خۆی لە چنگی سیاسەتی لەناوچووندا لێکداوەتەوە. کەوایە ناکرێت کولتووری کۆمەڵایەتی کوردیش تاڵاوی ئەو بندەستییەی نەچەشتبێت، ناکرێت کورد ساڵەهایە بندەستکراوی سیاسیی بێت، بەڵام لەڕووی کولتوورییەوە لەپێشی ئەوانی ترەوە بێت. ئەدی گرفتەکە لەکوێدایە، پیلانیک هەیە و پێی نازانین یان چی؟

کوردستان جگە لە پێگەی جیۆستراتیژیی و دەرامەتە دەوڵەمەند و سروشتییەکانی، لە شرۆڤەی شوناسەکانیشدا شوێنی کولتووری ڕەگە نیوۆلیتیکییەکەیە، کە سەرەتای کولتووری کۆمەڵایەتیبوونی خستووەتەوە. بەواتایەکی تر کۆمەڵگە خانەیەکی بنەڕەتییە، خانەیەکی زیندووە و بەردەوامە. ئەو خانەیەش لە قۆناغی ژنسالارییەوە سەریهەڵداوە. بۆیە لە هەر جوڵانەوەیەکی ڕاسانە کوردییەکەدا، بەردەوام لەسەر ڕەگ و ڕیشەی خۆی گەشەی کردووەتەوە. کەسێکی وەک عەبدوڵڵا ئۆجەلان زۆر بەوریاییەوە دەستی بۆ ئەم پرسە بردووە، ئەوەتا لە شیکاریی شوناسدا زۆر بەوردی و بابەتیی باس دەکات:" نەریت و کولتوور خۆیان واتای بەرخۆدان دەگەیەنن، یان لەناودەچن یان دەمێننەوە، چونکە نازانن چۆن ڕادەستبن".

بۆیە بابەتی  ژن، ئاوێتەیە بە دۆخ و دنیابینی دەسەڵاتە داگیرکارییەکە، کە لەیەککاتدا ئایدیۆلۆژییە، خێڵەکییە، ئاینییە، چەقبەستووە، هەر هوتافێکی ئازادیی ژن، ڕیسی ڕووخسارەکانی هەموو فۆرم و فەلسەفە داگیرکارییەکە هەڵدەوەشێتەوە.

ئەم ئایدۆلۆژیانە لە ئێستاشدا بەردەوامن لە هێرشکردن، هەروەک چۆن بە درێژایی مێژوو میرات و مۆرەی سەر سنوورەکانی ئازادی ژن بوون. کەوایە هەر هەوڵێک بۆ لەناوبردنی بوونی کورد، لەهەمانکاتدا هەوڵ و هێرشی لەناوبردنی بوونی ژنیش بووە لە کوردستاندا. ئەم کولتوورە ڕەگ و ڕیشەی  کۆلۆنیالیزمێکی بەرفراوانی ئەزموون کردووە و بەردەوامیشی هەیە.  بۆ وێنە لەسەر ئەم بنەمایە، خەسڵەتەکانی خاک و بیرەوەریی یان یادگەی ژنی کورد، خەسڵەتی شوناسن، مادام وایە چ خاک و چ هەست و هۆش و یادگارییەکان ماناکانی خۆیان لە ناسنامەی ژندا بەدەست دەهێننەوە. بەگشتی دەخوازین بڵێین شوناس لە ڕێگەی دیالێکتیکێکەوە دروست دەبێت، کە وەڵامی پێداویستییەکانی هەر سەردەمێک و ئەم سەردەمە دەداتەوە.

پێش ئەوەی بچینە سەر گرنگی یەکلاکەرەوەی ئەم شوناسە لە هەوڵەکانی یەکبوونێکی نەتەوەییدا، پێویستە مامەڵە لەگەڵ ناسنامەی ژندا بکرێت. ژن وەک بابەتێکی سیاسی سەردەمیانە. خەباتی ئازادیخوازیی  ژنانی کوردستان لە ڕێگەی کولتوورەوە گەشە دەکات،  ئەو فۆرمە واتاسازیی و ستراکتووری شوناسی شۆڕشی ژن دروست دەکات. لە پێوەندی لەگەڵ ئەمەدا، ڕۆڵی ئیرادەی ئازادیی ئافرەت لە هەر هەوڵێکی یەکبوونی نەتەوە و نیشتماندن تێکهەڵکێشە. ئافرەتی کورد لە مێژووی دوورودرێژی خۆیدا بەر قووڵترین سیاسەت و کولتووری بندەستی و کۆیلایەتی کەوتووە.

## دووەم: پێشینە و بارودۆخی ئافرەتی کورد:

لە دیالێکتیکێکی خەباتدا بە ڕەگ و ڕیشەی خۆیەوە وابەستە بووە، واتا وێنای ئافرەتی ئازاد، وێنای وڵاتێکی ئازاد بووە، چونکە کوردستان ئەو شوێنەیە کە یەکەمین فەرهەنگ و فەلسەفەی کۆمەڵایەتی تێدا ڕێکخراوە، یانی یەکەم فەلسەفەی ئازادی و ژیان لە لۆژیکی دێهات و دەروونی کۆمەڵگەی کوردستانەوە کاری تێداکراوە. تەنانەت تەڕحێکی وەها کە کوردستان شوێنی شۆڕشی کشتوکاڵی- گوندی و سەردەمی بەردینی نوێیە.

بەواتایەکی تر لە کولتووری کێبڕکێ بۆ بابەتی شوناس، شێوە و شکڵی

شۆڕشی ئافرەتان بە هەموو هێزی بوونییەوە، بابەتێکە بەدەر نییە لە شۆڕشی نەتەوەیەکی بندەست، چونکە شۆڕشی نیۆلیتیک کە شۆڕشێکی ڕۆشنبیرییە و خاوەن سیمایەکی گەردوونییە، هەروەها شۆڕشێکی کشتوکاڵی و گوندنشینییە، تایبەتمەندی کولتوورێکی ڕەگ و ڕیشەداریی هەیە، کە وەک کیانێک خۆی پێکهێناوە.

تێبینی دەکرێت ئەم کولتوورە لە میزۆپۆتامیای سەرەوە لە دەوروبەری (١٠) هەزار ساڵی پێش زایین لەژێر سەرکردایەتی ژناندا هاتبێتە ئاراوە. دۆزینەوە و داتا ئاشکراکراوەکان ئەو واقیعە مێژووییە دەسەلمێنن کە جوگرافیای کوردستان یەکەم شوێنی گەشەسەندنی شۆڕشی کشتوکاڵی- گوندنشین بووە و شوێنی سەرەکی و ناوەندی ژیانی نیشتەجێبوون بووە. ئەوەتا لە ناوچەی مێرگەسوور لە دیانا چەندین بەڵگەی شوێنەواریی دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەیان بۆ (٦٠) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە.

لە سلێمانیش هەزارمێرد مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٤٠) هەزار ساڵ پێش زایین، هەروەها ئەشکەوتی زەرزی، گرکێ هێچیان-ئامەد ناوچەی فارقین ( ٦٠٠٠-٥٠٠٠)پێش زایینە، نەوالا چۆری-ئورفا سیڤێرێک (٨٠٠٠-٧٠٠٠ پ.ز)، گێنچی دارا (گەنجدەرە)-کرماشان ( ٨٠٠٠)پ.ز، چایۆنو-ئامەد ئێرگانی ئەمانە ئەو شوێنانەن کە لە سەردەمی بەردینی نوێ سەردەمی (٩٠٠٠ پێش زایین) دۆزراونەتەوە. گوندێ چەرمۆ لە چەمچەماڵ مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٩) هەزار ساڵ پێش زایین، کە گوندێکی سەردەمی بەردینی نوێیە. ئەم واقیعە مێژووییانە داتای کۆنکرێتی دەخەنە ڕوو کە یەکەم ژیانی کۆمەڵایەتی و شۆڕشی کولتووری نیوۆلیتیک لە قۆناغی باڵادەستی ئافرەتانی کوردستان داڕێژراوە. بەدامەزراوەییکردنی ئەم کولتوورە و گەیشتن بە لوتکە، زیاتر خۆی کۆنکرێت کردووە. گەشەسەندنی کولتووری تێل خێلف بەردی بناغەی شارستانییەتێکی دانا کە چەندین داهێنانی نوێی دروستکرد، چەرخ و تەلارسازی تێکڕا بەرهەمی ئەم قۆناغەن. لەکاتێکدا کە کولتووری تێل خلێف، کولتوورێکی باڵادەستی دایک-ژن، بووە لە میزۆپۆتامیای سەرەوەدا. هەر لە میزۆپۆتامیای خوارەوەدا هەر لە پێش زایین (٤٢٠٠-٣٢٠٠)، کولتووری گردۆڵکەی عوبێد کە نوێنەرایەتی کولتووری پیاوسالاری دەکات، پەرەی سەندووە. تەنانەت کولتوری عوبێد خۆی بە دامەزراوەیی کردووە بەبنیاتنانی خۆی لەسەر بەها کولتوورییەکانی تەل خلێف. هەرچەندە کولتووری عوبێد کولتوورێکی بە ڕەچەڵەک

سامییە، بەڵام بەهۆی کولتووری ڕاوکردن و شوانکارییەوە خۆراکی پێدراوە. بۆیە کولتوورێک بووە  لە دەوری شارەکانی ئێریدۆ و ئور لە میزۆپۆتامیای خواروودا پەرەی سەندووە. ئەم قۆناغە دروست  ئەو قۆناغە بووە کە شارنشینی و پێکهاتنی چینایەتی و بازرگانی و هێزی ئایدیۆلۆژی و سروشتی و سەربازیی پەرەی سەندووە. لەڕاستیدا  دژایەتی و ململانێ و بەرخۆدانێک هەیە کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە، تێکڕاش  دژایەتییەکە لە دژی کولتووری عوبێد کە هەوڵدەدات کاریگەریی لەسەر کولتووری میزۆپۆتامیای سەرەوە دروست بکات.

ئەم ململانێیە وەک ململانێ و دژایەتی شاخ و دەشت و گوند و شار، ژن و پیاو، مرۆڤ و سروشت، هێڵی ئازادیخوازانە و پێچەوانەکەی، دەچێتە ناو ئەجێندای مرۆڤایەتییەوە. ئەم واقیعە لە ئەفسانەی خوداوەندی شاخەوە تێدەگەین، کە لە ئەفسانەی سۆمەرییەکانی ئەو سەردەمەدا باسکراوە. دیسانەوە لە داستانی گیلگامێشدا، فیگەری نینهورساگ کە بەرەنگاریی شارستانیەتی سۆمەری دەبێتەوە و نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەند دەکات، لە بنەڕەتدا نوێنەرایەتی هێمای بەرخۆدانی خەبات بۆ ئازادی و بوون دەکات. لەم ئەفسانەوە تێدەگەین کە کولتوورێکی بەرخۆدان لە بەرامبەر شارستانیەتی ناوەندی گەشەسەندوودا سەرهەڵدەدات. ئەم پرۆسەیە وەک یاخیبوون و دژە شۆڕشێک لە دژی کولتووری نیوۆلیتیک پەرەیسەند، کە شۆڕشی گوندی کشتوکاڵی بوو کە نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەندی دەکرد. ئەم شەڕ و ململانێیە دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایین. تا ٢٠٠٠ ساڵ پێش زایین بەردەوام بووە.

بەرەنگاربوونەوەی ژنانی کورد، دروست خەباتی خەڵکێکی ناو  کوردستانێکی داگیرکراوە. کوردستان بە پەیمانی زەهاوی ساڵی ١٦٣٩ بۆ دوو بەش دابەش بوو. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو کوردستان بەرەوڕووی هەموو جۆرە سیاسەتێکی جینۆسایدی کولتووریی و فیزیکی و سیاسی بوویەوە، بەتایبەتی سیاسەتی لەناوبردن و نکۆڵیی و نیازی سڕینەوە. لێرەدا  ئافرەتانی کورد کە ڕیشە و ڕێگا و ڕۆحی  کۆمەڵایەتییان لەسەر بنەمای نیۆلیتیک و عەقڵیەتێکی دێرین لەسەر بنەمای کولتووری خوداوەندەکان خۆی خەملاندووە، ڕۆڵی پێشەنگیان لە لۆژیکی بەرخودانەکانی سەدەدا بینیوە[1].

---

1 Nagihan Akarsel: Kürt Ulusal Birliği’nde Özgür Kadın Hareketinin Rolü//




## سێیەم: دۆخی ژنی کورد لە پەڕینەوە لە مێژووی کۆنەوە بۆ ناو مێژووی ئیسلام

لەگەڵ هاتنە ناوەوەی ئیسلام بۆ ناو کوردستان، ئافرەتان پێگەی سەربەخۆی خۆیان لەنێو ئەو هۆزە کوردانەی کە پاشەکشەیان کرد بۆ شاخەکان پاراست، بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی ئیسلامدا ئافرەتان زیاتر لە بنەماڵەدا قەتیس بوون و لەژێر کاریگەری عەقڵیەتی خێڵ و ئاغادا بوون و چوونە ناو بازنەی ئیستغلالکردن لەلایەن پێکهاتە خێڵەکی و ئایینییەکانەوە.

هەڵبەتە، ئەم ئەدەبیاتە زادەی ئەرستۆقراتییەتی عەرەبی بوو، نەک نیازی ئایینی ئیسلام، بۆیە بەدرێژایی پشتیوانی کورد لە هەر جوڵانەوەیەکی دژ بە دەسەڵات، چ خەواریجەکانی شارەزوور و جەزیرە بووبێت یان عەلەویی و عەباسییەکان، بابەتی بونیادیی کومەلایەتی پرسێکی گرنگی یاخیبوونەکە بووە، کە ڕازی بوون بە بابەتی ئەندێشە ئیسلامییەکە لە بە مرۆڤبینینی ژندا.

لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەو دۆخەی کە کۆمەڵی کوردی ویستویەتی وردبینەوە ڕێک هاوتەریبی هێزە ئاینییەکەیە نەک خواستە خێڵەکییەکەی بادییە، بۆ نموونە:

خەواریج لە دوای جەنگی نەهرەوان لە ساڵی (٣٨)کۆچی بە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە. لە ڕۆژئاوای خەلافەتی ئیسلامیدا ئەمازیغەکان شوێنیان کەوتن و بوونە ئیمامیان و چەندین دەوڵەتیشیان دروستکرد.

بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بەزۆری تێکەڵی ناوچە کوردییەکان بوون. ئەوکات کوردستان بریتی بوو لەچەند هەرێمێکی گرنک و گەورەی جیهانی ئیسلامی، تەواوی هەرێمی چیاکان لەژێر فەرمانبەرداری خەلافەتی ئیسلامی و ئومەوی و عەباسییەکاندا بوون. هەرێمی چیاکان، مەبەست لێی چیاکانی زاگرۆس بوو، کوردستان کە بە عێراقی عەجەمیش ناوبراوە، لە ڕۆژهەڵاتییەوە بیابانی مرنجاب دیاری دەکرێت، لە باشوورییەوە هەرێمی فارس و خوزستان و لە باشووری ڕۆژئاواشەوە عێراق دەستپێدەکات. هاوکات هەرێمی ئازربایجانیش لە باکووری خۆرئاوایدایە، لە باشوورەوە عێراق و لە باشووری ڕۆژهەلاتییەوە

---

https://demokratikmodernite.org/kurt-ulusal-birliginde-ozgur-kadin-hareketinin-rolu/

هەرێمی ئازەربایجان و چیای سەرکەشی ئەلبورزیش لە باکووریدایە. کوردستان لە هەرێمە سەرەکییەکانی شارەزوور، دەینەوەر، قرمسین، جەزیرە و ئازربایجان و ئاران و خوراسان و ئەهواز و ... هتد پێکهاتبوو، کە لە سەرچاوەکاندا بە مەملەکەتی میدیای دێرینیش ئاماژەی پێکراوە.

قورئان وەک بنەمای پەیوەندی کورد و خەواریج پەیوەندی کورد و خەواریج لەسەر بنەمای بابەتێکی گرنگە و گەواهییەکی گەورەی وابەستەبوونی کورد بووە بە بیروباوەڕی ئیسلامییەوە. چونکە: قورئان قەدەری ڕاسان و ڕاپەڕینەکانی کوردی ئاڕاستە دەکرد، هەموو ئەو ئایەتانەی ئەندێشەی سیاسیی ئیسلامییان ئەختستە بواری جێبەجێکردنەوە لە تیۆری فەرمانڕەوایی، شورا، ڕاپەڕین دژ بەستەم، ئازادی و ملنەدان بۆ کۆیلایەتی، قۆرخنەکردنی ماڵ و سامان، هاوبەشێتی لە داهات و موڵکی میللەت، مەودای مەیدانخوازیی ژنان بۆ ئازادیی، تێکڕا تیۆری هەڵهێنجراوی نێو ئەندێشەی سیاسی ئیسلامیی بوون، کورد و ڕاپەڕینەکانی ڕەهەندێکی ڕیفۆرمخوازانەی گەڕانەوەیان پێبووە بۆ بابەتە ئیسلامییەکان. تەنانەت خەواریجەکانی ناو کورد بەهۆی کوردەوە وابەستە بوونەوە بە ئیسلام و قورئانەوە، لایان نەدا و یەک جوڵانەوەی کوردی نییە لە پێنج سەدەدا سیمای لادان لە ئیسلامەتی پێوە دیار بێت.

کورد و هێزی بەرهەڵستکاری دەسەڵاتی سیاسیی دەیانەویست دوورکەوتنەوە لە بنەما ئەخلاقییەکان، ژیانی حەرەمسەرا و کۆشک و کەنیزەک، سیاسەت و کوشتوبڕی نێوان براکان و قەلاچۆکردنی ئالوبەیت، تێکڕا لە تیۆری ئیسلامەتیدا دابڕن، بەڵکو ئیسلام ئەندێشە، عیرفان، خاوێنی، ئەخلاق و زووهدە، مافی ژن، بۆیە لە وتارەکانی سەعیدی مەجدەلدا بە ئاشکرا گرێبەستی گەورەی گەڕانەوەی خەڵکی بۆ ناو ئیسلام و ئایینداریی، دروست لە کۆدە قورئانییەکەوە بوو. خەواریجەکان کاتێک هاتنە ناو کورد، بەجارێک بیروباوەڕیان لە ئیسلامێکی فیقهییەوە بوویە ئیسلامێکی عیرفانی، ئەمەش ئەدەبیاتێک بوو نەدەشارایەوە، هەرئەوەش دواتر بوویە بابەتێک کە کاریان لەسەر کرد، تەنها ساڵێک عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی گرتەوە، ئەو لەگەڵ کورد و خەواریجدا کۆک بوو، هەمان تێزی لە تێڕامان بۆ قورئان هەبوو. بەدرێژایی حوکمی ئومەویی و عەباسی یەک جوڵانەوەی کوردی ڕووی نەدا کە کوردەکان داوایی جیابوونەوە لە خەلافەتی ئیسلامی بکەن، بەڵکو داوای ڕیفۆرم و گۆڕانکاری و لابردنی ستەمکار و چەسپاندنی چوارچێوەیەکی ئیسلامی بووە.

لە ئێراندا و لەناو فارس و تورکدا جوڵانەوەی لادینی و گەڕانەوە بۆ ئاینی پێشوو لە بەرمەکییەکانەوە بوونی هەبووە، بەڵام لەناو کورددا یەک جوڵانەوەی دەرەوەی ئیسلام ئاماژەی پێنەکراوە و نەبووە. هەموو ئەو خەواریجانەی هاتوونەتە کوردستان، تەنها بەدروشمی ئیسلامی و یەکسانیخوازی شوێنیانبووەتەوە و سوپای سەد هەزار کەسییان لە کورد پێکهێناوە کە ئەمیرەکەیان خۆی وەک ئەمیری موسڵمانان ناساندووە.

بانگەوازی خەواریجەکان لە سۆنگەی بیری یەکسانیخوازییەوە کە عەبدێکی حەبەشیش بۆی هەیە ببێتە ئەمیر مادام موسڵمانە. لە سەردەمی زاڵبوونی داگیرکاری نەریتی تورکیشدا بۆ جیهانی ئیسلامی کە مەغۆلەکان نومایانی نۆرەی تورکەکان بوون و عوسمانییەکان هاتنە سەر بەڕەی  حازریی و بوونە خاوەنماڵ ئیتر میرنشینی نیمچەسەربەخۆی خێڵەکی کوردیی دروستبوون٢.

سەرەڕای گوشاری میرنشینە نیمچە ئۆتۆنۆمەکانی کورد، ئاغا و شێخەکان، کە لە سەردەمی عوسمانیدا نەیانهێشت لەژێر چەترێکی چارەنوسسازیی نەتەوەیی پێکەوە کۆببنەوە، ئەو ژنە خۆڕاگرانەی کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە سەریانهەڵدا، بەوپێیە بەڵگەنامەی نووسراو لەبارەی ژنانی کورد کەمن و ئەو سەرچاوانەی باسیان دەکەن بەگشتی لەسەر بنەمای بیرەوەریی و سەفەرنامە و لە ڕوانگەی پیاوانەوە نووسراون. پراکتیزە تایبەتەکانی کۆلۆنیالیزم لە کوردستاندا نەک هەر پێکهاتەی عەشایەری و بنەماڵەیی کردووەتە کلیل و کۆدی کولتوورەکەی، بەڵکو لە بەها نەتەوەیی و مەعنەوییەکانیشدا دووری خستوونەتەوە.

دوای دابەشکردن و داگیرکردنی کوردستان تێگەیشتنە سەرەتاییە ناسیۆنالیستەکان بنەمای ئایدیۆلۆژیی و فەلسەفەیەکی دروستیان نەبوو.

ڕێکەوت نییە کە ئامرازە سەرەکییەکانی ئاسمیلەکردن لە کەرتکردنی کوردستاندا بریتییە لە دامەزراوەکانی بنەماڵە، پەروەردە، ئایین و یاسا. هەر لەبەر ئەم هۆکارە، بنەماڵە ڕۆڵی دەزگایەک دەگێڕێت کە کاردانەوەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی، کولتووریی و ئابووری زۆر مەترسیدار لە کوردستاندا بەردەوام دەکات٣.

---

٢ ماجد خەلیل: کورد لە گەمەی خەواریج و خەلافەتدا، چاپخانەی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠١٤، ل١١١.

3Nagihan Akarsel:Kürt Ulusal Birliĝ’nde Özgür Kadın Hareketinin Rolü//https://demokratikmodernite.org/kurt-ulusal-birliginde-ozgur-kadin-hareketinin-rolu/

## تەوەرەی دووەم: شوناسی ژنی کورد لای کوردناسە ناموسڵمانەکان

کوردناسەکان زۆرترینیان بەمەبەستەوە هاتوون، ئەوانەی بەمەبەستەوە هاتوون ڕاستەوخۆ ڕوانگە زانستییەکانی کۆڵینەوە لە کۆمەڵی کورد یان ژنی کورد، بایەخە زانستییەکەیان دەداتە دوواوە، لەهەمانکاتدا نووسینەکانیان کەرەستەی گرنگی لێکۆڵینەوەن لە لۆژیکی کۆمەڵایەتی کورد، بەمەرجێک بە شیکارێکی وردی بابەتییەوە سەرچاوەکان جارێکی تر بەکاربێنەوە، هەرچەند تاوەکو ئێستا لە بەکارهێنانەوەی سەرچاوە کوردناسییەکان دەتوانین بڵێین دەستیان بۆ نەبراوە.

لەپێش سەرهەڵدانی زانستی کوردناسییەوە گەلێ کوردناس کولتووری کوردیان دواندووە. لە باسی ئەو کوردناسانەدا کە سەردانی ناوچە کوردییەکانیان کردووە و لێکۆڵینەوەیان لە سەرجەم کایەکانی ژیانی کورد کردووە و زانیاریان لەوبارەیەوە تۆمار کردووە، دەتوانین مەبەستی ئەوانە ڕوون بکەینەوە، هەر هۆکارێکیشی لە پشتەوە بووبێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کۆمەڵێک زانیاریی باشیان لەبارەی کوردەوە تۆمار کردووە، بەڵام شتێک بۆ ئێمە جێگەی پرسیارە و شیکردنەوەی نووسینەکانیان نومایانی نیازی دروست یان نادروستییانە.

کەسێکی وەکو کلودیوس ڕیچ ١٧٧٨-١٨٢١ نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە شاری بەغدا وەختێک دێتە کوردستان گەشتەکە لە سەرەتای مانگی نیساندا دەستپێدەکات، دوای ئەوەی بە هەریەک لە شاری دووزخورماتوو و کەرکوک و کفری و چەمچەماڵ تێپەڕ دەبێت لە مانگی تەمووز دەگاتە شاری سلێمانی، دیارە بەگوێرەی گەشتەکە ئەو کاتە پایتەختی میرنشینی بابان بووە و سەردەمی مەحمود پاشا بووە . پاشان ڕیچ گەشت دەکات بۆ شاری سنەی پایتەختی میرنشنی ئەردەڵان پاش مانەوەی ماوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی، هەڵبەت لەکاتی مانەوەیدا زانیاری زۆر گرنگ تۆمار دەکات، بەجۆرێک ڕۆژانە سەرجەم دیدارەکانی و ئەو شتانەی بینویەتی تۆماریان دەکات، کە دەتوانرێت وەکو سەرچاوەیەکی گرنگی مێژوویی ئەو سەردەمە سوودی لێوەربگیرێت. لێرەدا ڕیچ هاتووە نموونەی سیاسەتی دوو پایتەختی کوردی، کە دوو بازنەی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئەدەبیی جیاواز بوون وەرگرتووە، ئەوانیش سنە و سلێمانین، کە مەبەست لە میرنشینەکانی بابان و ئەردەڵانە، بۆیە بەڕوونی





دەتوانرێت دنیابینییەکەی شوێنبکرێتەوە لە بابەتە کۆمەڵایەتییەکەدا.

سەرەتا بۆئەوەی وردتر لە نیازەکانی تێبگەین، پێویستە خۆشی بناسین، دیارە ڕیچ لە ساڵی ١٧٨٧ لە فەڕەنسا لەدایکبووە. هەر لە منداڵییەوە گواستراوەتەوە بۆ ئینگلتەرا، سەرەتای منداڵی لەژێر سێبەری دایک و باوکیدا بەسەربردووە. لە تەمەنی ١١ ساڵی فێری زمانی عەرەبی دەبێت، هەروەها شارەزایی لە زمانەکانی (عیبری، کلدانی فەڕەنسی، فارسی، تورکی)دا هەبووە. هەر لە سەرەتاوە خولیای ئەوەبووە توێژینەوە لەسەر خۆرهەڵات بکات. دیارە خولیایەکی وا بەدەرنییە لە بەرنامەیەکی ورد و سیاسەتێکی وردتر، بۆیە بەرلەوەی سەفەربۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بکات چەندین وڵاتی تری کردووە، وەک (هیند، لە ساڵی ١٨٠٤دا، پاشان بەرەو میسر بەڕێکەوتووە، کە مەبەستەکەی بۆ باشتربوونی زمانی عەرەبی بووە، پاشان سەفەر بۆ ئیتاڵیا دەکات و لەوێ دەمێنێتەوە، بۆ ماوەیەک دەستدەکات بە خوێندنی مۆسیقا، پاشان دەچێتە ئەستەنبوڵ. بەگشتی لەو ماوەیەدا چەندین سەفەری گرنگی بۆ ئاسیا کردووە. هەروەها ناوچەکانی فەڵەستین و سوریای بەسەرکردوونەتەوە. لە ساڵی ١٨٠٨دا ڕوودەکاتە بەغدا، دواین سەردانەکانیشی لە ساڵی ١٨٢٠ گەشتێکە بۆ کوردستان. تاوەکو لە ساڵی ١٨٢١ کۆچی دوایی کردووە.

بەشی زۆری گەشتەکەی ڕیچ بۆ میرنیشینی بابان و پایتەختەکەیان (سلێمانی) بەتایبەتی و میرنیشنی ئەردەڵان و پایتەختەکەیان (سنە) بەگشتی بووە. بەڵام بەگشتی باسی تێکڕایی کوردستان و دراوسێکان و لایەنی ئیداریی و سیاسی و بازرگانی و ئابووری و ئەنتۆگرافی کردووە، ئەو کاتەی لەم ناوچەیە بووە بەوردی و وردەکارییەوە زانیاری و بینین و بیستنەکانی خۆی تۆمارکردووە لە شێوەی یاداشتێکی ڕۆژانەی خۆی بەناوی (گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠). هەروەک خۆی دەڵێت یەکەمین ئەورووپیە سەردانی ناوچە کوردییەکانی کردبێت و بەو تێر و تەسەلییەوە لە هەموو ڕوویەکەوە باسی تێکڕای ناوچە کوردییەکان و دەسەڵاتە کوردییەکان و لایەنی ئابووریی و سیاسی و کۆمەڵایەتیانی کردبێت[٤].

هەڵبەتە وانییە، پێش ئەویش ئەورووپییەکان هاتوون و بە وردیش توانیویانە تامی تێڕامانی سروشتی کۆمەڵایەتی کورد بکەن. هەرچۆنێک بێت ڕیچ بە یەکێک

---

٤ کلۆدیوس جیمس ڕیچ: گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و. محەمەد حەمەباقی، چ ٤، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٢، بەشی دەیەم، ل٤٤-٨٨.

له سەرچاوە گرنگەکانی کوردناسی دادەنرێت، دەتواندرێت پشتی پێ ببەسترێت بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخ و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە. ئەوەی جێگەی وردبوونەوەی ئێمەیە ڕیچ زۆر بە ڕەهایی تایبەتمەندی ژنی کورد وابەستە دەکات بە جیاوازییەکەوە کە لە ژنی دیکەدا نەبووە، جیاوازییەکەیش دروست دیاری ناکات، تەنها لەو سۆنگەیەوە باسی دەکات کە جۆرێک لە تێکەڵی لە نێوان نێر و مێدا هەبووە و بەس، بۆیە بۆخۆم بەوردی سەرنجمداوەتە نووسینەکانی ڕیچ بەتایبەتی ئەو نووسینانەی کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی ژنانی عەرەب و ئێرانی و تورک دیاری دەکات، بەهیچ جۆرێک ڕەفتاریکی وا باس ناکات کە تویژەرێک وەک دیوێکی پێشکەوتن یان پێگەیەکی ژنی کورد باسی بکات. ئەوە لەکاتێکدایە کە ژنی کورد لەو قۆناغەدا گرفتاری سیستەمێکی کۆمەڵایەتی خراپی فیوداڵی بووە.

ژنی کورد بەتایبەتی لەو پانتاییەی کە کورد تێیدا کۆچەربوون، زەحمەتکێش و بندەست بوون، جۆری بندەستیشیان پەیوەندیداربووە بەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەی کوردەوە کە ئاغاکانی کورد تێیدا سەردەست بوون، ئەو ئاغایانەی کە ڕیچ یەک ڕەخنەشی لێنەگرتوون، مرۆڤ لێرەدا پەیامە سیاسییەکەی ڕیچی بۆ دەردەکەوێت کە لە تەواوی کوردناسە ئینگلیزەکاندا ئەم پەیامە پاتە دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە دەیانەوێت سیستەمی کۆمەڵایەتی کورد بڤە بێت و ڕەخنەی لێ نەگیرێت، دەیانەوێت دیوارێک بەدەوری سیستەمی فیوداڵی کورددا بکێشن و بیپارێزن. ئەوان بەردەوام چێژ لەو چینایەتییە دەبینن کە لەنێو کورددا بوونی هەبووە و سەنای دەکەن. ئەمە وایکردووە تەواوی نووسەرانی خۆشمان بەو سەناو وەسفەی ئەوان شاگەشکە بووین بەبێ ئەوەی ڕوانگەیەکی ڕەخنەییمان بۆیان هەبێت.

ڕیچ دەڵێت: "پێم سەیر بوو کە کوردەکان وەک گەلێک لە خۆرهەڵاتدا بژین و بەوجۆرە ژنەکانیان سەربەست بن و بەبێ ڕووبەند و عەبا تێکەڵ بە پیاوان بن، لە ماڵی خۆیاندا ئەگەر میوانیشیان بهاتایە بەبێ ڕووبەند دەهاتە پێش میوان و خزمەتیان پێشکەش دەکرد". لەلایەکی ترەوە دەڵێت: "هەروەها ڕێگاش بە خزمەتکار دەدرا بچێتە ماڵەکانیان، ئەوەندەش گوێیان بە خۆداپۆشین نەدەدا، تەنانەت لەبەرچاوی بیانیش یاخود کاتێک لە ماڵەکانیشیان دەچوونە دەرەوە بۆ ناو بازاڕ و کۆڵانەکانی ناوشار تەنها سەرپۆشێکی شینیان دەکرد. هەندێ جاریش عەبا و پەچەیان دەکرد، بەڵام پەچەکەیان هەڵدەدایەوە بۆ دواوە تەنها لە هەندێ

حاڵەتدا نەبێت، وەک لە ژنانی چینی سەرەوە بوایە، یاخود تووشی یەکێک ببێت حەز نەکات بیناسێتەوە ئەوە پەچەکەی دەکرد".

تەنانەت ڕیچ باسی لەوە کردووە، کاتێک هاوسەرەکەی چووە بۆ سەردانی ناو ڕەشماڵە کوردەکان، ژنان و پیاو بەبێ جیاوازی لەوێدا دانیشتوون و ژمارەی پیاوان دوو هێندەی ژمارەی ژنان بووە. هەروەها لە کاروباری دەرەوەش یارمەتی پیاوەکانیان داوە.

ئەو یارمەتیدانەی ڕووننەکردووەتەوە کە چییە؟ بۆ نموونە ڕیچ زیاتر زەمینەی ژیانی چەند شارێک نیشان دەدات، نایەوێت ڕوونیبکاتەوە ڕەهەندی کارەکە کامەیە؟ بەڵام نەتەوەی کورد هەر ڕیچ خۆی دەڵێ:" شارەکان چەند چۆڵن، یانی هێزی کار کەمە، هەر خۆی دەڵێت چ نەتەوەیەکی کۆچەرن یانی هێزی مرۆیی کەمی کورد، وایکردووە خستنە ژێرباری ژنان بۆ ئەرکی دەرەوەش کە شوانکارەبوون یانی ئاژەڵداربوون، بەتایبەت ئەوانە ژنانیان لەژێر باری ئەرکی ماڵ و کاری دەرەوەشدا بوون. کە ئەمە گەورەترین گرفتی بندەستی و زەحمەتکیشیی ژنی کورد بووە[٥]. تەنانەت لە شیکاری کارکردنی ژنانی کورد تاوەکو سەدەی نۆزدەشدا، بەشێک بووە لەو سیستەمە کۆچەرییەی کە تاوەکو کۆتایی سەدەی بیستەمیش ئەو کۆچەرییانەی کە پێیان دەوترا دۆم، یان زنجییەکان دیارترین نەریتی باوی ناویان ئەوە بووە کە ژنان خەریکی کارن و پیاوانیش لەناو دەوارەکاندا دادەنیشن، ئەو کاروبارە لە هەندێک لە شارە مۆدێرنەکاندا وایلێهات کە ژنەکان یانی ژنی زنجییەکان بەتایبەتی لە قاهیرە و دیمەشق و ئیسلامئاباد و چەند شارێکی دیاری جیهانی ئیسلامیدا ئەم دیاردە بڵاوبوو، وەختێک کارێکی ئەوتۆیان لەدەست نەما ناچار دەستیان کرد بە دەرۆزە کردن، ئایا ئەو خەسڵەتی کارەی کە ژنی کورد کردوویەتی و ڕیچ باسی دەکات چەندە لەو نەریتە زنجییەوە نزیکە؟ ئایا کار لەلای ژنی کورد بریتیی بووە لە ئەرکێکی سەرشانی وەک مرۆڤێک کە ڕێی پێدراوە لەچوارچێوەی ئازادیدا یان نەریتێکی کۆچەرییە؟

گەر پرسەکە لەو ڕەهەندەوە بێت ئەوا زۆر بەڕوونی دەڵێین وابەستە نەبووە بە ماف و ئازادییەوە، چون ماف و ئازادی لە ئابوورییدا بەرجەستە دەبێت، ئەوەتا خاوەندارێتی زەوی تەنها پیاوان بوون، لە هیچ تاپۆیەکی سەردەمی عوسمانیدا

---

٥ کلۆدیوس جیمس ڕیچ: گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، ل ٤٤-٨٨.

نییە موڵکێکی  باخ یان کشتوکاڵی بەناوی خانمێکەوە بێت، ڕێک ئەمە جێگەی پرسیارە، یانی خاوەن زەوی لە فەلسەفەی فیوداڵیدا پیاوە. لێرەدا بندەستی بابەتی ژنبوونەکە ڕووندەکاتەوە، کە وابەستە بوون بە زەوییەوە پەیوەندیی ئاغا و جوتیارە و بەس ژنیش بوونێکی نییە، چونکە جوتیار هیچکاتێک چەمکێکی داتاشراو نەبووە کە ژنێک لەخۆبگرێت.

ڕیچ باسی خزمەتکار دەکات، یانی لە دیوەخانی زەنگین و نوبەلاکانی کورددا بووە، بۆیە بابەتی ئەو ژیانی چینی گشتی نیشان نەداوە، ژنی چینەکانی خواری خوارەوەی نەدیوە. ڕیچ زیاتری نووسیوە و دەڵێت: " ژنان زۆربەی جار لە بەیانیانی هاویندا لەسەربانی خانووە نزمەکانیانەوە بەسەر کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا دەیانڕوانی". باسکردنی ئەم دیمەنە لە سەفەرنامەکەیدا بێ هۆ نییە، چونکە لە ڕوانگەی ئەو دیمەنەوە هەڵسەنگاندنی بۆ ژنی کورد کردووە و دەڵێت: لە هەمووی گرنگتر سەرباری ئەو ئازادییە زۆرەی پێیاندراوە، بەڵام هیچ ژنێکی گەلانی تر هێندەی ژنی کورد هێندە بە ڕەوشت نین، ئەمانە لە شکۆ و سەربەرزییەوە زۆر لە تورک و فارس و عەرەب و گەلانی تر لە سەرەوەن و بەرزترن.

هەروەها باسی هەندیک بۆنە و ئەتواری ژنی کوردی کردووە، لەوانە  لای ژنی کورد هەڵپەڕکێ خولیایەکی گەورەیە، چونکە زۆربەی جار بەبێ پێ وتن و بانگهێشتنامە خۆیان دەچوون  بۆ ئاهەنگەکان و لەگەڵ خۆشیاندا دیاری بچووکیان بۆ بووک دەبرد. ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆری پیاوی لێ بوو، زیاد لەوەی لە شەقامەکانی سلێمانی دەبیندرا. دەڵێ ئەوەی بە لامەوە نامۆ بوو لە ئاهەنگەکەدا ژنان بەبێ ڕووبەند و پەچە و عەبا بوون، هەروەک زۆر جوان خۆیان گۆڕی بوو و گوڵنکە و خشڵیان بە خۆیانەوە کردبوو و کراسی ئاوریشمی ئاڵ و واڵایان لە بەردا بوو، کە بەوپەڕی جوانی و ئارایشتەوە خۆیان ڕازاندبوویەوە.

لەڕاستیدا ڕیچ لە وەسفی ئەو دیمەنەدا دەڵێت زۆر دیمەنێکی ڕەنگین و سەرنج ڕاکێش بوو.  ڕیچ بۆخۆی ئەوە ڕووندەکاتەوە کە گوایا نامۆ بووە ژن لە خۆرهەڵاتدا بەو جۆرە دەربکەوێت، وەک خۆی ئاماژەی پێکردووە لەو ساتەوەی هاتووەتە خۆرهەڵات ژنی نەدیوە بەوشێوەیە ئازاد بێت، بەتایبەت لە ناوچە عەرەبییەکاندا، تەنانەت لەسەر سفرەی نانخواردنیش لەگەڵ کەسانی بێگانە ئامادە نەدەبوون و بەجیا دادەنیشتن، هەروەها لە دەرەوەی ماڵ و بازاڕەکان بە عەبا و پەچەی






ڕەشەوە دەسوڕانەوە. هەربۆیە دەڵێت پێم سەیر بوو کە کوردەکان وەک  گەلێک لە خۆرهەڵاتدا بژین و بەوجۆرە ژنەکانیان سەربەست بن و بەبێ ڕووبەند و عەبا تێکەڵ بە پیاوان ببن لە ماڵی خۆیاندا ئەگەر میوانیشیان بهاتایە بەبێ ڕووبەند دەهاتە پێش میوان و خزمەتیان پێشکەش دەکرد.

ئەم پرسیارەی ڕیچ زۆر جێگەی سەرسوڕمانە لەکاتێکدا هەم لە میسر و هەمیش لە شامدا ماوەتەوە یانی قاهیرە و دیمەشق و بەغدادی دیوە، کە بەڕاستی بۆ هەر توێژەرێک ڕوونە کە ژنان لەو شارانەدا تاڕادەیەکی زۆر کەڵکیان لە ئازادیی و ئەوەی ڕیچ بە ئازادی باسی دەکات شوێنیان هەبووە، زۆرێک لەو ئازادییانەش ئەحمەد ئەمین باسی کردوون و زۆر بەئاشکرا ئەوەی داوەتە دوواوە٦، کە ڕیچ بۆچی وەها ژنی کوردی لە بوونی ئەو ئازادییە سەیرەدا شوێنکردووەتەوە لەکاتێکدا بەوجۆرە نەبووە کە ئەوی ئەبڵەق کردووە، چونکە ڕەهەندەکانی ئەو ژیانی خانەدانییە کە ڕیچ تێکەڵی بووە لە سلێمانی و سنەدا زۆر ڕوونە لەو دراوسێیانەوە گواستراوەتەوە کە ئەو وادەزانیت بوونی ئازادی لەناویاندا ونبووە.

هەروەها ڕێگاش بە خزمەتکار دەدرا بچێتە ماڵەکانیان، ئەوەندەش گوێیان بە خۆداپۆشین نەدەدا، تەنانەت لە بەرچاوی بیانیش یاخود کاتێک لە ماڵەکانیشیان دەچوونە دەرەوە بۆ ناو بازاڕ و کۆڵانەکانی ناوشار تەنها سەرپۆشێکی شینیان دەکرد. هەندێ جاریش عەبا و پەچەیان دەکرد، بەڵام پەچەکەیان هەڵدەدایەوە بۆ دواوە تەنها لە هەندێ حاڵەتدا نابێت، وەک لە  ژنانی چینی سەرەوە بوایە، یاخود تووشی یەکێک ببێت حەز نەکات بیناسێتەوە ئەوە پەچەکەی دەکرد. ئەوەی جێگەی پرسیارە کە خودی ڤلادمیر فیۆدۆرڤیچ مینۆرسکیش بەهەمان شێوەی ڕیچ کە  کوردناسی ڕووسییە و ساڵی ١٩٠٩ سەردانی باشووری کوردستانی کردووە،  یانی جیاوازییەکەیان نزیکەی سەدەیەک بووە، ئەویش چووەتە هەڵەبجە کە کاریگەری هەردوو سلێمانی و سنەی لەسەر بووە، یانی بووەتە میوانی خاتوو عادیلە خانم کە لە هەردوو سەرەوە بەهۆی ئەردەڵانی و ساحیبقڕانییەکانەوە کاریگەرییەکان لەسەری دروستبوون، مینۆرسکی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت:

---

6 Majid Khaleel Fattah: Comparison of Kurdish Jews and Kurdish Ethnic Communities in the View of Kurdologists, International Conference: Kurdistan in the Western and Eastern Research Tradition, Institute for Oriental Studies, University of Jagiellonia, Krakow, Poland, 24-26 /10/2016.

”خاتوو عادیله ژنێکی نموونه، تێگەیشتوو و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بووە. تاوەکو ئێرە دروستە، بەڵام بوونی ئەو ژنە وەک ڕچەشکاندنێکی تایبەتی ناو کولتووری کۆمەڵایەتی کە دووبارەی نەبێت بابەتیکی ئاساییە، یانی ژیان عادیلە نەریتی ژنان نەبووە، بەڵکو حاڵەتیکی دابڕاوی ناو ژیانی ژنانی کورد بووە، لێرەشدا مینۆرسکی باسی عادیلە دەکات نەک باسی ژنی کورد.

ئەوەتا ئەدمۆندز، ئەفسەری سوپای بەریتانیا لە باشووری کوردستان، سەبارەت بە خاتوو عادیلە گوتوویەتی: ”هەموو دەسەڵاتی عوسمان پاشا دوای مردنی کەوتە دەستی هاوسەرەکەی، کە لە ڕاستیدا شاژنی بێ تاجی شارزوور بوو“. بەهەمان شێوە ئەوەش باسی عادیلەیە نەک بابەتی کۆمەڵناسییانەی ژنی کورد.

بەڵام ئەوە ناکاتە ئەوەی کە ئەوانیش نەکەوتوونەتە ناو ئەو مەبەستەی کە ڕێچی تێکەتبوو، ئەوەتا مینۆرسکی باس لەوە دەکات کە کورد لەنێو گەلانی ئیسلامیدا ئازادانەتر هەڵوێستی بەرامبەر بە ژنان نیشانداوە. گومان لەوەدا نییە کە هەموو کارە سەختەکانی ناوماڵ لەلایەن ژنانەوە ئەنجام دەدرێن، ئاژەڵەکان دەدۆشن و پاکوخاوێنیان ڕادەگرن، ژنان دەبنە شەنگەبێری و چی و چی تەنها ژنانی سەرۆک عەشیرەتەکان (کە پێیان دەوترێت خانم بۆ جیاکردنەوەیان لە ژنانی ئاسایی توانای پاراستنی جوانی خۆیان هەیە، چونکە ژیانێکی ئاسوودە و خۆشگوزەران دەژین و هیچ کارێکی قورس ئەنجام نادەن. ژنانی کورد هەر چین و تەمەنێکیان بێت، لە ئەسپسواریدا شارەزان و تەنانەت تەحەدای پیاوانیش لە ئەسپسواریدا دەکەن، هەروەها لە سەرکەوتن بەسەر شاخەکاندا ناترسن و لێهاتووییەکی زۆر لەو کارەدا نیشان دەدەن، وەک پێشتر گوتمان ژنانی کورد پەچە لەسەر دەموچاویان ناکەن، هەروەها تێکەڵ بە پیاوان دەبن، کاتێک کۆبوونەوەکان ئەنجام دەدرێن، ئەوان قسەیان هەیە کە پیاوەکانیان گوێیان لێدەگرن. ئەو تایبەتمەندییانە ئێستەیشی لەگەڵ بێت نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە، کەوایە هەمو ئەو وەسف و سەنایە ڕێگریین لە بەردەم گوتاریی ڕەخنەی لە ڕابردووی ئازادییەکانی ژنی کورد کە وەک دەبینین تاوەکو ئێستا دەستیان بۆ نەبراوە. بەتایبەتی کاتیک کە مێجەرسۆن دەڵێت: لە زۆر گوندا ژنی ماڵەوە لە غیابی مێردەکەیدا پێشوازیی لێدەکردم و بە خۆشییەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم، بەبێ شەرم و حەیا و لاوازی دەستکردی ژنانی تورک و فارس، تەنانەت هەندێکجار لەگەڵمدا نانیان دەخوارد، کاتێک مێردەکەی دەگەڕایەوە، میوانەکەی بە

تەنها جێنەدەهێشت، جەختی لەسەر خەمخۆرییەکەی دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەدا تا مێردەکە دوای دابەزینی لە ئەسپەکەی و بەستنەوەی بە ئەشکەوتەکەوە دەچێتە ناو ماڵەوە" دابونەریتی کورد نییە ئازادی ژن سنووردار بکات، چونکە لەشفرۆشی لەناو کورددا نییە، بەڕاستی زۆرێک لەو خراپەکارییانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا بەربڵاون، لەناو کورددا نەناسراون، ئاشنابوونی نێوان کوڕان و کچان بە باشی ڕوودەدەن. بەزۆری پێش هاوسەرگیری خۆشەویستی یەکتر لە نێوان کوڕ و کچدا هەیە، چونکە هەستی ڕۆمانسی کۆنترۆڵی بەرفراوانی بەسەر دڵی کورددا هەیە.

گومانی تێدا نییە کە ژنی کورد خاوەنی کەسایەتییەکی دیارە. بۆیە پێمان سەیر نییە ئەگەر لەنێو دایکان کەسێک بدۆزنەوە کە ناوی منداڵەکەی بۆ ناوەکەی زیاد کرابێت، چونکە بە جوانی یان بە زیرەکی ناوبانگی دەرکردووە، لەم باەروە نمونەش زۆرن ... دەتوانین ناوی زۆرێک لە ژنەکان بهێنین" کە سەرکردایەتی هەندێک لەو خێڵانەیان دەکرد کە بەتەواوی ملکەچی ئەوان بوون، بۆ نموونە کاتێک تورکەکان ناوچەی هەکارییان داگیرکرد، ژنێک حوکمڕانی دەکرد٧.

تێکڕای ئەو تایبەتمەندییانە دیسانەوە جێگەی پرسیارن، پێمان وانییە لە دەسپێکی سەدەی بیستەمدا ژنان لەڕووی بڕیار، خۆشەویستی و هەڵبژاردنی هاوسەر، مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بیانی، ئیشوکار و حوکمڕانی بێکێشە بووبن، تەنانەت ئەوانە پرسگەلی جەوهەری جوڵانەوەی ژنانن نە لەیاسادا ڕێگەیان بووەتەوە نە لە نەریتدا، بۆیە تیکڕای ئەو تایبەتمەندییانە لەچوارچێوەی بەرنامەی ئینگلیزدا دەیانبینین بۆ هێشتنەوەی ڕەهەندە خێڵەکییەکان و بابەت فیوداڵییەکان تاوەکو هێزێکی گۆڕانکاری دروست نەبیت و دۆخی کۆمەڵایەتی کورد هۆشیار بێتەوە. ئەگەرنا نابێت ئەم دەربڕینە جێگەی گرفتی گەورە نەبێت کاتێک دەڵێت: "کۆمەڵگەی کوردی سەرکردایەتی ژنان قبوڵ دەکات و هیچ گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی وەها نییە سەبارەت بەوەی کاتێک ژنان بە پاساوی نەریت بدرێنە دواوە". زۆر بەئاشکرا ئێستەشی لەگەڵدا بێت یاسا مۆدێرنەکان بە کۆتاوە هێشتا ناتوانن دانەدواوەی ژن نەکەنە پرسێکی گرنگ.

لێرەدا بەدەر لە ئینگلیزەکان و فەڕەنسییەکان، ڕووی ڕاستەقینەی ئەو پرسە هەڵدەماڵن ئەوان ڕاستگۆیانە نەریتە کوردییەکە لە بواری سەرکردایەتی ژناندا نیشاند

---

٧ باسیل نیکیتین : کورد، لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵناسی و مێژوویی ، ل١٢٠-٢٠٠.

دەدەن، ئەوەتا لە باسی ئاستی سەرکردایەتی مێیینە لە کۆمەڵگەی کوردیدا تۆماس بوا باسی دەکات: ئەو ژنەی سەرکردایەتی هۆزەکەی دەکات لە بەرەکانی جەنگدا کاتێک هاوسەرەکەی دەمرێت، بابەتێکی پەسەندکراوە. ڕێک مەرجەکە دیاری دەکات، کە وابەستەیە بە دۆخیکی نەخوازراوی تایبەتەوە نەک جوڵانەوە کۆمەڵایەتییەکە ڕێگە بە سەرکردایەتی ژنی کورد بدات. تۆماس بوا پرسی ئازادی ژنان و دەرفەتی سەرکردایەتیکردن وەک پرسێکی دەروونناسی ڕووندەکاتەوە- کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ خۆشەویستی مێردەکەی. ئەمەش ڕەخساندنی دەرفەتی ژیانی هاوبەشە.

لێرەدا سۆن دیسانەوە تێدەکەوێت و مەبەستەکەی خۆی و ئێمەش ڕوونتر دەکاتەوە، بەتایبەتی کاتێک ئاماژە بۆ بابەتێکی گرنگی ڕاستەقینە دەکات، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: ”زۆرێک لە هاوسەرگیرییەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە ئەنجامی (خۆشەویستی)یەوە هاتوون، ئەم هاوسۆزییە ڕاستەقینەیەی نێوان ژن و مێرد، وەک سۆن باسی دەکات، لەنێو گەلانی ئیسلامیدا دەگمەنە“. زۆر ڕوونە کە سۆن مەبەستی خۆشەویستی لەپای چیدا زەق دەکاتەوە، ڕوونیشە بۆچی کۆمەڵی ئیسلامی دەباتە دەرەوەی خۆشەویستی، ئایا بەڕاست کۆمەڵگەی ئیسلامی نازانیت خۆشەویستی چییە و ژنی کورد بەئازادانە زانیویەتی خۆشەویستی چییە؟ ئایا پێکهاتەی ڕۆحی کۆمەڵی کوردیش پێکهاتەیەکی ئایینی نەبووە کە ئیسلام تێیدا باڵادەستە؟ ئایا بەڕاست دروستکردنی خێزان لە کۆمەڵی کوردیدا ئێستەشی لەگەڵ بێت نەک سەدەیەک پێش ئێستا پەیوەندی بە خۆشەویستییەوە هەیە یان تەنها ئیلتیزاماتێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییە و پرسی خۆشەویستی لە بەردەم ئیشکالیاتێکی گەورەیە و پێویستە چارەسەر بکرێت، بەڵام گەر باسی بەهای ئەخلاقی بکردایە ئەوا لە بەرزی بەهای ئەخلاقیدا ئەوەی لە شەرەف و ناموس کورتکراوەتەوە، کۆمەڵگەی کوردی شاسوارێکی دیاری ناو گەلانی ئیسلامین.

لێرەدا تۆماس بوا کە قەشەیەکی فەرەنسیشە و تاوەکو پەنجاو شەستەکانیش و بۆماوەیەکی زۆریش لە موسڵ ژیانی بەسەر برد، ڕاستگۆیانەتر ژنی کوردی ناسیوە. بەپێی تۆماس بوا کچێکی کورد ڕێگەی پێدراوە هاوسەرگیری ڕەتبکاتەوە، بەواتایەکی تر، باوک ناتوانێت کچەکەی ناچار بکات کە شوو بە کەسێک بکات.

لەڕاستیدا ئێمە ناڵێین ئەمە ڕێسایەکی ڕەهایە، بەڵام پێمانوایە ئەوە پرسێکە کە سەرنجی تۆماس بوای ڕاکێشاوە. ئەویش تێیدا تایبەتمەندییەکی جیاواز و باڵادەستی

کۆمەڵگەی کوردی بە بەراورد بەو پێکهاتانەی کە هاوسنوورن لەگەڵ کورددا. لەلایەکی ترەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ژنی کورد (ژن) دوای ئەوەی کەسێک وەک ژنی خۆی قبوڵی دەکات، واتە دەسەڵاتی بنەماڵەیی قبوڵ دەکات. هانسن باس لەوە دەکات کە ژنی کورد ئەگەر بیەوێت سەردانی خێزانەکەی بکات، ڕەزامەندی لە باوک یان دایکی هاوسەرەکەی وەردەگرێت. لە بەرامبەردا ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە ئازادی ژنی کورد لە گەلانی تری موسڵمان گەورەترە. مارک سایکسیش باس لەوە دەکات کە جوانی ژنی کورد بەڕاستی جیاوازە و ئەوەی لە هەمووی سەرسوڕهێنەرترە بەپێی بۆچوونی ئەو ئەوەیە، کە زۆرجار مرۆڤ ژنی کورد کە تەمەنی چل یان پەنجا ساڵە بە تەندروست و سەرنجڕاکێش و ناسک لە دەربڕینی سۆزەکانیان دەبینێتەوە. مارک سایکس باسی ئەوەشی کردووە کە هەرچەندە بە جیا لە پیاوان دەژی، بەڵام توانای ئەوەی هەیە چێژ لە کاتە بەتاڵەکانی وەربگرێت و سواری ئەسپ بێت و بە ئازادی بسوڕێتەوە و تەحەدای مێردەکەی بکات وەک هەر ژنێکی ئینگلیز، دەشڵێت ئەم ڕزگارییە لە بەها بەرز و توندەکانەوە هاتووە کە لەچوارچێوەی کۆمەڵێک بنەمادا دانیان پێدانراوە، هەروەها خیانەت و لادانی سێکسی و کردەوەی بەدڕەوشتی دەگمەنە لەنێو ئەم هۆزانەی کە حیجاب نازانن، ئەمەش بە قووڵی سەلمێنەری بێمانایی ئەو تیۆریانەی پەیوەستن بە مەحاڵبوونی لابردنی حیجاب لە شارەکاندا. سایکس وشەی (فرانک) بەکاردەهێنێت، دەیخاتە نێو کەوانە، سەرەڕای مانای پێچەوانەی وشەکە، بەو مانایەی کە هۆزە هاوسەرگیرییە کوردەکان بەدەست ناپاکی یان لادان لە بەهاکانی هاوسەرگیری یان هەر شتێکی پەیوەست بە شەرەفەوە ناناڵێنن.

باسیل نیکتین، شرۆڤە لەسەر ئازادی ژنی کورد دەکات و باس لەوە دەکات وەک کۆیلە مامەڵە لەگەڵ ژنەکانیان ناکەن، بەڵکو هەمان ئەو ئازادییەیان پێدەبەخشن کە پیاوان چێژیان لێ وەردەگرن٨. یەکێکی تر لەو کوردناسانەی لە کاتی جوڵانەوەی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا هاتووەتە کوردستان، بریتییە لە Ponafidine Pierre، ئەو لە کتێبەکەیدا (ژیان لە میسۆپۆتامیا) دەگێڕێتەوە:"

کورد بەگشتی سەرەڕای ئەوەی تالانچی و تارومارکەرن، بەڵام چەندین سیفەتی بەرزیشیان هەیە، بۆیە پەیوەست بەو سیفەتانە لە سەرووی عەرەبەوە

---

٨ د.بدرخان السندي : المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، ط١، دار ئارس لطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٢، ص١٢٠-١٢٥.

ستایشیان دەکرێت". لەشوێنێکی تردا دەڵێت:" سەرەڕای پەرشوبڵاوییان بەسەر سێ ئیمپراتۆریەتی داگیرکەردا، بەڵام پەیوەندیی نزیک لە نێوان هۆز و تیرە و بەرەبابە زۆر و زەبەندەکانیاندا پارێزراوە". یاخود دەڵێت:" بەگشتی کورد هەمیشە هۆزگەلێکی بێ یاسا و نەزم و شەڕانگێزن، ئەم خەڵکە هەڕەشەیەکی بەردەوامیشن بۆ سەر دەوروبەر و دراوسێ مەسیحییەکانیان، کە نەستوورییەکان لەناوچەی شاخاوین و ئەرمەنەکانش تاڕادەیەکی زۆر تێکەڵی بەشەکوردی تورکیان". هاوکات دەڵێت:"هەستی تاڵان و بڕۆیی لەناو کورددا وابەستەیە بە هێزەوە، هێزیان هەبێت بەرچاویان سوور دەبێت. ڕێبوارێک ڕەنگە خۆی بە بەختەوەر بزانێت، مادام تەنها ڕووتکراوەتەوە و سامانەکەی زەوتکراوە، ئەی ئەگەر خۆیشی بکوژرایە چی؟ بۆیە سیفەتێکی سادەیی کوردەکان لەوەدایە هەر بە غەنیمەتی غەوارەکان خۆیان تێر دەکەن و قوربانییەکانیان قت ناکەن و دەهێڵن بە ڕووتی ڕزگاریان بێت".

**پرسی ئافرەت، ئاوێتەی ئەدەبیاتێکی مۆدێرن کراوە، بەڕادەیەک ڕاسان و ڕیفۆرم و هەر ئەدگارێکی تری ئازادی لە نەخشی نەریتە کوردییەکەی ژناندا، خۆی لە لۆژیکێکی سەردەمیانەدا دەبینێتەوە.**

زۆرجار خێڵە چەشنا و چەشنەکانی کورد لەگەڵ یەکتریدا بەشەڕدێن، هێندە هونەرێکی دووبارەیە، دەڵێی بۆ سەیران دەچن. لەگەڵ ئەوەشدا کورد گەلێکی سەربەخۆ و میواندۆستە! ئازادی خۆشدەوێت و ڕاستگۆیە لەگەڵ قسەی خۆیدا یاخود بەو نان و ئاوە دەساچێ کە هەیەتی". هاوکات لە باسی ژنانیشدا دەنووسێت:" ژنەکانیان زیاد لەو ئازادییەی کە لەناو هەموو گەلانی تری موسڵماندا هەیە ئازادییان هەیە. هەڵبەتە وەک ئەوان بە ڕووخساری ڕووت و دانەپۆشراوەوە سەریان لە ماڵ دەهێننە دەرەوە[9]. کەوایە ئەم نەزمی قسەکردنە لەسەر ژنی کورد هیچکاتێک لەگەڵ ئەو ئەتوارە خێڵەکییانەدا ناگونجێت کە نووسەر لەگەشتەکەیدا باسی دەکات.

9 PIERRE PONAFIDINE: LIFE IN THE MOSLEM EAST, Trlrclated from the Russian bjr EMMA COCHRAN PONAFIDINE, Newyork , mead and ompany, 1911, p48.

## تەوەری سێهەم: ژنی کورد لە ڕوانگەی ئەولیا چەلەبییەوە:

ئەولیا چەلەبی بەپێچەوانەی هەموو ئەوانی ترەوە جۆریکی تر وەسفی ژنانی کورد دەکات. ئەو ڕوانگەی جیاوازە بەجۆرێکیش لە سەدەی حەڤدەهەمدا حەکایەتی ژنی کورد جیاوازتر باس دەکات، یانی هەموو ئەوەی ئینگلیزێک بەدەستکەوتی ئازادی بۆ ژنی کورد باسی دەکات و گوایە لە سەدەی بیستەمدا پێیگەیشتوون و جیاوازترن لە ژنانی دەوروبەر، ئەولیا چەلەبی لە سەدەی حەڤدەهەمدا ئەو گۆڕانکارییانە بەدەستکەوت نازانێت، بەڵکو جیاوازیی و جوانی ژنی کورد وابەستەدەکات بە پرسی ترەوە، کە ڕێک پێچەوانەی ئەوەن ئینگایزەکان دەیڵێن. ئێمە لێرەدا بەگوێرەی بڕگەکان شیکار و بەراوردەکە دەکەین.

لەڕاستیدا ئەولیا چەلەبی (١٦٠٩-١٦٥٧) ناوە دروستەکەی مستەفای کوڕی عەبدوڵڵا بوو، چەمکگەلێکی چارەنوسسازی بە باڵای قۆناغە مێژووییەکەدا بۆ داتاشرا. لەو میانەدا گەڕیدەیەکی گەورە، گەواهیدەرێکی تورکی دەرباری دەسەڵاتی عوسمانی، کە وەک ژمێریارێکی ئەرتەش ئەرکە سەربازییەکەی بەجێدەهێنا، وەلێ وایلێهات وەکو ئینسایکلۆپیدیایەک ئەڵمانییەکان ئاماژە بە (کشف الظنون)ی دەکەن، ئەوەی ئامانجی ئێمەیە، سیاحەتنامەژکەیەتی، سنووری گەشتەکەی کوردستانە، لە گەمارۆی گەورە بەگلەر و خێڵ و خانەکاندا، میرزادە و مەزنەکانی مێژووی قەدەری قۆناغەکە، بەتایبەت لە دیاربەکر، مەلاتییە و ورمێ، بەتلیس، هەکاری و زاخۆ و موسڵ و جەزیرە، لە گەمارۆی تکریت و بەغداد تاوەکو مەرگی لە ئەستەمبوڵدا لە ١٦٥٧، کە تەنها ٤٨ساڵێک ژیاوە، ژانی لەدایکبوونی لاپەڕەیەکی نوێی نەریتی نووسینی مێژووی کۆمەڵایەتی، پیشە و بیناسازی، سروشت و جادووی جۆکەریی و نۆکەریی نەریتییانەی بەشێک لە ئاغا و ئیمام، پینەچی و پاشا، خان و خانم، خەڕات و خەڵوەتکێشانی کوردی تۆمارکردووە. کاروانسەراکانی مەلاتییە، ڕازابوونەوە، خانی سیلاحدار مستەفا پاشا کە متمانەی موراد پاشای بەدەستهێنابوو، دەتوانین بڵێین لەلای عوسمانییەکان عەیارە بیستوچوارێ بوو بۆ خۆی. کاروانسەراکانی مەلاتییە (١٧٠) ژوور بوون، ژوورا و ژووریشیان گومەزی گڵ و قسڵی لێ قوتکرابوویەوە و هەرکامێکیان دەرگایەکی ئاسنینی تێهەڵکێشرا. پیاوگەلێکی زیتەڵ و زبر، تووکن و تورە، تا تەمەنی هەفتاکانیش هەڵدەکشان،

هێشتا بەکار و بە دەستوبرد بوون.

کەچی ئەوەی پەیوەستە بە کوردستانەوە، دیسانەوە دەردەکەی دامێنیان دەهێنێتەوە بیر، بۆیە دەنووسێت: "چونکە کوێستانە و کوردستانە، ژنی جوانی بەشۆڕەتیان کەمە"، لەلایەکیترەوە دەنووسێت: چونکە نەتەوەی کوردن، لە دە ساڵیدا شوو دەکەن". ناوبراو ڕاشکاوانە دەنووسێت پیاوی کورد زرت و زلن، بەئیمانی وەک ئەوان دایک نەیدیوە، شەوان شەونوێژ دەکەن و بەڕۆژیش بەڕۆژوون. هەڵبەتە لەو شارە هەڵتۆقیوەی نێوەندی چوار چیای چڕ و دژوار، دەوا و دەرمانی جەڕاحی و جۆرە چارەسەرێکی دەگمەن و دانایانەی پزیشکی پێناسە دەکرێن، لە ئەڵمانیای ئەو کاتەدا براندێکی وەها وێنەیان نەبووە.. هەر دیسانەوە دڵی لای ژنانی زەنگینە و باس دەکات، کەوای شین و جزمەی زەرد. لەکاتێکدا ژن بۆی نەبووە لە ماڵێ تەکوجم بکات، کەچی لە لۆژیکە ئەدەبییەکەوە خەیاڵی خۆڕسکی مرۆڤبوون دەرهەقیان تەقیوە، ئەوەتا مەراقی مرۆڤبوونی مەلاتییەی کورد و تورکمان، شاری جوو، دییان، موسڵمان، ناوی زۆرێک لە گەڕەکە کەئیبەکانی کچانەن، ئەو گەڕەکانەی گریمان پیاسەیەکی ڕۆمانسییان پێدا کراوە، بۆنموونە، گەڕەکەکانی قەرەخان، کچان، ڕەنگین، سارا، بێستانچی، ئاراز، چەرمەک و کوچەک، تەنها تەماشای تۆنی دەربڕین و پاروی چەوری ناو دەمی ئەو گەڕەکانە بکەن، بزانن چەند هەنگاوی هێشتا نەنراویان تێدایە، بزانن چەند نامەی هێشتا نەنووسراویان تێدایە، بزانن چەند چاوی هێشتا دانەگیراویان تێدایە، کە تێکڕایان لە خەیاڵدا خەرمانەیان داوە و مانگی چواردە شەوەی ئاسمانی ساماڵی سروشتی کوردەوارییین.

ڕێک (٣٢) مزگەوتی تێدایە، کە لە (١٢) دانەیاندا وتاری هەینی دەخوێنرێت، سەیری ناوی مزگەوتەکانیش، مزگەوتی چەرمان، پستانچی، سەجان. ئیمە لێرەدا مەبەستەکەمان دیمەنەکانی شار نین، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ئەولیا چەلەبی لە شارەکانی وان و هەکاری و ئورمییە و دیاربەکردا باس لە ژنی کورد دەکات و دەڵێت: زۆرچاک و جیاوازن، چونکە نەدەچنە بازاڕ نە لەماڵ دینە دەرەوە. ئەو لە ئیمانی خۆیدا ژنی چاک ئەو ژنەیە لە ماڵ نایەتە دەرەوە و ناچێتە بازاڕ. لە بیرکردنەوەی ئەوکاتەدا دوو بژاردە لە بەردەم ژندا بووە، یان لە ماڵ بێت و کەس

نەیبینێت ئیتر چاکە، یان کە هاتە بازاڕ ئیتر چاک نییە. بۆیە چاکبوونی ژنی کورد لە وێنای چەلەبیدا لەوەی یەکەمدایە لەکاتێکدا ئەم دیدگایە پێمان دەڵێت نەخێر ژنی کورد بندەست بووە و چاک نەبووە. بۆ نموونە باس دەکات کە سوڵتان مورادی چوارەم هاتبووە دیاربەکر و ماوەیەک مابوویەوە. ئەویش لەوێ بووە و بۆمان باس دەکات، کە خەڵکی ئەوێی کورد چۆن بوون، دەڵێت: پیاوەکانیان بەدینن، نە تەنها ژنەکانیان، منداڵە کچەکانیشیان بۆیان نییە بچنە بازاڕ١٠.

لەشوێنێکی ترا باسی گەلێ دیاردەی سەیر دەکات، بەتایبەت لەناو ژنانی ئێزیدیدا کە تیکڕا بندەستیان لێ دەخوێنینەوە. بۆ نموونە باسی کوردە پرچنەکان دەکات و دەڵێت: "پرچدەهێڵنەوە، پیسوپۆخڵن، تفەنگەکانیان بە پولێ ناکڕی، بەس بەوردی نیشانە دەئەنگون. ئەوان چاوی کێچ و ئەژنۆی وشتر دەئەنگون. پشتوێنی هەریر، مێزەرەی شەدە و هەریری ڕەنگاوڕەنگ دەبەستن. کالەی یەمەنی لە پێ دەکەن. کورتەباڵا و سەرخڕ و ملکورتن، دەڵێی سەریان لە نێوان شانیانەوە هاتووەتە دەر. شانیان بەرینە، سنگی پڕ قینیانە، کەمەریان باریکە، باسک و ڕانیان ئەستوورە و ناولنگیان بەربڵاوە، ئازان بەڵام سوارچاک نین. چاویان ڕەش و خڕە، برۆیان پڕە. مووی لوت و گوێیان درێژە، قەفی سمێڵیان هێشتووەتەوە، لەشیان لەتاو مووداو وەک لەشی بزنەڕەشە وایە. زاریان تاکە کالەیەکی پێوە دەچێ. ددانیان وەکو ددانی ئەسپە. منداڵیان لە دە ساڵیدا، وەک پیاوی بیست ساڵ دەردەکەوێت. ژنیان بە ساڵێ دەزێ، پرچی ژنانیان تا سەر ئەژنۆیان درێژ دەبێتەوە. منداڵیان کە لە دایک دەبێت، شیری سەگی ڕەشی دەدەنێ. ورد و درشتیان یەکی سەگێکیان هەیە، هەرکەس بەردێ بۆ سەگێ بهاوێ، دەستبەجێ دەکوژرێ. سەگێکی ڕەش بایی دە هێسترە".

لێرەشدا دیسانەوە باس لە غیابی ژنان دەکات لەو پێکهاتەیەدا کە دیارە بە ئاسانی بۆت دەردەکەوێت ژنی کورد لەنێو پیکهاتەی موسڵماندا باشتر و پاک و خاوێنتر و پێگەشیان بەرزتر بووە لە ژنانی ئەرمەنی و دیان و ئێزیدییەکان.١١

---

١٠ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی.: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، و.سەعید ناکام، کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٩، ل٦٥-٦٤.

١١ سیاحەتنامەی ئەولیاچەلەبی: س.پ، ل٨٣-٨٤.

## ئەنجام

- ژنی کورد لە دیدی کوردناساندا بەدەر نەبووە لە مەبەست و مەرامی مێژوویی و سیاسیی خۆیان و هەر لەو ڕوانگەیەوە دەزانین، کە کوردناسێکی ئینگلیز جیاواز لە کوردناسێکی فەڕەنسی بەتایبەتی لە سەدەی بیستەمدا وێنای ژنی کوردیان کردووە.

- کوردناسە موسڵمانەکان جیاوازتر لە کوردناسی ناموسڵمان وێنای ئازادیان بۆ ژنی کورد کردووە.

- وەسف و سەنای کوردناسەکان فاکتەرێک بووە کە کورد دیدێکی ڕەخنەیی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی ژنی کورد دروست نەکات، چونکە هەر بەو دەردی وەسف و ستایشەوە تلاونەتەوە و هیچ گۆڕانکارییەک لە زەمینەی زانستی لێکۆڵینەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ژنانی کورددا دروست نەبووە.

## دیدارێکی تایبەت لەسەر کەسێتی تاکی کورد لەگەڵ

# د.محەمەد تەها حوسێن



**ئێمەی کورد  لەبەر ململانێ و غەریزەی پەیوەستبوونمان بە شوێنە لۆکاڵییەکانمانەوە، تاوەکو ئێستا چوارچێوەیەکی هزری ناسیۆنالیستیمان نییە.**

ئامادەکردنی: گۆڤاری خاڵ

**ـ لەبەر ڕۆشنایی دیدگا و قوتابخانە جیاوازە دەروونییەکاندا تاکی کورد تاکێکی جێگیرە، یان لەرزۆک، یان داڕماو؟ بەگشتی دەروونی خەڵکی ئێمە ساغە یاخود نا؟**

ـ هەڵبەتە بونیادی کەسایەتی کۆمەڵێک هۆکار، یاخود فاکتەر ڕۆڵ لە بنیاتنانی دەبینن، فاکتەری ژینگەیی واتە جوگرافی و تۆبۆگرافی، مەبەست لە تۆبۆگرافیا بەرزی و نزمی زەوییە، هەروەها فاکتۆری کۆمەڵایەتی، دوای ئەوەی کە تاکی کورد لەناو گرووپدا دەژی، نەتەوەش فیدراسیۆنێکی گەورەترە، پێکهاتووە لە کۆمەڵێک هۆز و تیرە و عەشیرەت، هەروەها هۆکاری دیکە لە پشت ئەم بابەتە هەن، ئەوانیش هۆکاری سیاسیین، واتە ئیدارەدانی ئەو فیدراسیۆنە عەشیرەتگەرییە، کە دواتر دەبێت بە فیدراسیۆنێکی نەتەوەیی، ئینجا هۆکاری ئابووری واتە: سیستەمی ئابووری ئەو کۆمەڵگەیە کە چۆن بەڕێوە دەچێت و ئەو کۆمەڵگەیە لەسەر چ جۆرە سیستەمێکی ئابووری ئیش دەکات، ئایا ئەو سیستەمە ئابوورییە فۆرموولە بووە لەچوارچێوەی سیستەمێکی ئابووری ڕێکوپێک؟!

ئەوە لەگەڵ کۆمەڵێک هۆکاری دیکە ڕۆڵ دەبینن لە دروستکردنی بونیاد بۆ کەسایەتی، ئێمەش وەکو کۆمەڵگەی کوردی، هەڵبەتە تاکی خۆمان لەسەر کاریگەریی هەموو ئەو فاکتۆرانە هێناوەتە ئارا، یاخود با بڵێین فۆرمەلە بووە، واتە داڕشتووە، کەسایەتی ئینسانی کوردی لەچوارچێوەی ئەو فاکتۆرانە و هۆکاری کولتووریش، بونیادە سایکولۆجییەکەی دادەمەزرێت.

بۆیە بە کاریگەری هەموو ئەو هۆکارانە، هەموو ئەو هۆکارانەی کە باسم کردن، ئیدی کەسایەتی ئێمە تاوەکو ئەمڕۆی هێناوە، دەکرێ بڵێین کەسایەتی تاکی ئێمە بونیادی تایبەت بەخۆی هەیە و لەژێر کاریگەری ئەو فاکتۆرانە، بە جوگرافی و تۆبۆگرافی و ئابووری و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئایینی و ڕۆشبیریشەوە، تاوەکوو ئەمڕۆی هێناوە و تاکی کورد بەم خەسڵەتانەیەوە دەناسرێتەوە. واتە خەسڵەتەکانی تاکی کوردی لە نێو خەسڵەتە گشتییەکانی نەتەوە، هەم تاکێکی جیاواز لە تاکەکانی دیکەی دنیامان نیشان دەدات و هەم گرووپێکی یەکەی نەتەوەیی جیاواز لە گرووپەکانی دیکەی دنیامان نیشان دەدات.

ئینجا بونیادی دەروونی تاکی ئێمە لەو ڕوانگەیەوە بونیادێکە زیاتر بەرەو





ئاڕاستەی سۆز و بەرخوردی پەرچەکردارییانە لەگەڵ سروشت و بەرخوردی پەرچەکردارییانە لەگەڵ ئایین و بەرخوردی پەرچەکردارییانە لەگەڵ کولتوور و لەگەڵ ئابووریی و دۆخە کۆمەڵایەتیەکەدا هێناویەتی، واتە لە جیاتی ئەوەی بیرکردنەوە بکات بە فاکتۆر و هۆکاری یەکەم لە دروستکردنی دنیا و دروستکردنی شوێنێک بۆ ژیان، زیاتر لە ڕوانگەی هەڵچوون و سۆزەکانەوە بە هەردوو دیوە ئەرێنی و نەرێنییەکەی مامەڵەی کردووە.

مەبەستم لە بەرخوردی پەرچەکردارییانەی تاکی کوردی لەگەڵ سروشت و لەگەڵ هەموو ئەو هۆکارانەی دیکەی کە باسم کردن، ئەوە بووە کە ورووژاوە لە ئەنجامی ئەو کاریگەرییانە و لە ئەنجامی ورووژانەکانیشی وەڵامێکی هەبووە بۆی، بەوپێیە کەسایەتی ئینسانی ئێمە کەسایەتییەکی هەڵچووە و سۆز زیاتر حاکمە بە سەریدا و فەرمانڕەوایی دەکات. تاوەکو ئێستا من پێموایە وەک (محەمەد تەها حوسێن)، کەسایەتیی ئینسانی کورد لەژێر کاریگەری  سروشت دەرنەچووە و هەر تاکێکی فیترییە، تەنانەت نەتەوەکەیشمان نەتەوەیەکی فیترییە، لەباری فیترەتی خۆیەوە نەیگواستۆتەوە باری تەنشیئەوییەکەی، ئەوەی پێی دەڵێن بە کۆمەڵایەتی بوون. واتە بە کۆمەڵایەتی بوونیش وەک پێناسە یانی گواستنەوەی کولتوور لە تاکێکەوە بۆ تاکێک لەچوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، واتە نەکراوە ئەو دۆخە فیترییەی نەتەوەی ئێمە، ئەو کەسایەتییە فیترییەی کە ئێمە هەمانە لەچوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی بئاخنرێ، لە چوارچێوەیەکی کولتووری بئاخێنرێ، کەڵچەڕایز بکرێت و سۆسیۆلایز بکرێت، واتە هەم بە کولتوور پەروەردە بکرێت و ببێت بە تاکێکی عەقڵانی لەباری هەڵچوونەوە بیگوازێتەوە باری عەقڵانی، بۆیە ئێمە لە کولتووری خۆماندا لە دروستکردنی کەسایەتییەکی پتەو سەرکەوتوو نەبووین، تاوەکو ئێستا کەسایەتی ئێمە کەسایەتییەکە لە هەموو ڕوویەکەوە هەڵچوونی بە سەرەوە دیارە.

ئەگەرچی هەڵچوون بە مانا سایکولۆجیکەی ڕۆژانە تاک ڕووبەڕووی دەبێتەوە، لە تاک گەورەتریش کۆمەڵگە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی کە من مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە هەمیشە دەبێت هەڵچوون بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵ و وەعیەوە. لای ئێمە هەمیشە هەڵچوونەکانن هۆش لێ دەخوڕن، هەڵچونەکانن عەقڵ لێ دەخوڕن، لە کاتێکدا دەبێ ئەم هاوکێشەیە پێچەوانە بێ، بۆیە سەرەنجام دەڵێم

تاکێک کە هەمیشە لە دۆخی هەڵچوون و باری پەرچەکرداریدا لەگەڵ دەوروبەری خۆی بیباتە سەر، هەمیشە دوو جەمسەری لێ بەدیار دەکەوێت، جەمسەرێکیان ئەوەی بە ئاڕاستەیەکی زۆر پەڕگیر هەڵچوونەکانی خۆی دەردەبڕێت و پەڕگیرانە ئەوسەر و ئەمسەر دەکات، واتە زۆر توند ئەوەندە نابات لە ڕووی کاتەوە شل دەبێتەوە و پەڕەکەی دیکە دەگرێت، لە پەڕگیری بە ئاڕاستەی ئەرێنییەوە یەکسەر وەردەگەڕێ بۆ پەڕگیری بە ئاڕاستەی نەرێنییەوە، ئەمەش لە کەسایەتی بە ڕاستی دۆخێکی ناهاوسەنگە بە دەروونڕوست ناخوێنرێتەوە.

دوای ئەوە کۆمەڵگەی ئێمە کاتێک کە لە بارێکی سیاسی ڕازی نەبووە لەگەڵ هەموو ئەو سێنتەرانەی دەسەڵاتی کە کوردیان بە سەردا دابەشکراوە، ئیدی کۆمەڵێک بژاردەی سیاسی هەستاون بە ئەنجامدانی پرۆژەیەک، ئەو پرۆژەیە لای ئەوان وا بووە پرۆژەیەکی شۆڕشگێڕانەیە و دەبێت پڕۆژەی داگیرکاری و نەفیکردنەوە و پرۆژەی ئەسیمیلاسیۆن دژی کورد، واتە تاواندنەوەی نەتەوەیی وەلاوە بنێن بەومانایەی کە شۆڕش دەبێت خاوەنی پرۆژەی بونیادنان بێت و سەنتەرەکانی دەسەڵاتیش لە دید و تێڕوانینی شورشگێڕاندا پڕۆژەی وێرانکردنی کوردیان لەبەردەستە، بۆیە پڕۆژەی بونیادنان دەبێت پڕۆژەی وێرانکردن لە بەین ببات. کاتێک کە شۆڕش سەرکەوت ئیدی تاکی کورد بەشێوەیەکی دیکە بونیاد بنرێتەوە، کۆمەڵگەی کوردی بەشێوەیەکی دیکە دروستبکرێتەوە، بەڵام ئەوە هاتە دی؟ ئەوە پرسیارە سەرەکییەکەیە من دەیکەم، نەخێر، ئەوە نەهاتە دی، بۆ؟ لەبەرئەوەی مادامەکێ شۆڕش پڕۆژەیە، کەواتە دەبێت بە عەقڵانیەت بینا بکرێت، دەبێت ستراتیجی هەبێت، لەچوارچێوەی ئەو ستراتیجە کۆمەڵێک تەکتیک و تەکنیکی جیاوازی هەبێت، دەبێت ئەو تەکنیکە پەیوەست بێ بە ڕەچاوکردنی بارودۆخە جوگرافی و تۆبۆگرافی و کولتووریی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئایینی خۆمان، ئینجا ڕەچاوکردنی هەموو ئەو فاکتۆرانەی هێزەکانی بەرانبەرمان کە پێیانوابووە دەبێت نەتەوەی کورد لەچوارچێوەی ئەواندا بتاوێتەوە و ببێت بە بەشێک لە نەتەوەی سەردەستە.

تاکی ئێمە بە هۆکاری هەموو ئەوانەی باسمکردن، بەبێ ئامادەباشییەکی عەقڵانی چووەتە ناو ئەم پڕۆژە شۆڕشگێڕانە، شۆڕشگێڕانە بە کۆ دەیڵێم، بۆ؟

لەبەرئەوەی هەرچوار پارچەی کوردستان، کوردستانی باشوور و باکوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، پڕۆژە شۆڕشگێڕییەکانیان کەموکوڕیەکی زۆری تێدا بووە، بۆیە تاوەکو ئێستا ئێمە تا ئاستێکی بەرچاو نەگەیشتووین بە ئامانجەکانی خۆمان.

هەڵبەتە ژیان پڕیەتی لە نوشوست و سەرکەوتن، من ناڵێم هەموو شۆڕشێک ئەنجامەکەی سەرکەوتنە، نەخێر، شۆڕش هەمیشە پەیامێکە دەگات بە هێزەکانی بەرانبەر بەوەی کە من لە تۆ(ستەمکار) ڕازی نیم و لە تۆ هەڵچووم، بۆیە شۆڕش دۆخێکی نەفسییە، من دەڵێم هەڵچووم (أثور ضد هذا الشيء) یانی هەڵدەچم لە دژی ئەو پڕۆژەیە، کە هەڵدەچم دەبێت ئەو هەڵچوونە لە بارێکی عەقڵیدا بێت، عەقڵ بەسەریدا زاڵ بێت، بۆئەوەی بزانم من چی دەکەم و چی ناکەم.

ئینجا کە شۆڕشی ئێمە لە پارچە جیاجیاکانی کوردستان، کە بەو هەوراز و نشێوانەدا گوزەریان کردووە، بەشێکی زۆری ئەوەی ئێمە پێمانوایە شکستە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردارنەبوونی عەقڵ بەسەر هەڵچوونەکانمان، ئەم دۆخە بە ئاشکرا پێمانەوە دیارە، تاوەکو ئێستا ئێمە لە کوردستانی  باشووریش هەر وامان بردووەتە سەر، لە درێژەی ئەو ٣٢ و ٣٣ساڵەی ئێمە تیایدا دەژین، نەمانتوانی لەو بارە فیترییە هەڵچوونانەوە بیگوازینەوە بۆ بەرە عەقڵییە هاوسەنگەکەی، تاوەکو پڕۆژەی بیناکردن زاڵ بێت بەسەر پڕۆژەی نەفیکردنەوەی تاکی ئێمە و کۆمەڵگەی ئێمە، هەتا ئێستا پڕۆژەی وێرانسازی لە دیدی من بەردەوامە، ئەوەتا ئەوەندەی پێنەچوو لە دوای ١٩٩٢ شەڕی ناوخۆی بەسەرداهات لە نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان، دوای ئەوە درێژەی کێشا و لە فۆرمی جیاجیادا هێنای تا ئەو ساتەوەختەی ئێستا ئێمە قسەی تێدا دەکەین، بە ئاشکراو بە زەقی ئەو نەیارییەی یەکتر، ئەو یەکتر قبوڵ نەکردنە، ئەو ڕەتکردنەوەی یەکترە زاڵە، ئەمەش ناچێتە چوارچێوەی نەفەسی شۆڕشگێڕانە و ناچێتە چوارچێوەی پڕۆژەی بونیادنان، ئینجا لەچوارچێوەی ئەم پڕۆژەی بونیادنانە پڕۆژەی بونیادنانی تاکی کوردی و پڕۆژەی بونیادنانی کۆمەڵگەی کوردی بە هەموو ئۆرگان و دامەزراوەکانییەوە.

– ئایا کەسایەتی مرۆڤی کوردی بونیادێکی نەخەملێوە؟

تا ئاستێکی زۆر وەڵامی ئەم پرسیارەم لەچوارچێوەی پرسیاری یەکەمدا دایەوە، بەڵێ، نەخەملێوە، بۆ؟ لەبەرئەوەی هەروەکو گوتم ئێمە کە لەدایک دەبین،

کە دێینە وجود بە ئیرادەی خۆمان نایەینە وجود، واتە بوونێکی فیتریمان دەبێت، چ وەک تاک چ وەک کۆمەڵگە، دیسانەوە دەیڵێم ئەو بوونە فیترییە، ئەرکی ئینسانە کە ئەنسەنەی بکات، یەعنی بە ئینسانبوونی بکات، بیخاتە چوارچێوەی ئینسانیبوونەوە، یەعنی تاکێکی فیتری کە بوونەوەرێکی بایۆلۆجییە لە پاڵ بەخێوکردنی ئەو تاکە و گەورەکردنی، قۆناغ بە قۆناغ لەڕووی بایۆلۆجییەوە گەورەی بکەیت، دەبێت لە بەرانبەر ئەم چەمکی بەخێوکردنە چەمکی پەروەردە کردن هەبێت، تۆ بتوانی پەروەردەی بکەیت، جا پەروەردەی سیاسیی، پەروەردەی ئایینی، پەروەردەی دابونەریت و ترادیسیۆن، پەروەردەی کۆمەڵایەتی، پەروەردەی فەرهەنگی، پەروەردە جیاجیاکانی دیکە، بۆئەوەی بیگوازینەوە بەرە ئینسانییەکە تاوەکو هۆش زاڵی سەر دۆخە فیترەتی و دۆخە جێنێتییەکە بێت، یانی بۆ ماوەییەکە بێت.

ئینجا لەبەرئەوەیە ئێمە باش بارنەهاتووین، تاوەکوو ئێستاش هەروەکو گوتم لە بڕیاری سیاسیی ئێمە هەڵچوون هەیە، سۆز هەیە، لە بڕیاری ئابووری ئێمە هەڵچوون هەیە، سۆز هەیە، لە بڕیاری ئایینی ئێمە لە مومارەسەی تقوس و سرووتە ئایینییەکانی ئێمە سۆز زاڵە، هەڵچوون زاڵە، لە مومارەسەکردنی سرووت و بۆنە ئایینییەکانماندا هەڵچوون و سۆز دیارە، لە مومارەسەکردنی بازاڕکردنی ئێمە کە دەچێتە چوارچێوەی مومارەسەی ئابووری، بەڵێ سۆز و هەڵچوون دیارە، هەر کەسە بە جۆرێک هەڵدەستێ و دادەنیشێت، هەر دووکانێک بە شکڵێک کاڵای خۆی ساغ دەکاتەوە، هەر کڕیارێک بە شکڵێک مومارەسە لەگەڵ ئەوەی دی دەکات، دۆخەکە لەچوارچێوەی یاساگەلێکدا سیستەماتیزە نەکراوە، (قس على ذلك؟) عەرەب وتەنی.

. بەرزی کارامەیی متمانە بەخۆبوون بە فاکتەری سەرەکی سەرکەوتنی هەر تاکێک دادەنرێت کە عیزەتی نەفس بناغەکەیەتی، ئایا عیزەتی نەفسی تاکی کورد لە چ ئاستێکدایە؟ هەست ناکەی تاکی ئێمە گرێی خۆبەکەمزانینی هەیە و ئەمە بناغەی کەم و کورتییەکانی دیکەیەتی؟ دەکرێت تەنها بە زیادکردنی ئاستی عیزەتی نەفس، مرۆڤی کورد وا لێبکەین ئیتر مێژووی خۆی تێپەڕێنێت و خۆی لە تەپ و تۆزی لاوازی و بێ دەسکەوتی و بێئاگایی و لەکارکەوتنی عەقڵ و مەنتقی بتەکێنێت و بە ئاسانی نەبێتە نێچیری ئەم و ئەو و بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت و

جێپەنجەیەکی لەم جیهانە فراوانەدا دیاربێت؟

- لە وەتەی مرۆڤ هەیە دەوڵەت نەبووە، لەگەڵ هاتنی مرۆڤ بۆ سەر دنیا شتێک نەبووە ناوی دەوڵەت بێت، گرنگ ئەوەیە شتێک هەبوو پێیان وتووە شوێن، واتە ئینسان کە لە دایک دەبێت دێتە شوێنێک، ئەو شوێنە ساز دەکات بۆئەوەی بیکات بە شوێنێک بۆ ژیان، ئینجا بیناکردنی شوێن هەروەکو گاستۆن باشلار دەڵێت: ئەرکێکی فترەیی و جینیتیکییە، هەموو بوونەوەرێک لەسەر گۆی زەوی جگە لە بەشەر، هەموو بوونەوەر و ژیاندارێکی دیکە شوێنی بەلاوە گرنگە و شوێنی خۆی هەیە، ئەمە بارێکی فیترییە. بەڵام ئەم شوێنە چۆن ساز دەکەیت؟ چۆن شوێن دەکەی بە حاڵەتێکی ئێستاتیکی تاوەکو تیایدا ئارامی دەروونیی بەدەست بهێنیت؟ تاوەکوو تیایدا ئارامیی ئابووری بەدەست بێت، تاوەکوو تیایدا ئارامیی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی تێدا بەدەست بهێنیت، واتە گۆڕینی ئەم شوێنە لە بارێکی فیترییەوە دیسان بۆ بارێکی ئێستاتیکی، ئەوەندە جوانی بکەی تیایدا حەساوە بێت، تیایدا حەواوە بێت، بۆیە پێ بە پێ لەگەڵ گەشەکردنی هزری ئینسان ئەو شوێنە گەشەی کردووە.

لە جوگرافیای خۆمان کە هەر هەموو شاخ و داخ و جەمالیاتێکی جوانی سروشتی تێدایە، کە بە ڕای من یەکێک لە ناوچە هەرە جوانەکانی ئەو دنیایەیە، ئینسانی کورد چاوی هەڵێناوە چاوی بە جوانی و بە شوێنە جوانەکان کەوتووە، بەڵام لەو شوێنە کۆچەر بووین، لەوێوە بۆ ئەوێ گواستوومانەتەوە، واتە تەبیعەتی حەیاتی ئێمە و سروشتی بەرخوردمان لەگەڵ جوگرافیا و شوێن ئاوا بووە، دوای ئەوەی کە دەگوازینەوە قۆناغێکی دیکە و تا ئاستێک دەمانەوێت جێگیر بین لە شوێن، ئیدی لادێ دروست دەکەین، کۆمەڵێک خەڵک لە شوێنێک نیشتەجێ دەبن، دێ دروست دەکەن، گوند دروست دەکەن، ئەوەیان قۆناغێکی نیشتەجێ بوون و گواستنەوەیە لە بارێکی کۆچەرییەوە بۆ بارێکی کشتوکاڵی، لێرەدا عەقڵ هەتا ئاستێک دێتە چالاک بوون، بەرخورد لەگەڵ شوێن دەکات بۆئەوەی بیسازانێت تاوەکو لێی جێگیر بێت، هەتا شوێنێکی ئارامی لێ دروستبکات.

لەو ساوە وردە وردە ئەو دێیانە، ئەو گرووپە ئینسانیانە لە چوارچێوەی هۆز و عەشیرەتدا یەکتر دەگرن، ئیدی دەچنە چوارچێوەی ترادیسیۆن و دابونەریتێکی عەشائیرییەوە.

بەڵام ئەوەندەی جیاوازییە تۆبۆگرافییەکان واتە (تضاریس)، بەرزی و نزمی زەوی لەیەکی جیاکردووینەتەوە، نەمانتوانیوە عەقڵ بەکاربهێنین، تاوەکو دێیەک لەمبەری شاخ لەگەڵ دێکەی ئەو دیوی شاخ لە پەیوەندیدا بن، لە پەیوەندیدا بن، بتوانین ئەو خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەی خۆمان بە گشتی بکەین، بیگوازینەوە، ئەودیو ببینین، واتە کۆمینۆکەیشن بکەین لەگەڵ ئەوانەی دیکەی دەوروبەر، بۆیە هەمیشە دابڕاو بووین، لەژێر کاریگەری دابڕانی سروشتی، واتە چیایەک توانیویەتی دوو هۆز لە یەکتر بکات، دە گوندی ئەو دیو لەگەڵ دە گوندی ئەودیو لە یەکتر جیابکاتەوە، بۆیە ئێمە نەمانتوانیوە تا ئەو ئاستە ئەکتیڤ بین، ئەو ڕێگرە جوگرافییانە یان تۆبۆگرافیانە ببڕین، لەو ڕووی کۆمەڵایەتییەوە یەکیانخەین. لەڕووی فەرهەنگییەوە هەتا ئاستێک یەکدیگیر بین، بتوانین فۆڕمێکی کولتووری بدەینە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی خۆمان.

ئەوەندە دوور بە مێژوودا نەچینە خوارێ باشە، هەر ئەوەندە بڵێین دوای ئەوەی کە دیاردەی دەوڵەت لە فۆڕمی جیا جیا دەئاخندرێ لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەچوارچێوەی ئیمپراتۆرییەکاندا بئاخندرێن، ئێمە هەمیشە لە مێژووی خۆماندا نەمانتوانیوە ئیمپراتۆریایەک دروستبکەین، نەمانتوانیوە لە فۆڕمێکی سیاسیدا خۆمان ببینینەوە، تەنها لە فۆڕمی ئەمارەت و فیدراسیۆنی چەند عەشیرەتێکی بچووک خۆمان بینیوەتەوە، کە زیاتر دروشمی گوزەران و پەیوەست بوون بە شوێنە لۆکاڵییەکەی خۆیانەوە مەبەستیان بووە، مەبەستیان ئیستراتیژێکی سیاسی نەبووە تاوەکو بچنە فۆڕمی ئیمپراتۆرییاوە لەگەڵ ئیمپراتۆرییەکانی دەوروبەری خۆیان لە کێشە و لە ململانێدا بن.

پاش ئەوەی کە دیاردەی دەوڵەت لە زەمەنی ڕۆشنگەری دوای ئەوە لە مۆدێرنیتە لە ئەوروپا دەبێ بە فۆڕمێکی سیاسی و دەوڵەت ستاتوویەکی تایبەت دەبێت، واتە دەبێ بە (حال، حالة سياسية)، ئیدی وڵاتانی ئەوروپا هەموو چوونە چوارچێوەی دەوڵەت و سنووری جوگرافی خۆیان لە یەکتر جیاکردەوە، لە جیاوازییە کولتورییەکانیانەوە بەرەو جیاوازییە جوگرافییەکان چوون، هەریەکە خۆی لەچوارچێوەیەکی جوگرافی ئاخنیوە، دەوڵەتیان ڕاگەیاند، ئینجا هەبوون لەو دەوڵەتانە تا ئەو ئاستە بەهێز بوون، وڵاتانی دیکەیان کۆلۆنیال کرد، ئەگەرچی





ئێمەش بەشێک بووین لەو کۆلۆنیالیزەکردنە خۆرئاواییە.

لە سەرەتای سەدەی بیستیش کە دەوڵەت پەرەیسەند و وڵاتانی دیکە هێواش هێواش لەچوارچێوەی هەژموون و دەسەڵاتی وڵاتانی سەرکەوتوو لە جەنگی یەکەمی جیهانی چوونە فۆرمی دەوڵەتی بە ئیستیلاح ئازادەوە، کە من پێموایە تا ئێستاش ئەو دەوڵەتانە هەر ئازاد نەبوون، هەر ناوچەی هەژموونی ئەوانن و بوون، بەڵام خراونەتە فۆرمێکی سیاسیی، لەبەرئەوەی زەمەنەکە وای دەویست، ئیدی وەکو جولانەوەی سیاسیی هێواش هێواش لەچوارچێوەی جوولانەوەی شۆڕشگێڕی کوردی پەیدا بوون. ئەو جولانەوە شۆڕشگێڕییە کوردییانە هەروەکو سەرەتا وتم نەیانتوانی لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی نەتەوەیی گەورە ئیش بکەن، چوارچێوەیەکی مەعریفیان نەبوو، سیستەمێکی بەهایی ناسیونالیستیان نەبوو، بۆیەش هەمیشە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی و قورسایی دەسەڵاتی ناوەندەکانی خۆیان.

واتە ناسیۆنالیزمی کوردی تاوەکو ساتەوەختی ئێستا ئێمەی تێدا دەژین، نەگەیشتە دوا ساتەکانی کامڵبوونی خۆی، من بە قەناعەتەوە دەیڵێم کە، کورد تاوەکو ئێستا چوارچێوەیەکی هزری ناسیۆنالیستی نەبووە، ئەوە بانگەشەکردنی ناسیۆنالیزمە بە مانا مۆدێرنەکەی، کە دیاردەیەکی خۆرئاواییە، دیاردەیەکی ئینسانی خۆرئاوایە، ئێمە پێی نەگەیشتین، لەبەر ململانێ و غەریزەی پەیوەستبوونمان بە شوێنە لۆکاڵییەکانی خۆمانەوە، بە عەشیرەت و دەسەڵاتی عەشیرەتییەوە. نەمانتوانی بگەینە ئەو ئاستەی کە لە هەموو ئەو عەشیرەت و لە هەموو ئەو لۆکاڵانەی کە هەمانە فیدراسیۆنێکی نەتەوەیی دروستبکەین، ئەو فیدراسیۆنە نەتەوەییە لە چوارچێوەیەکی جوگرافی بئاخنین، لەنێو هەموو چوارچێوە ناسیۆنالیستییەکانی دونیا شوێن و پێگەی خۆی هەبێت.

واتە بە ڕای من (محەمەد تەها حوسێن) بوونی نەتەوەیی هیچ کاتێک مەرجی بوون بە دەوڵەت نایکات بە نەتەوە، واتە تۆ کە دەوڵەتت نییە بەو مانایە نییە تۆ نەتەوە نیت، نەخێر، ئێمە ئەتنیکێکین، واتە جوگرافیای ئەتنیکیمان، جوگرافیای ڕەگەزیمان، جوگرافیای کوردیمان، بە هەموو ئەو شوێنانەدا بڵاوبووەتەوە لە دنیا کە کوردی تێدایە، واتە جوگرافیا لە موخەیەلەی تاکی ئێمەدا، جوگرافیای کوردی لە موخەیەلەی تاکی ئێمەدا، لە خەیاڵدانی تاکی ئێمەدا، هەموو ئەو شوێنانەن کە

کوردیان تێدایە، بە هەڵگرتنی هەموو ئەو سنوورانەی کە لەسەر دنیای سیاسیی، لەسەر خەریتە و نەخشەی سیاسیدا هەن. بۆیە لە ئێران نەکراوە کورد وەلاوە بنرێت و بسڕێتەوە، لە تورکیا نەکراوە پاش حەفتا ساڵ ئەسیمیلاسیۆن و سیاسەتی بە توورک کردن بتاوێتەوە، لە سووریا بە نەدانی پاسەپۆرت و بە نەدانی شەرعییەتی کوردبوونی خۆیان نەکرا بتاوێنرێنەوە، لە عێراق لەگەڵ هەموو حکومەتانە یەک بە دوای یەکانەی کە هاتن نەکرا کورد بتاوێتەوە.

کەواتە فێڵ و تەکتیکی (کورد لە خەتەردایە!!)، (کورد دەتاوێتەوە)، (کورد دەبڕێتەوە)، ئەمانە هەر هەموویان فێڵی سیاسی بوون، ئینسانە ساویلکە خەڵەتێنەکان، دیماگۆگەکان، بەکاریان هێنا، جارجارەش لەچوارچێوەی جووڵانەوەی سیاسیی ئێمەدا شۆڕشە کوردییەکان بەکاریان هێنا بۆئەوەی ئێمە زیاتر تەسخیر بکەن، بۆئەوەی بزانین خەتەرێک لە بەرانبەرمان هەیە، دەمانتاوێنەوە. بەڵێ پڕۆژەی تاواندنەوەی ئێمە لە ئارادا بووە، بەڵام سەنتەرەکانی دەسەڵات لە تاران و ئەنکەرە و دیمەشق و بەغدا، هەمیشە بەهەڵەدا چوون، هەمیشە دوای خەیاڵێکی نەهاتووە دی کەوتبوون، کە پێیانوابووە دەبێ ئەم نەتەوانەی لەگەڵ ئەوان دەژین بتاوێنەوە، ئێران بە فارس بکەن، تورکیا بە تورک بکەن، عێراق بە عەرەب بکەن و سووریاش بە عەرەب.

ئەمە چەندە لە شۆڕشەکانی خۆماندا هەڵە بووین ئەوان دە ئەوەندە، واتە سەنتەرەکانی دەسەڵات لە تاران و دیمەشق و بەغدا و ئەنکەرە، دە ئەوەندە هەڵە بوون، کە پڕۆژەی وێرانکردنی نەتەوەی ئێمەیان لە خەیاڵدانداا بوو، نەشهاتەدی و نایەتەدی تا دنیاش ماوە، بۆیە دەوڵەتبوون مەرجێکی حەتمی نییە بۆ ئەوەی ئێمە نەتاوێینەوە و ئێمە کولتووری خۆمان بپارێزین.

دایمە لە خەیاڵی ئێمەدا پێمانوابووە کوردستانێکی یەکگرتوومان هەبێت، من پێچەوانەی دەکەمەوە، دیسان دەڵێم وەک محەمەد تەها حوسێن بە شانازییەکی گەورەی دەبینم کە لە پێنج دەوڵەت لە دنیا کورد حزوری هەیە، کوا کورد لە دەوڵەتێکدا بێت؟ لە دنیادا تەنها لە شوێنێک چاوت بکەوێتە سەر شوێنێک بڵێیت تەنها لەو شوێنە کورد هەیە، کوا ئەوەی چاوت بکەوێتە سەر پێنج شوێن و بڵێی کورد لە پێنج شوێن لە سەرتاسەری دنیا حزوری هەیە.

پڕۆژەی چارەسەرکردنی کێشە کورد دەبوایە سەرەتا لە ناوەندەکانی دەسەڵات

لە تاران و ئەنکەرە و دیمەشق و بەغدا بوایە، ئەوانە ئەگەر عەقڵیان هەبووایە دەبوایە هەر چوار پێنجیان لە جیاتی ئەوەی ساڵی جارێک کۆببنەوە، وەزیرەکانی دەرەوەیان بۆئەوەی بزانن چ ڕووبەڕووبوونەوەیەک بگرنەبەر بەرانبەر بە حەرەکاتی سیاسی کوردی تاوەکو ڕێیان لێبگرن، دەبوایە کۆبنەوە بۆئەوەی ئەو کێشەیەی کە لەناو هەر چوارماندا هەیە بزانین چۆنی چارەسەر بکەین، دەبووایە بە شکڵێک چارەسەری بکەن کە من هەمیشە بەهۆی ڕیشە کوردییەکەی خۆمەوە ئاسان بگەمە ئەو دیوی ڕۆژهەڵات کە کوردستانی ئێرانە، باکوور کە تورکیایە. ئەوان لە چوارچێوەی دەستوری خۆیاندا حاڵەتێکیان بۆ من دروست کردبا کە هیچ کاتێک هەستم بە غەریبی نەکردبا، ئەوە ئەوپەڕی عەقڵانییەت دەبوو، ئەوانیشی دەخستە بارێکی دیکەی سیاسی، بارێکی دیکەی ئارامیی، ئارامی دەروونیی، ئارامی سیاسی، ئارامی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئایینی، بۆ هەر چواریان، بە درێژایی ئەو سەد ساڵەی کە ئەو چوار وڵاتە ئارامیان بەخۆیانەوە نەدیت. ئەگەر ئەو چوار وڵاتە بەیەکەوە کۆببانەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەوە پشتی ڕۆژئاوایان دەشکاند و ئەو حەزە شەیتانییەی خۆرئاوا کە هەمیشە پێیانوابووە دەبێ کێشە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبێت زیندە بە چاڵ دەبوو، واتە چارەسەرەکە دەبووە چارەسەرێکی لۆکاڵی و ئیقلیمیی، نەوەکو چارەسەرێکی عالەمی هەمیشە پێمانوابێ خۆرئاوا کێشەی ئێمە چارەسەر دەکا، یان نازانم کوێ.

ئەو کێشەی بێدەوڵەتبوونەی ئێمە ڕیشەکەی بۆ کورتبینی و تەنگ نەزەری خۆمان و لەسەرێکەوە و، لەسەرەکەی تر کورتبینی و تەنگ نەزەری سەنتەرەکانی دەسەڵات لە تاران و ئەنکەرە و دیمەشق و بەغدا بووە.

**- ڕۆژهەڵاتناسان چۆن لە تاکی کوردیان کۆڵیوەتەوە؟**

+سەردەمی ڕۆژهەڵاتناسان زەمەنێک بوو ئەو کاتە ئاستی گەشەکردنی هزریی و زانستی هەتا ئەو ئاستە بووە کەسان بنێرن بەناوی خۆرهەڵاتناس بۆ وڵاتان تاوەکو باری سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و کولتووریی تاکی ئەو ناوچەیە، کۆمەڵگەی ئەو ناوچانە بناسن بۆ پرۆژەیەکی ئایندەی خۆیان، ئەو پرۆژەیەیان زیاتر بۆ داگیرکاریی و کۆلۆنیالیزەکردنی ئەو ناوچانە بووە، کاتێک کە تۆ سایکۆلۆجیەتی تاکی هەر ناوچەیەکت زانی، سایکولوجیەتی گرووپی ئەو

ناوچانەت زانی، ئیدی ئاسانتر دەتوانی مامەڵەیان لەگەڵ بکەی، زیاتر بیانخەیتە ژێر کاریگەری خۆت، بۆیە مەبەستی ڕۆژهەڵاتناسان زیاتر لە زەمەنی خۆیدا مەبەستێکی کۆلۆنیالیزەکردن بووە نەک مەبەستی (تثاقف)، ئەوەی پێی دەگوترێ کارلێکی فەرهەنگی و کارلێکی کولتووری. بۆیە خۆرهەڵاتناسان ئەگەر ئێمە پێمانوابێ ئێستا شتێکیان لەبارەی نەتەوەکەی خۆمان زیاد پێگوتووین و خۆمان نەماننناسیبوو و ئەوان باشتر تێمانگەیشتوون، ئەوە ئێمە دەتوانین بە مانایەکی دیکەیە لێکی بدەینەوە و بڵێین بەڵێ، زۆریان هاتن هەم ئەکادیمییانە، هەم سیاسییانە ئێمەیان خوێندەوەوە، تا ئاستێک لە ئەرشیفی نەتەوەی ئێمە بە زەخیرەیەکی نەتەوەیی دەزانرێت، بەڵام مەبەستی ستراتیجیی لە پاڵ ئەمە بووە.

ڕەهەندی مێژوویی هەڵبەتە ڕۆڵی هەیە، لەبەرئەوەی مێژوو یەکسانە بە زەمەنی ڕابردوو، چونکە ئێمە لە سێ زەمەندا دەژین، ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو، ڕابردوو مێژووی ئێمەیە، چۆن ئەو مێژووەمان ساز کرد؟ چۆن ئەو مێژووەمان بەکارهێنا بۆئەوەی وەک سەرمایەیەکی خیبرەوی، سەرمایەیەکی زانیاری بەکاریبێنین بۆئەوەی لە ئێستای خۆماندا هەوڵبدەین ئایندەی پێ بینا بکەین، ئێمە مێژووی خۆمان باش نەخوێندۆتەوە و باش تۆمارمان نەکردووە، مێژووی ئێمە پڕیەتی لەوانەی باسم کرد، لەوە زیاتر نوشووستییەکان، کە بە سەرمان هاتن، بەڵام لە هەر حاڵێکدا ئەوە مێژووی ئێمەیە، ئەو مێژووە دەبێ بە کۆمەڵێک وانە بۆ ئێمە، بۆئەوەی ئایندەی خۆمانی لەسەر بینا بکەین، لە بیرکردنەوەی ئێستاماندا بەکاریان بهێنین، واتە هەمیشە ئەو سێ زەمەنە چۆن ئۆرگانیزە دەبن لەنێو یەکدا، من لە ئێستادا دەژیم، ئەوە دیاردەیەکی حەتمییە و زۆر فینۆمینۆلۆجییە، زۆر دیاردە ناسانەیە، لە ئێستادا دەژیم، بەڵام دەبێت هەمیشە ئاوڕێک لە ڕابردوو بدەمەوە بۆئەوەی بازێکیش بۆ ئایندە هەڵدەم، تاوەکو لە ئێستادا تەوزیفیکەم، یانی ئایندە و ڕابردوو بینی، هەمیشە لە خزمەتی ئێستادا دەبێت. بۆیە من دیدێکی دیکەم هەیە بۆ ڕابردوو، پێموایە ڕابردوو هەمیشە زەمەنێکە بەسەر چووە، بەڵام دەبێت سامپڵی لێوەرگرین بۆئەوەی لە پشکنینێکی فەحس ئامێزدا بتوانین کێشەکانی کەشف بکەین، تاوەکو لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئەنجامانەی لە فەحس و لە پشکنینەکان دەردەکەون، ئێمە چارەسەری بۆ دابنێین.

**– ئاییندەی بونیادی کەسێتی تاکی کوردی لە بەرانبەر گۆڕانکارییەکان چۆن دەبینی؟**

+ پێموایە هەمیشە گۆڕانکارییە جیاجیاکان کە ڕوودەدەن لە دەورووبەرمان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر کەسایەتی ئینسان هەیە، بۆیە هەموو ئەو هۆکارانەی کە دێنە ئاراوە لە ئەنجامی عەقڵی ئینسان هاتوونەتە ئارا هەمیشە لەچوارچێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییە کولتورییەکان، پەیوەندییە جیاجیاکانی دیکە ڕەنگدەدەنەوە، بەڵام ئێستا ئێمە کە لە زەمەنی تەکنیک و تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو ئەوەی پێی دەڵێن (ئینفۆڕماتیک تەکنەلۆژی) دا دەژین، بینینی سایکۆلۆجییانەی من بۆ ئەو دیاردەیە ئەوەیە کە، ئێمە بەرخوردێکی عەقلانیمان دیسان لەگەڵ ئەم دیاردەیە نییە، ئێمە نەمانزانیوە مۆبایل بەکاربێنن، نەمانزانیوە کۆمپیوتەر باش بەکاربێنین، نەمانزانیوە ویبسایت و پێگە کۆمەڵایەتییەکان بەکاربهێنین، نازانین سۆشیاڵ میدیا باش بەکاربهێنین، ئەوەش بووە بە مەترسییەک لەسەر تاکی ئێمە، لەبری ئەوەی بۆ سەرچاوە ڕەسەن و بنچینەکانی خۆمان بگەڕێینەوە زیاتر لەچوارچێوە مەعریفی وترادیسیۆنییە کلتوورییە بێگانەکان دەگەڕێین و دەیانکەین بە سەرچاوە. ئەوە سۆشیال میدیایە ڕێگامان پێ دەدا بە کلیکێک بچینە سەر سیستەمی فەرهەنگی و کولتووری فەرەنسی، بۆ کێشەیەکی خۆمان پەنا ببەین بۆ وێب سایتە بێگانەکان لەکاتێکدا ئەوان بەرهەمی فەرهەنگی خۆیانن، ئێمەش کولتوور و فەرهەنگێکی تایبەت بەخۆمان هەیە.

نەبینینی دەسەڵاتی سیاسیی، دەسەڵاتی ئاینی، دەسەڵاتی کولتووری، کۆمەڵایەتی ئێمە بۆ ئەو دیاردەیە و بۆ مەترسیی ئەو دیاردەیە، ئێمە زیاتر لە شڵەژانی کۆمەڵایەتی نزیک دەکاتەوە، متمانەی کۆمەڵایەتیمان دەخاتە مەترسییەوە، دیسانەوە ئەو شڵەژانە کۆمەڵایەتییە بۆ قۆناغێکی زۆریش بەردەوام دەبێت، پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانمان لە بارێکی شڵەژاودا دەهێڵێتەوە و ئەو شڵەژانە گشتییەش شڵەژانی دیکەی جۆراوجۆری بەدوادا دێت.

ڕەنگە لێرەو لەوێ هەتا ئێستا قسەی  زۆر لەسەر سیما و تایبەتمەندیی و خەسڵەتەکانی کەسایەتی مرۆڤی کورد کرابێ و هەندێ هۆکاریش وەکو ژینگە و جوگرافیا و مێژوو + بێ قەوارەیی و ستەم و نەهامەتییە زۆرەکانی ژیان، ئاماژەیان پێ کرابێ، کە کۆی ئەوانە و هیتریش هۆکاربووبن بۆ ڕەنگگرتن و دارشتنی کەسایەتی مرۆڤی کورد، بەهەردوو بواری ئەرێنیی و نەرێنیدا.

بێگومان دەستنیشانکردن و کۆکردنەوەی خەسڵەتەکانی کەسایەتی مرۆڤی کورد، وەک میللەتێکی ٤٠ –٥٠ ملیۆنی، کە جوگرافیایەکی سیاسی (دەوڵەتێک) کۆی نەکردوونەتەوە، کارێکی ئاسان نییە و وردیش دەردەناچێت. بۆیە ئەو کارە ئاڵۆز و هەستیارە، پێویستی بە ئەرک و ماندوبوونی دەزگا و تیمی پسپۆڕ و کەرەستەی زانستی  هەیە، ئێمەمانان دەتوانین تەنها هەندێ ڕاو بۆچوونی لەسەر بدەین و گفتوگۆی لەبارەوە بکەین.

کورد وەک نەتەوەی چوارەم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە لەگەڵ(تورک و فارس و عەرەب)دا لە ژینگە و جوگرافیایەکی هاوبەشدا دەژین، بەدڵنیاییەوە خەسڵەتی هاوبەشیان هەیە لەگەڵ ئەم نەتەوانەدا، بەڵام لەبەرئەوەی  کورد زەبری هەرسێ نەتەوەی بەرکەوتووە و نەبووە بە خاوەنی قەوارەی نەتەوەیی خۆی، ئەمە وایکردووە لە مرۆڤی کورد کە حاڵەتی دەروونیی، هەروەها هەندێ جار ڕەفتاریی(سلوکی) شی، جیاواز بێ و ببێتە هەڵگری هەندێ خەسڵەتی تایبەت بەخۆی.

لێرەدا بەڕاستی پرسێک یەکجار سەرنجی منی ڕاکێشاوە، کە ئەویش ڕەوشی ناسەقامگیریی  نیشتەجێبوونی هۆز و عەشیرەتە کوردییەکانە، کە بۆم دەرکەوتووە زۆربەی هەرەزۆریان پەرش و بڵاوو پەرتەوازەن و کەم هۆز و عەشیرەتی گەورەی کورد هەیە،  لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراوی کوردستانی گەورەدا نیشتەجێ بێت، بەڵکو هەر هۆزێک  وەکو (ئاردی ناودرک) بەسەر ڕۆژهەڵات و باشوورو باکوور و – تاڕادەیەک ڕۆژئاواش– دا دابەشبوون.

ئەمەخۆی دەرەنجامی ئەو زەبر و نەهامەتی و ڕووداوە سیاسییانەیە کە لە ئەنجامی ململانێی هێزە گەورەکاندا لەسەر خاکی کوردستان، بەسەر گەلی کورددا هاتووە.. بەتایبەت ململانێی (سەفەویی و عوسمانی)و دواتریش ڕووداو و

دەرهاویشتەکانی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی و ڕێککەوتننامەکانی سایکس بیکۆ (١٩١٦) و لۆزان (١٩٢٣)، که کوردستانیان پارچەپارچە کرد و گەلی کوردیان پەرتەوازە و نائومێد کرد.

بۆیە ئەتوانین بڵێین، کەسێتی مرۆڤی کورد، لەژێر زەبر و ستەمی دەسەڵاتەکان و پەرتەوازەیی و ناجێگیریی و زۆرجاریش ناکۆکی هۆز و عەشیرەتەکانی، هەروەها خراپ وێناکردن و پەراوێزخستنی دەوڵەتانی نەتەوە سەردەستەکان لەلایەک و دەوڵەتانی داگیرکەری زلهێزی ڕۆژئاوا لەلایەکی ترەوە، تێکشکێنراوە و تاڕادەیەکی بەرچاو، تووشی لاوازیی و دڵەڕاوکە و متمانە بەخۆنەبوون و هەڵەشەیی و ئەندازەیەکی نەخوازراویش، لە نائومێدی کراو.

سەبارەت بەوێناکردنی کەسایەتی مرۆڤی کورد، زۆر بەداخەوە، دراوسێ و هاوئاینەکانمان (فارس و تورک و عەرەب)، کە نەتەوەی سەردەستن لە وڵاتەکەماندا، زۆرجار بەشێوەیەکی خراپ و ئەفسانە ئاساو نادروست، وێنای کوردیان کردووە و ناو و ناتۆرەیان بۆ هەڵواسیوە..

ئەو سەرچاوانەش کە بەوشێوە باسی کوردیان کردووە، لانیکەم (ئێرانی و عەرەبی)ەکەی، پڕن لە قسە هەڵەج و بەڵەجەکانی نێو کتێبەکانی هەریەکە لە نووسەرە دیارەکانی وەک : -(کولليني و تووسی و مەجلیسی)و ئەوانی تردا ١,٢,٣. کە زۆریکیان بە ناهەق لەسەر زمانی (ئیمامی عەلی و حوسەین و ئەبو جەعفەری سادق وکوڕ و نەوەکانیان خوایان لێ ڕازی بێت) دەیگێڕنەوە.. هەروەها ڕیوایەتە ئەفسانەییەکانی نوسەری بەناوبانگی عەرەب (مەسعودی، شیعە مەزهەب) ٤، کە ئەویش دیسان کورد بەنەوەی جنۆکە دەداتە قەڵەم، گوایە (حەزرەتی سولەیمان) سەلامی خوای لێبێ، لەبەر ئەوهۆیە فەرمانیداوە کە ڕاویان بنێن بەرەو چیاکان (الكرد وهن في الجبال).

ئەم ڕیوایەت و باسوخواسانە، لەڕاستیدا زۆر نوێ نین و هی سەدان ساڵ پێشترن، واتە وێناکردنە خراپەکان، هی سەردەمی ناوەڕاست و کۆتایی حوکمی ئیسلامین، کە هەموو ئەو نەتەوانەی لەژێر چەتری خۆیدا کۆکردبووەوە و ئەوکاتە هێشتا ململانێ و دوژمنایەتییەکی نەتەوەیی دیار و زەقیش لە نێوان گەلانی موسڵماندا نەبووە، بەڵام داخەکەم قسە و باسەکان، لە کتێبی مەرجەع و نووسەرە

نوێ و هاوچەرخەکانی شیعەشدا، دیسان جەختی لەسەرکراوەتەوە و باسکراوە.

وابزانم تەنها دەستەواژەی(تورکی شاخاوی) برا تورکەکان، هی سەردەمی نوێیە، ئەویش دوای ئەوەی لەم ١٠٠ ساڵەی دواییدا کە دەوڵەتی نەتەوەیی-ئەتاتورکی- لە پاش جەنگی یەکەم و ڕووخاندنی خەلافەتی عوسمانی و هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سیڤەر (١٩٢٠)و جێگرتنەوەی بە پەیماننامەی لۆزان(١٩٢٣) دروستبوو و کوردی لە کاروان بەجێماویش، ئیتر لە نائومێدیدا هاتە مەیدان و داوای مافی خۆی کرد و ئەتاتورکیش بە هەموو توانای خۆی و دەوڵەتەکەی، سەرکوتی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردی کرد لەوەی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥) بۆ ئاگریداغی ئیحسان نوری پاشا (١٩٣٠) تاکو شێخ ڕەزای عەلەوی دەرسیمی (١٩٣٧- ١٩٣٨).

هەرلەم میانەدا، ڕژێمەکەی ئەتاتورک لە چوارچێوەی هەڵمەت و پڕوپاگەندەکانیدا لە دژی کورد، ناتۆرەی (کوردی شاخاوی)شی بەباڵای ئەم گەلە ڕەسەنەدا بڕی.

زۆر جار بیستومانە و دەبیستین و بگرە خۆشمان هەتا ئەندازەیەک هەستی پێ دەکەین، کە مرۆڤی کورد خەسڵەتی خۆبەکەمزانی (الشعور بالنقص)ی تێدایە.

ئەمەش بێگومان خەسڵەتێکی نەخوازراو و نەرێنییە و بەتێگەیشتنی خۆم لە قۆناغێکی مێژوویی نوێدا زیاتر سەریهەڵداوە و هۆکارەکەی بەزۆری بۆ نەبوونی قەوارە و دەوڵەت و ژێردەستەیی کورد دەگەڕێتەوە، نەوەک خەسڵەتێکی بۆماوەیی و زگماکی و ڕیشەدار (متجذر)بێ تێیدا.

دیسان بەتێگەیشتنی متەوازیعی خۆم هەر ئەم خەسڵەتەشە وایکردووە، کە هەست دەکرێ مرۆڤی کورد بەرامبەر نەتەوەکانی دیکەی دەوروبەر و خەڵکانی بێگانە بەگشتی، لێبوردە(متسامح)یان سەرکز و نەرم بێ، لەکاتێکدا کە بەرامبەر براکوردەکانی خۆی، ئەو لێبوردەییە هەست پێ ناکرێ و مێژووی کەمێک کۆن و نوێ و هاوچەرخی کورد، پڕە لە ململانێ و ناکۆکی و دووبەرەکی و براکوژیی و پێکەوە هەڵنەکردن.

با زۆر دوور نەڕۆین بۆ باسی هۆکاری ڕووخاندنی (دەوڵەتی ماد) بەدەسیسەی کورد، کە ڕەنگە ڕیوایەتەکان زۆر جێی متمانە نەبن و ساغ نەبنەوە بۆمان، با چاوێک بە مێژووی ململانێی و ناکۆکی نێوان میرنشینەکانی (ئەردەڵانی و بابانی)

و (بابانی و سۆرانی) و (سۆرانی و بادینانی) سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا بگێڕین، کە چۆن پیلانیان لە دژی یەکتر گێڕاوە و هەندێجار یەکتریان کوشت و بڕ کردووە و چۆن سوپای ئەملاو ئەولایان هێناوەتە سەریەکتری، کە بەڕاستی شەرمهێنەرە..

لە مێژووی هاوچەرخیشدا، لە ٦٠ ساڵی ڕابردووی ئەم هەرێمەی خۆشماندا – وەک نموونەیەکی زیندوو- لەسەر دەستی سیاسییە (مۆدێرن و لیبراڵ و سۆشیاڵ دیموکراتەکان)ی کورد، ئەم مێژووە چەندین جار دووبارەکرایەوە و ئێستاش بەباشی هەست بە لێکەوتە و دەرهاویشتە خراپەکانی دەکەین و مەترسیمان لە ئەگەری چەندبارە بوونەوەیان، نەڕەویووەتەوە.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە: باشە ئەگەر لێکدانەوەمان بۆ هەست و خەسڵەتی خۆبەکەمزانی و سەرکزی و نەرمیمان بەرامبەر خەڵکانی غەیرەکورد، هۆکارەکەی بۆ بێ قەوارەیی و زەبری ژێردەستەییمان بگەڕێتەوە، ئەی باشە توندوتیژیی و خۆخۆریی و ناتەبایی و زبریمان بەرامبەر یەکتری، دەبێ بۆ چ هۆکارێک بگەڕێتەوە؟! لەکاتێکدا دەبوایە ڕەوشەکە بەپێچەوانەوە بوایە و زەبر و ستەمی بەرامبەرەکان یەکمانخات و سۆز و پەیوەندیی و یەکڕیزیی نێوانمان پتەو بکات.

ڕەنگە ئەمە بۆخۆی پرسیارێکی جەوهەری بێ و تەوەرێکی گرنگ و سەربەخۆبێ و وەک نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی و دەروونی، کە دەرهاویشتەی سیاسیشی لێکەوتۆتەوە، پێویستی بە توێژینەوەی قووڵی زانستی (سایکۆلۆجیی و سۆسۆلۆجی) تایبەت هەبێت.

لەو خەسڵەتانەی دیکە، کە لە کەسایەتی مرۆڤی کورددا هەست پێدەکرێ، پەندوەرنەگرتنە لە هەڵەکانی مێژوو و لە ڕابردووی خۆی.

بەداخەوە بەپێچەوانەی فەرموودەی (لایلدغ المؤمن في جحر واحد مرتين). کورد زۆرجار ڕووداوەکانی بەسەردا چەندبارە بووەتەوە.

هەروەها بەخوێندنەوەی وردی ڕووداوەکانی مێژوو، واهەست دەکەین کە سەرکردەکانی کورد خاوەنی عەقڵی ستراتیجی نەبوون و نین و لە بڕیار و هەڵوێستەکانیاندا دووربین نین، بەڵکو کورتبین و بگرە بێ پلان و بەرنامەشن لە ژیانی سیاسییاندا.. ئەم خاڵەش لە ٣٠ ساڵی حوکمڕانی کورد لە باشووردا (هەرێمی کوردستان) بەجوانی هەست پێ دەکرێ.

وەکو تاکیش نابێ لەبیرمان بچێ، کە ئەگەر کەسایەتی (شکستخواردوو) ی کورد بەرهەم و دەرهاویشتەی بێ قەوارەیی و کارەسات و نەهامەتی و سەرکوتکردنەکانی بێ، ئەوە دەبێ بەوردی مێژوو بخوێنینەوە و دان بەو ڕاستییەدا بنێین، کە بەشی زۆری ئەو نەهامەتی و لە کاروان بەجێمانەی کورد لە ڕەوتی مرۆڤایەتی، خۆی لە خۆیدا، هۆکارەکەی هەر کورد خۆی بووە.

چونکە وەکو پێویست هەل و دەرفەتەکانی نەقۆستۆتەوە و لەگەڵ یەکتر ناکۆک بوونە و گەلی کورد کەسی کاریزمای وەهای نەبووە، کە وەکو گەلانی دەوروبەر، بتوانێت ئەوانیتر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە..بەڵکو بەگشتی سەرکردە و گەورەکانی کورد خاوەن دید و ڕوئیای هەمەلایەنە و دووربین نەبوون و ئەوەندەی بە عەقڵی خێڵەکی و ناوچەگەریی تەسک بیریان کردووەتەو ەو کاریان کردووە، ئەوەندە بە دونیابینی و عەقڵێکی فراوانی سەردەمییانە و مەدەنیانەی نەتەوەیی و نیشتمانی بیریان نەکردووەتەوە و کاریان نەکردووە. بۆیە دەبینی لە هەرکوێ کەسێک و گرووپێکی کورد (خێوەتێکی هەڵدابێ، کەپرێکی دروست کردبێ)، بەناوی میرنشینی یان هەرشتێکی دیکەوە، گرووپ و تاقمی دیکەی کورد، پێش بێگانە لێی بوون بە ملۆزم و هەوڵی تێکدانیان داوە.

بەکورتی ئەتوانین بڵێین، هۆکاری ناوخۆیی و خودی، پێش هۆکارە دەرەکی و بابەتییەکان، هەمیشە یان زۆرجار، ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لە مەرگەساتەکان و لە بەجێمانی کورد لە ڕەوتی کاروانی مرۆڤایەتی.. دیارە کۆی ئەمانەش لە خۆیاندا بەسەریەکەوە، هەتا ئەندازەیەکی دیار، ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە و هەیە لە لاوازکردنی کەسایەتی مرۆڤی کورددا.

بێگومان لێرەدا مەبەستم نیە، کە بەتەواوی ڕۆڵی هۆکاری دەرەکی و بابەتی لەسەر مەینەتییەکانی کورد و شکاندنی کەسایەتییەکەی ڕەتبکەمەوە، کە تائێستاش ڕۆڵی بەرچاوی هەیە و نکوڵی لێ ناکرێ.

وەکو مێژووی ژێردەستەیی و کاریگەریی لەسەر داڕشتنی کەسێتی تاکی کورد، شیاوی ئاماژەیە کە بەشی زۆری گەلی کورد پێش ئیسلام، لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندا بوون و ژیانیان لەوپەڕی چەوساوەیی و کولەمەرگیدا بووە - ئەگەرچی ئەوتریٰ گوایە ساسانییەکان بنەماڵەیەکی کوردبوون-

بەڵام لە سەردەمی فەتحی ئیسلامی و ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا، پێ ئەچێ کورد ئاهێکی بە بەردا هاتبێ، ئەمەش لانیکەم هەتا پێش حوکمی مەزهەبیی (سەفەوی – شیعەگەرای شا ئیسماعیل و شا عەباسی نەوەیدا لە سەدەکانی شازدە و حەڤدە)، کە کورد بەشداریێکی کارای ڕووداوەکان بووە و ڕۆڵیکی دیاری هەبووە لە شارستانییەتی ئیسلامی و لە بزاوتی زانستی و فیکریی و زانا و فەیلەسوف و سەرکردەی گەورەی هەڵخستووە..

سەفەوییەکان بەداخەوە بە پاڵنەری مەزهەبی و نەتەوەییش، چاویان نە بە(کوردبوون و نە بەسووننی) بوونی ئەم نەتەوەیەدا هەڵنەهاتووە و ١٠٠ ساڵ دوای شەڕی چاڵدێران (١٥١٤) کە کوردی تێدا پلیشایەوە، جارێکی تر لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا، غەدرێک و ستەمێکی گەورەیان لە کورد کرد و ساڵی ١٦٠٨ شا عەباس قەڵای دمدم ی خانی لەپ زێڕینی داگیرکرد و ئەو هێلانەشیان بۆ کورد بەڕەوا نەبینی.

لێرەدا جێی ئاماژەیە، کە دەگوترێ ئەوەشیان بەداخەوە، دیسان بەهۆی ناپاکی کوردێکەوە بووە. بێگومان چەندبارەبوونەوەی ئەم نەهامەتیانە بەسەریەکەوە- وەک ئاماژەماندا- کاریگەریی نەرێنی بەسەرداڕشتنی کەسێتی مرۆڤی کوردەوە بەجێهێشتووە.

زۆرێک لە مێژوونووسان پێیانوایە کە ئەو هەڵوێستە خراپانەی شیعەکان بە حوکمڕان و پیاوانی ئاینی و بەشێک لە نوسەرانیشیانەوە، تائێستاش، وەک تۆڵەیەکە لە کورد بەرامبەر بە ڕووخاندنی دەوڵەتی فاتمی شیعی لەلایەن سوڵتان سەڵاحەدینی ئەیوبییەوە.

دیارە ئەم قسەیە دەربارەی هەڵوێستی (ڕۆژئاوای مەسیحی)یش بەرامبەر کورد، هەر ڕاستە و وابزانم هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناس و نووسەرانی خۆشیان ئاماژەیان پێکردووە، کە گوایە وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر سەڵاحەدین و تێکشکاندنی خاچپەرستان، ڕۆژئاوا بەوشێوەیە مامەڵەی کوردیان کردووە..

لە سەردەمی عوسمانییەکان و قەڵەمڕەوی ئەواندا، نکۆڵی ناکرێ، کە کورد هیچ نەبێ لەبەر (سوننە)بوونیان و هەندێکیش بۆ بەکارهێنانیان لە دژی سەفەوییەکان، ڕەوشیان زۆر باشتر بووبێ و لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و

سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا - بگرە پێشتریش- کوردەکان لەژێر قەڵەمڕەوی خەلافەتی عوسمانیدا، خاوەنی چەندین میرنشینی نیمچە سەربەخۆ بوون، بەڵام داخەکەم - وەک پێشتر ئاماژەم پێدا- هەموو نەیار و ناحەزی یەکتربوون و دواجار لەبەر لاوازیی و ناکۆکی نێوان خۆیان، دەوڵەتی عوسمانی هەندێ بیانووی بۆ داتاشین و هەموویانی ڕووخاند.

دیارە ئەمانە هەموو تەوسیفی حاڵەتەکە، یاخود کێشەکە و هۆکارەکانی بوون. کە ئەو کەسێتییەی - ئەگەر شیاوبێ بڵێم - تووشی بێ هیممەتی و میزاجیەت و هەڵەشەیی و ناتەبایی و خۆبەکەمزانین کردووە.

**دراوسێ و هاوئاینەکانمان (فارس و تورک و عەرەب)، کە نەتەوەی سەردەستن لە وڵاتەکەماندا، زۆرجار بەشێوەیەکی خراپ و ئەفسانە ئاساو نادروست، وێنای کوردیان کردووە و ناو و ناتۆرەیان بۆ هەڵواسیوە.**

ڕەنگە گۆڕینی ژینگە و جوگرافیا، ئاستەم بێ، بەڵام کارکردن بۆ نەهێشتنی مەینەتی و ستەم و کارەساتەکان، گرنگە، هەروەها پرسی ژێردەستەیی و بێ قەوارەیی، قابیلی ئەوەن کاریان بۆ بکرێ، بەڵام لەم سەردەمەدا کە بەحساب سەردەمی مافی مرۆڤ و ئازادییەکان و هەڵسانەوەی گەلانی ژێردەستە و سەرکوتکراو و مافخوراوە، کەچی لە ئەنجامی ئەوەدا خراپەی زیاتر لە ٣٠ساڵی دەسەڵاتی حوکمڕانی هەرێمی کوردستان و ئەو لێکەوتە خراپانەی لێیکەوتۆتەوە، ئەوەندەی تر کەسێتی مرۆڤی کورد تووشی ڕەشبینی و نائومێدی و شکستخواردوویی بووە و بە ئەندازەیەکی بەرچاو، ئینتیمای بۆ نەتەوە و نیشتمان، بەتایبەت لەم بەشەی کوردستان- زۆر لاواز بووە ، چونکە بەڕاستی ئەزمونێکی سەرکەوتوو پێشکەش نەکرا.

ئەمڕۆ ئەگەرچی دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان، ڕۆژی تایبەتی بۆ (ئاڵا و جلی کوردی) دیاریکردووە و لە ڕۆژی جیهانی (زمانی دایک)یشدا زۆر باسی زمانی کوردی دەکرێ، بەڵام بە کردەیی خەڵکی کوردستان وەکو پێویست دەستیان بە زمانی کوردییەوە نەگرتووە، کە گەورەترین و سەرەکیترین مۆرک و ناسنامەی نەتەوەییمانە، بەڵکو خەڵکێکی زۆری ئەم هەرێمە، بەتایبەت بەرپرسە سیاسیی و حکومییەکان و دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکانی وڵات، بە خەرجی و کرێیەکی زۆر، منداڵەکانیان لە قوتابخانە ئەهلییەکان دادەنێن، کە بەزمانە بێگانەکان (ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەڕەنسی) دەخوێنن و زۆرجار شانازیشی پێوە دەکەن ! ئەمەش دیارە تاڕاددەیەک هەر پەیوەندیی بە خەسڵەتی خۆبەکەمزانینەوە هەیە و ساڵانە و بەردەوام وەکو دیاردە، لە زیادبووندایە..

ئیتر با ڕەوشی خوێندن و قوتابی و قوتابخانە کوردییەکان لە ناوچە دابڕێنراوەکان (سنووری ماددەی ١٤٠) بووەستێت، کە ئەوانیش بەردەوام لە لە پاشەکشە و کەمبونەوەدان.

ئەمڕۆ زۆرینەی مرۆڤی کورد لە هەرێمی کوردستان ئەوەندە نائومێد و نیگەرانە لە دەسەڵاتی حوکمڕانی خۆماڵی، وایلێهاتووە ڕۆژانە گوێبیستی خۆزگەخواستن بە سەردەمی ڕژێمی ستەمکاری بەعس و پیاهەڵدان بە (سەدام حوسەین)ی فەرماندەری کیمیاباران و کۆمەڵکوژییەکانی بەناو ئەنفال دەبین.

من دەمێکە وتوومە پێویستە توێژینەوەی قووڵی دەروونی و کۆمەڵایەتی لەسەر کەسێتی مرۆڤی کورد بکرێ، بەسەرکردە و نوخبەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و خەڵکی ئاساییشەوە. ئاخر لانیکەم ١٠٠ ساڵە بێوچان، ئەم میللەتە قوربانی نەماوە لەپێناو ئازادی نەتەوەکەی و ڕزگاری خاکەکەیدا نەیدات، کەچی هێشتا ئەم کاروانە، نەگەیشتووەتە مەنزڵ و کەناری ئارامیی، چونکە هێشتا لێرە و لەوێ زۆرجار ناپاکی و چۆکدادان بۆ بێگانە و لاوازیی ئینتیما و خۆبەکەمزانین و خەڵک بەگەورە زانین، بەزەقی هەستیان پێدەکرێ.

ڕەنگە بەشێک لەو خەسڵەتانە – وەکو لە پێشەوە ئاماژەم پێکرد – هۆکارەکەی بۆ نەبوونی دەوڵەت و قەوارەی سیاسی بگەڕێتەوە، کە بەشەکەی تری هۆکارەکانی ئەویش بۆ بێ بەڵێنی و غەدری گەورەی (ئینگلیز و فەرەنسییەکان) لە کۆندا و

(ئەمریکا) لە دواتردا، بگەڕێتەوە.

دیارە هەر ئەم هەڵوێست و ڕەفتارەی زلهێزەکانی ڕۆژئاواش بەرامبەر کورد، پێویستی بەهەڵوەستە لەسەر کردن هەیە و بۆ خۆی پرسیارێکی دیکە دەوروژێنێ، ئەویش ئەوەیە :- ئایا ئەو زلهێزانە بۆ بەوشێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ کورددا کرد و پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنەکانیان ؟ بۆ نموونە ئەو بەڵێنانەی کە لە بەندەکانی (٦٢ و٦٣ و٦٤)ی  پەیماننامەی سیڤەری ساڵی ١٩٢٠دا بە کوردیان دا، لە بڕیاری پێدانی ئۆتۆنۆمی، تا سەربەخۆیی ؟! ئایا ئێمە شایستەیی و (اهلیە)تمان نەبوو، یان نەیار و ڕکابەرە (تورک و فارس و عەرەب)ەکانمان بەهێزتر و شارەزاتر و دەسپێشخەرتر بوون لە ئێمە؟! یان بەرژەوەندییە ستراتیجییەکانی خودی زلهێزەکان و ئاسەواری جەنگی خاچپەرستان وایلێکردوون؟! لەڕاستیدا ئەکرێ -بەڕێژە- هەموو ئەمانە ڕاست بن.

لەکۆتاییدا ماوە بڵێم، کە مرۆڤی کورد وەکو تاک، لە پرسی خیانەتدا هیچ کات بەرپرسی یەکەم نەبووە و نیە،  بەڵکو نوخبەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و گرووپەکان، زۆرجار بەرپرسیاری سەرەکی بوون.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


١- محمد بن يعقوب الكليني / الكافي - بەرگی ٥ - لاپەڕە ١٥٨..

٢- محمد بن حسن الطوسی/ تهذيب الاحكام - بەرگی ٧-  لاپەڕە ١١..

٣- محمد باقر المجلسي / بحار الانوار - هەروەها نوسراوی چەندین مەرجەعی گەورەی دیکەی شیعەی دوازدە ئیمامی.

٤ -المسعودي/ مروج الذهب ومعادن الجوهر- بەرگی ٢- لاپەڕە ١٢٣ ...

+ د.فرست مرعي / الكورد من منظور علماء الشيعة الاثني عشرية - وتار ١/ ١٠/  ٢٠١٧.

+زانیاریی و یادەوەریی و نووسینەکانی نوسەر لەسەر بابەتەکان.





زەینەپ ن. کایە
لە ئینگلیزییەوە: ڕەوەند سەباح

# کورد و کوردستان لە تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا[1]

١ لەم وەرگێڕانەدا، تەنیا ئەو بەشانەی توێژینەوەکە وەرگێڕدران کە گرنگ و پەیوەندیداربوون بە تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسەکان بەرانبەر کورد و کوردستان.

https://eprints.soas.ac.uk/32786/1/Kaya_Orientalist%20Views%20of%20Kurds%20and%20Kurdistan.pdf

ئەم بابەتە باس لە تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بەرامبەر کوردستان و چالاکی سیاسی کوردی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەکات. ئەم تێڕوانینانە کاریگەرییەکی گرنگیان لەسەر هەوڵەکانی نوخبەی سیاسی کورد بۆ وەرگرتنی شەرعیەتی نەتەوەیی لەم قۆناغەدا هەبووە و هەتا ئەمڕۆش کاریگەرییان لەسەر سیاسەتی کورددا هەیە. لەم چوارچێوەیەدا ئەم توێژینەوە هەوڵ دەدات وەڵامی کۆمەڵێک پرسیار بداتەوە، لەوانە: هۆکاری سەرەکی پشت تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژئاوایی بەرامبەر کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا چین؟ ئەمانە چۆن کاریگەرییان لەسەر پەیوەندی نوخبەی سیاسی کورد لەگەڵ ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەبووە؟ هەروەها چۆن کاری کردە سەر بزوتنەوەی سیاسی کورد و هەوڵە بەردەوامەکانیان بۆ شەرعیەتی سیاسی؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا، ئەم بابەتە چالاکیی زلهێزە ئیمپریالیزمە ڕۆژئاواییەکان لە ناوچەکانی ئیمڕاتۆرییەتی عوسمانی بە بنیادنانی ناسنامەی نەتەوەیی کورد و گەشەسەندنی سیاسەتی کوردی ئەوکات دەبەستێتەوە. ئەوە ئاشکرا دەکات کە نەخشە ئێتنۆگرافییەکانی ناوچەکە، کە لەلایەن جوگرافیناسانی ڕۆژئاواوە کێشراون، لە سەرەتای سەدەی بیستەم و بەدواوە لەلایەن ناسیۆنالیستە کوردەکانەوە بەکارهێنراونەتەوە و بوونەتە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ نەخشەکێشانی کوردستان.

تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسەکان بەرامبەر گەلانی غەیرە ڕۆژئاوایی، زیاتر لە ڕوانگەی کەلتووریی و شارستانی بووە. تێڕوانینەکانیش لە ڕێگای لێکۆڵینەوە و تێبینییەکانی گەشت و تێکەڵاوییەکانی جوگرافیناسانی ڕۆژئاوایی، ئەفسەرانی سەربازی، خاوەنکارە ئابوورییەکان بنیادنراون. ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەتایبەت ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ببوونە جێی سەرنج و بایەخی وڵاتانی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا. ئەمەش بەشێکی بەهۆی هۆکاری ئابووریی و سیاسییەوە بوو، وەک ڕێڕەوی بازرگانی و زیادبوونی کاریگەریی ڕووسیا لە ناوچەکەدا، هەروەها بوونی دانیشتوانی مەسیحی لە ناوچەکەدا.

توێژینەوە جوگرافی و ئێتنۆگرافییەکانی گەڕیدە ئەوروپییەکان، سیاسەتی

دەسەڵاتە ئیمپریالیزمەکان لە پێش و لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی و لە دوای جەنگەکەش، کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر دارشتنی نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چارەنووسی سیاسیی کوردەکاندا هەبوو. تەنانەت، دارشتنی نەخشەی سیاسی و هەرێمی ناوچەکە بەهۆی بەرژەوەندی سیاسیی و ستراتیژیی و ئابووری زلهێزە ئیمپریالیزمەکان و ڕکابەری نێوانیان بووە.

بۆیە ئەم بابەتە تیشک دەخاتە سەر تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر ناسنامەی نەتەوەیی گەلانی غەیرە ڕۆژئاوایی، بۆ نمونە گەلانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. تێڕوانینی گەڕیدە و دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان بەرامبەر چەمکی نەتەوەیی پێداچوونەوە بە شوناس و خاکی نەتەوەیی کورد لە ڕابردوودا، هەتا ئێستاش کاریگەری لەسەر تێڕوانینی هاوچەرخ هەیە. تێگەیشتنی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە ناسنامەی نەتەوەیی بەندبوو بەو بۆچوونەی، کە گوایە ئەگەر هەر پێکهاتەیەک بە نەتەوە هەژمار بکرێت، پێویستی بە ئاستێکی دیاریکراوی گەشەسەندن، سەرکردایەتییەکی سیاسی یەکگرتوو، هەستکردن بە ناسنامە و بەرژەوەندی هاوبەش هەیە، بەڵام کورد وەک کۆمەڵگەیەکی خێڵەکیی و پەرتەوازە و دواکەوتوو تەماشا دەکرا. هەروەک ئەکرێم کاراکۆچ و ئێگە ئۆزێن باسیان کردووە، ئەم جۆرە بۆچوونانە لێکچوونێکی لێڵ و ئاڵۆزی لەگەڵ بۆچوونە تورکییەکان بەرامبەر کورد لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا نیشان دەدەن.

ئەوەی جێگای سەرنجە، لێکۆڵینەوە ئێتنۆگرافی و نەخشەسازییە ئەوروپییەکان، کاریگەری بەرچاویان کردووەتە سەر دارشتن و پێناسەکردنی ناوچەییانەی ناسنامە و نەتەوەسازی خەڵکی ناوچەکە، لەنێویاندا کورد. لەڕاستیدا ئیمپریالیزمی ئەوروپی زەمینەیەکی گونجاوی بۆ جیهانی ئەمڕۆ دارشتووە، لەم پرۆسە مێژووییەدا جوگرافیا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو، بەوپێیەی "هیچ کام لە ئێمە لە دەرەوەی جوگرافیادا نین[1]. لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، نەخشەسازی ڕۆڵێکی کاریگەر و بەرچاوی لە زاڵکردنی تێڕوانین و فکری باڵادەستدا هەبووە[2]. نەخشەسازی گوزارشت لە گوتاری ئایدیۆلۆژیی و سیاسەتێکی فراوانتر

---

[1] سەعید ١٩٩٤: ٦

[2] وینتڵ ١٩٩٩: ١٣٧

دەکات، ڕەنگدانەوەی دەرەنجامی پەیوەندی نێوان نەخشەسازەکان و ئامانجی لێکۆڵینەوەکانیان و فەرمانگە سیاسییەکان و کۆمەڵگەکانەوە بووە٣. ناکرێ ناوچە و وێنە و نەخشەسازییەکانیان لەڕووی مێژووییەوە بە گرنگ وەرنەگیرێن. نەخشەکان پێکهاتەی «زمانێکی بینراو»ن، کە مانای بەرژەوەندییە ستراتیژیی و ئایدۆلۆژییەکان دەگەیەنن٤. تەنانەت کاتێک ئامانج لە بەرهەمهێنانی نەخشە پڕوپاگەندە نییە، نەخشەکان ڕەنگدانەوەی لایەنگریی و گریمانە نائاگاکانن کە لە بەها تایبەتەکان، ئایدۆلۆژیاکان، بەرژەوەندییە سیاسییەکانی بەرهەمهێنەر و ئەو دامەزراوە و مێژوویانەدا هەڵکەوتوون، کە تێیدا بەرجەستەبوون٥.

## هزر و تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بەرانبەر جوگرافیای گرووپە ئەتنیکییەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی و کورد

لێکۆڵینەوە و تێڕوانینی گەڕیدە و ئەفسەرە ئەورووپییەکان لەبارەی گەلانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەوانەش کورد، بەندە بە کاریگەری پێشکەوتنی سیاسەتەکانی ڕۆژئاوا بەرانبەر بە ئیمپراتۆریەت و گەلەکەی لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی و دوای جەنگەکەشدا. ئەم تێڕوانینانە هەم ستایش و هەم ڕەخنەش بوون بەرانبەر نوخبەی سیاسی کورد و پێکهاتەی خێڵەکی کۆمەڵگەی کوردی.

ئەم تێڕوانینە نادادیانە هۆکارێکی گرنگ بوون بۆ پێکهێنانی ئەو بۆچوونەی کە کورد ئامادە نییە بۆ گەیشتن بە دەوڵەتداری. بۆ نموونە ئەو لێکۆڵینەوانەی لەلایەن ئەفسەرانی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی و گەڕیدەکان لەبارەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمڕاتۆریەتی عوسمانی کراون لەلایەن نووسەران، مرۆڤناسان، زمانەوانان، جوگرافیناسان ئەنجامدراون، ئەوانیش لەو ڕوانگانەوە توێژینەوە و لێکدانەوەکانیان کردووە، وەک ئەوەی مارک سایکس لە نووسینی 'خێڵە کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی' (١٩٠٨)، فرانسیس ماونسێل لە نووسینی' "کوردستان

٣ هەمان سەرچاوە. ١٣٨

٤ هارلی ١٩٨٣

٥ تاینەر ١٩٨٢؛ هارلی و وودوارد ١٩٨٧: ٢

(١٨٩٤)، فرێدریک میلینگن لە نوسینی ژیانی کێوی لە نێوان کۆردەکاندا (١٨٧٠) باسیان کردووە.

میلینگن بەگشتی باسی ناکۆکی خێڵەکی و شەڕی نێوان خێڵەکان و دواکەوتوویی کولتووری کوردی دەکات.

هەردوو ماونسێل و سایکس باسی شەڕی نێوان هۆزە کوردەکانیان کردووە، بەتایبەت ئەو کوردانەی بەشداربوون لە دروستکردنی فەوجی حەمیدییە، هەروەها ئەو کاریگەرییە نەرێنییەی لەسەر ئاسایشی ناوچەکە هەیانبووە٦. ئەو نووسەرانە باسی چەوساندنەوەی ئەرمەنەکانیشیان کردووە لەلایەن سوارەی حەمدییە. بۆ نموونە ماونسێل نووسیویەتی کوردەکان ڕەگەزپەرستن، بەردەوام لەگەڵ مەسیحییەکان شەڕیان کردووە٧. لە کار و چالاکی و پشکنینەکانیاندا لەبارەی ئەو ناوچانەی غەیرە ئەورووپین لە سەدەی نۆزدەهەمدا، گەڕیدەکان کاریگەری بەرچاویان لەسەر حکومەتی وڵاتەکانیان هەبووە سەبارەت بە داڕشتنەوەی دابەشبوونی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. تێڕوانین و داڕشتنی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەبارەی جوگرافیای ناوچەکە بەگوێرەی بەها کولتووری و سیاسییەکانی ئەورووپاوە بوو.

## کورد و کوردستان لە دیدی گەڕیدە ئەورووپییەکاندا

هەموو ئەو گەڕیدە و نوسەرانەی سەردانی ناوچە کوردنشینەکانیان کردووە، جا چ وەک بریکاری دەوڵەت، ئەفسەری سەربازی، شارەزا، یان وەک ڕۆژنامەنووس و توێژەر لە سەدەی هەژدە و نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست، پێناسە و وێنا و نەخشەی جۆراوجۆریان لە هەمبەر کوردستان خستۆتە ڕوو. گەلێک هۆکار هانیداون بێن بۆ کوردستان، هەر ئەو هۆکارانەش کاریگەریان خستۆتە سەر تێڕوانینەکانیان و شێوازی لێکۆڵینەوەکانیان. سەرەتا سەردانەکانیان بەهۆی

---

٦ لاوفلین ١٩٨٦: ٣٢٢

٧ هەرچەندە بە گوێرەی فریدن (١٩٩٨) ناسیۆنالیزم ئایدۆلۆژیایەکی تەواو نییە، بەڵام ئەو شێوازەی کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ پاساوهێنانەوە بۆ پێکهاتنی دەوڵەت و سیاسەتەکانی بەکارهێنرا، دەکرێت وەک ئایدۆلۆژیایەک سەیربکرێت. لە بارودۆخی تردا ناسیۆنالیزم دەکرێت وەک هەست یان بزووتنەوەیەک سەیر بکرێت.

ئامانجی ئابووریی و ئایینییەوە بووە. لەبەرئەوەی کوردستان کەوتووەتە سەر ڕێگایەکی بازرگانی، چەندین ڕاپۆرت و نەخشەیان بۆ ئەم مەبەستە بەرهەمهێناوە، کە تێروانین و سەرچاوەی گرنگ لەبارەی کورد و کوردستان لەخۆدەگرن. بازرگانە ئیتالییەکان یەکەم کەس بوون سەردانی کورستانیان کردووە، پێگە و ڕێگای بازرگانی و توانای ئابووریی ناوچەکە سەرنجی ڕاکێشاون. کۆنترین سەربووردەی ئەورووپییان لەو ڕووەوە نوسییوە، لەوانە یەکەم کتێبی ڕێزمانی کوردی و فەرهەنگیان نووسیوە ساڵی ١٧٨٩. جگە لەمانە چەندین ڕاپۆرتیان لەسەر پێکهاتەی سیاسی و پێگە و تایبەتمەندی جوگرافی ناوچەکە نووسیوە ٨، هەروەها گەڕیدە ئەڵمانییەکانیش بەگوێرەی توێژینەوەکانیان لەسەر ناوچەکە و تایبەتمەندییەکانی، بەتایبەتی ڕێگا بازرگانییەکان لە سەدەی هەژدەهەمەوە لەبارەی کوردستانەوە تێبینییەکانیان خستۆتە ڕوو. بەهۆی ئەوەی پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئیمڕاتۆرییەتی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بە دواوە هەبوو، لەو ڕووەوە ئاسانکاری زۆریان بۆکراوە تاوەکو سەردانی ناوچەکە بکەن٩ .

ئەڵمانییەکان برە پارەیەکی زۆریان بۆ پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا وەبەرهێنا، ئەو پرۆژە ساڵی ١٩٠٣ کەوتە بواری جێبەجێکردن، بەگوێرەی پڕۆژەکە، هێڵی شەمەندەفەر بەنێو کوردستاندا تێپەڕدەبوو. بەرژەوەندی ئابووریی و بازرگانی سەرنجی ئینگلیزەکانیشی سەرەتا بۆ خۆ ڕاکێشا، بۆ نمونە، کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیند لە ناوچەکە زۆر چالاک بوو. بە هەمان شێوە، فەڕەنسییەکانیش لەڕووی ئابوورییەوە زۆر چالاک بوون، پەیوەندییەکی بەرفراوانیان لەگەڵ ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا هەبوو، هێڵی شەمەندەفەریان لە خاکی عوسمانیدا دروستکرد١٠، هەروەها پشکی لەسەدا ٤٠یان لە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدادا هەبوو. ڕووسەکان یەکەم کەس بوون باسی ڕێگای بازرگانی لە ناوچەکەدا بکەن١١.

وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەتایبەتی ئیتاڵیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا،

٨ ئۆشی ٢٠٠٤: ١٠٩-١١٤

٩ هێڵی شەمەندەفەر کە بەرلین و ئەستەنبوڵ بەیەکەوە دەبەستەوە و ڕۆڵی سوپای ئەڵمانیا لە چاکسازی لە سوپای عوسمانیدا هۆکاری گرنگ بوون.

١٠ ١٢٦٦ کم تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم.

١١ ئۆشی ٢٠٠٤: ١١٤

دواتریش بەریتانیا، ڕۆڵ و چالاکیی موژدەبەرانەی گشتگیر و بەرفراوانیان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا گێڕاوە. کریستیانەکان سەرنجی ئەو وڵاتانەیان بۆ خۆیان ڕاکێشاوە، موژدەبەرە ئەمریکییەکان هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە چالاکانە لە کوردستان چەندین لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرتیان نووسیوە. موژدەبەرە ئیتاڵیی و فەرەنسییەکان ڕۆڵیان لە چەندین چالاکی لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی لە ویلایەتی موسڵ گێڕاوە، لەو ڕووەوە، لەسەر بارودۆخی ئایینی و جوگرافی و ژیاری کوردیان نووسیوە١٢. بەهۆی ئەوەی موژدەبەرەکان گرینگییەکی زۆریان بە مەسیحییەکانی ناوچەکە دەدا، کاریگەی زۆری کردە سەر دید و تێڕوانینی خۆیان و ڕۆژئاواییەکان بەرانبەر کورد و موسڵمانەکان، هەروەها ئەمەش کاریگەرییەکی خراپی هەبوو لە تێکچوونی پەیوەندییەکانی ناوچەکە و سەرهەڵدانی گرژی و ئاڵۆزی. ڕۆژاوئاییەکان جیاکارییان لە نێوان موسڵمان و کریستیانەکان دەکرد، لە دیدگای خۆیاندا کریستیانەکانیان بە کۆمەڵگەیەکی شارستانی تر لە قەڵەم دەدا، لەکاتێکدا تێڕوانینێکی نەرێنیان لەسەر هەموو گەلانی ناوچەکدا هەبوو، بە کریستیانەکانیشەوە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم، ڕووس و فەرەنسییەکان گرینگییەکی زۆریان بە ئەرمەنەکان دەدا، هەرئەوەش بووە هۆی نانەوەی پشێویی و ئاڵۆزی لە نێوان کورد و ئەرمەنەکان١٣. لەلایەکی ترەوە، وەک ئۆهانیس کیلیچداخ باسی دەکات، ئەگەرچی ڕۆشەنبیرە ئەرمەنییەکان کورد بە گەلێکی نا شارستانی لە قەڵەم دەدەن، بەڵام لە بەرژەوەندی گەلی ئەرمەنە لەم ڕووەوە یارمەتی گەلی کورد بدەن تاکو زیاتر بەرەوپێشەوە بچن.

نەخشە و ڕاپۆرتی گەڕیدە ئەورووپییەکان بەگشتی پشتی بە توێژینەوە و تێڕوانینەکانیان بەستووە، ئەگەرچی ڕەنگە چاویان بەو باس و خواسانەی پێشووتر لەسەر کورد نووسراون کەوتبێ کە لەلایەن گەڕیدە و مێژوونوسە موسڵمانەکانی وەکو شەرەفخان و ئەولیا و کۆییەوە نووسراون، بۆ نمونە ڕاولینسۆن وەک گەڕیدەیەک و ئەفسەرێکی سەربازی سەردانی باکووری میزۆپۆتامیا و چیاکانی

---

١٢ مێیسێلاس ٢٠٠٨: ٢–٥٠

١٣ ئۆشی ٢٠٠٤: ١٠٨–١١٣

زاگرۆسی کردووە، لەو دۆخەدا شەرەفنامەی خوێندووەتەوە کە لەلایەن میری بەتلیسی حاکمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نووسراوە١٤. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرچاوە و نەخشەسازی کەم لەلایەن توێژەرانی ناوچەکە لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست خراونەتەڕوو. لەبەرئەوە باشترە بڵێین، ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەورووپییەکان لەبارەی دانیشتوان و نەخشەسازی ناوچەکە کردوویان پشتی بە تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسییانە و زانستی کۆلۆنیالیزم و میتۆدۆلۆژیای جوگرافی بەستووە، هەربۆیە، لەو ڕوانگەوە زانیارییەکانیان کۆکردۆتەوە و لێکدانەوەیان بۆ کردووە، بۆ نمونە گەڕیدە و نووسەرە ئەورووپییەکان بێ ئەوەی پشت بە بەڵگەی مێژووی ببەستن نەژادی کوردیان بە ماددەکانەوە بەستۆتەوە١٥.

بەهۆی کێبڕکێی وڵاتانی ئیمپریالیزم، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست، وڵاتانی ئەورووپی گرنگی زیاتریان بە ناوچەکە دەدا، لەبەرئەوەش بەگوێرەی بەرژەوەندی ستراتیژیان لێکدانەوەیان بۆ ناوچەکە دەکرد، هەر وڵاتێک دەیویست هەژموونی سیاسی و ئابووری لە ناوچەکە زیاتر بکا. پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا هێندەی تر کێبڕکێی نێوان وڵاتە زلهێزەکانی توندتر کرد، هەر وڵاتێک دەیویست دەسکەوتی زیاتری لەو پرۆژە نوێیەی گواستنەوە و گەیاندن دەستبکەوێت١٦. بەهۆی ئامادەبوونی زیاتری وڵاتە ئەورووپیەکان لە قەوقاز و باشووری قەوقاز، ڕووسیا زیاتر پەرەی بە فراوانکردنی بەرژەوەندییەکانی دەدا لە ناوچەکە. وڵاتانی ئەورووپی شانبەشانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران ئەو هەنگاوەیان بە هەڕەشە دادەنا١٧. کێبڕکێ و بەرژەوەندی وڵاتانی ئیمپریالیزم داهاتووی ناچەکەی داڕشت، کە ئەمەش لە دوور مەودادا نەتەوەپەرستە کوردەکانی بێ ئومێد کرد لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دوای جەنگی یەکەمی جیهانی.

گەڕیدە ئەورووپییەکان چەند نەخشەیەکی ناوچەکە و کوردستانیان کێشاوە، یەکەم نەخشەش لەلایەن گەڕیدەی ئینگلیزی کلۆدیۆس ڕیچەوە کێشراوە، کە

١٤ ڕاولینسۆن ١٨٣٩؛ ئەلسانچاکلی ٢٠١٧.

١٥ ئۆشی ٢٠٠٠: ٦٥

١٦ مەکمورای ٢٠٠١

١٧ ئۆشی ٢٠٠٤: ١١٢-١١٣

سەردانی ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و وڵاتی ئێرانی کردووە لە دوو دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ١٨. دواتر ئەڵمانەکان ساڵی ١٨٥٤ نەخشەیەکی ئیتنۆگرافی ئەرمینیا و ئازەربایجان و کوردستانیان کێشاوە، کە ڕێگە بازرگانییەکانی تێدا ڕوونکراوەتەوە ١٩. کارستۆڤ، ئەفسەری سەربازی ڕووسی نەخشەی هۆزە کوردییەکانی لە ساڵی ١٨٩٦ کێشاوە (ئۆشیە ٢٠٠٤: ١١٢). یەکەم نەخشە کە بە دیاریکراوی لەسەر کوردستان کێشرابێ لەلایەن مۆنسێلی ئەفسەری سەربازی بەریتانییەوە بوو، دوای گەشتەکانی بۆ ناوچەکە ساڵی ١٨٩٢، نەخشەکە زانیاری جوگرافی، دانیشتوان و کەمە نەتەوەکانی تری کوردستانی تێدا بوو ٢٠. حکومەتی بەریتانی نەخشە ئیتنۆگرافییەکەی مۆنسێلی بەکاردەهێنا لە کاتی پیادەکردنی پلانە ستراتیژیەکانی لە ناوچەکە بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی. نەخشەی ئیتنۆگرافی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، کە ساڵی ١٩١٩ کێشرا(ئەگەرچی پشتی بە زانیارییەکانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی دەبەست) ڕەنگدانەوەی پێگەی وەزارەتی دەرەوە بوو لە ناوچە ئەرمەنی نشینەکان. بەگوێرەی گووتەی ئۆشیا بەهۆی ئەوەی لە کۆتایی جەنگەکە، هێزەکانی هاوپەیمانان نیازیان وابوو پێگەی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لاواز بکەن، بۆیە لە نەخشەکە ڕووبەرێکی فراوانی دانیشتوانی مەسیحی تێدا دیاریکرابوو٢١.

هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە، دەوڵەتە ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمەکان ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆیان گێڕا هەتاکو کار لەسەر دارشتنی سنووری ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بکەن. سنووری دەوڵەتی عوسمانی و وڵاتی فارس لە پەیمانی زەهاو(١٦٣٩) بەدرێژایی نزیکەی ١٠٠ سەد کیلۆمەتر دیاریکرا، لەنێویدا چەندیین خێڵی کوردیی تێدا نیشتەجێبوون. دیاریکردنی سنووری نێوان تورکیا و ئێران وای لە وڵاتانی ئەورووپی کرد ئامادەییەکی باشیان هەبێ هەتا ساڵانی ١٩١٠ ٢٢. ئەو بارودۆخە هەندێک دەرفەتی سەربەخۆیی بە کوردەکاندا، کە

١٨ هەمان سەرچاوە.

١٩ هەمان سەرچاوە. ١٠٨

٢٠ هەمان سەرچاوە. ١١٠

٢١ هەمان سەرچاوە. ٤٨

٢٢ بۆ پرۆسەی دەیان ساڵەی دیاریکردنی سنوورەکان، سەیری ئاتێش ٢٠١٣ بکە.

دەیانتوانی خۆیان بگونجێنن هەرکاتێک بە باشی بزانن ڕێکبکەون لەگەڵ هەریەک لەو دوو دەوڵەتەدا. هەروەها ئەو جوگرافیایە وای لە کورد و پێکهاتەکانی تری ئەو ناوچانە کرد بە لاوازی بمێننەوە، چونکە بە ئاسانی لەلایەن هێزە ئیمپریالیزمە دەرەکییەکانەوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکاردەهێنران. ئەو نەخشانەی لەو ماوەیەدا کێشران، بە نەخشەکانی (مۆنسیڵ)یشەوە، ڕۆڵێکی گرینگیان لە دارشتنی سنوورەکانی پێش و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بینی٢٣.

ئەو لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرت و شرۆڤانەی لە لایەن گەڕیدە و بەرپرسانی حکومی وڵاتانی ئەورووپاوە کراون لە سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە، ، جا چ پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، یانیش لە کاتی جەنگەکە و دوای جەنگەکەدا بێ، ڕۆڵێکی بەرچاویان لە دارشتنی سیاسەتی وڵاتانی ئەورووپا بەرانبەر کورد هەبووە. کەچی بەپێچەوانەوە هەموو ئەو زانیارییانەی لە بواری نەخشەسازی، توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژیەکانەوە، کە لەبارەی تایبەتمەندییە جیاوازییەکانی کوردەوە نوسرابوون، بەردی بناغەی ناسیۆنالیستی نەخشەسازیی و شێوازی مێژوونوسینی کوردی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم بنیادنا. ناسیۆنالیستە کوردەکان ئەو نەخشانەیان دووبارە کردەوە بیر و سنووری نیشتمانی کوردیان لەسەر بنیادنا. نەخشەکەی مۆنسیڵ و گەڕیدەکانی تر بەفراوانی لە لایەن ناسیۆنالیستە کوردەکان بەکارهێنرانەوە، هەروەها لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و دواتر نەخشەی خۆیان لەسەر کێشایەوە٢٤.

بۆ نمونە، نەخشەکەی شەریف پاشا، کە لەنێو ئەو یاداشتەدا بوو داوای مافی چارەی خۆنوسینی کوردی لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دەکرد، لەسەر بنەمای ئەو نەخشانە کێشرابوو، کە گەڕیدە ڕۆژاوائاییەکان و خاوەنکار و سوپای بەریتانی و ئەڵمان پێشووتر کێشابوویان ٢٥. کۆنفرانسەکە میوانداری نوێنەری نەتەوە و گرووپی جۆراوجۆری کرد، ئەگەرچی هەموو ئەو نوێنەرانە بە فەرمی دەرفەتی

---

٢٣ هەمان سەرچاوە. ١٢٥

٢٤ هەمان سەرچاوە. ١٠٧

٢٥ هەمان سەرچاوە

گوێگرتنیان پێنەدرا، بە شاندی گەلی کوردیشەوە. شەریف پاشا ٢٦، دیپلۆماتکاری عوسمانی لە پاریس، وەک نوێنەری کورد لە باڵوێزی بەریتانیا و سەرۆکی شاندی کوردی لە کۆنفرانسەکە کاری دەکرد. پاشا لەسەر خواستی گەلی کورد یاداشتێکی ئامادەکرد بەناوی (یاداشتی کوردی)، کە نەخشەیەکی کوردستانی تێدابوو، پێشکەشی کرد. لە کۆنفرانسەکە نەخشە بەفراوانی لەلایەن شاندە جیاوازەکان بەکاردەهێنران تاکو جەخت لە وجوودی ئەو جوگرافیایە بکرێتەوە، کە تێیدا خەڵکەکەی لە جیهاندا بە نەتەوە بناسرێن٢٧، نوێنەری کوردیش لەمە بەدەر نەبوو.

شەریف پاشا لە یاداشتنامەکەیدا داوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردی دەکرد، ئامانجی سەرەکیش لە یاداشتنامەکەی بریتی بوو لە گەیاندنی دەنگی ناڕازی دژی بانگەشەکانی ئەرمەنەکان. لە یاداشتەکە ئاماژەی بەوە دەکرد، کە ئەو ناوچانەی ئەرمەنەکان بانگەشەی بۆ دەکەن بە هی خۆیان دەزانن. لەڕاستیدا، دەکەونە نێو سنوری کوردستانی تورکیا، هەر لە یاداشتەکە ئەوە ڕوونکراوەتەوە، کە ئەگەر ئەو ناوچە ناکۆکانە بخرێنە سەر ئەرمەنستانی نوێ، ئەوا خۆدورخستنەوە لە پشێوی و ئاڵۆزی و شەڕوشۆر زۆر زەحمەت دەبێ٢٨. لە یاداشتەکەدا بەم شێوەیە سنووری ئێتنۆگرافی کوردستانی تورکیا دیاریکراوە:

لە باکوورەوە، لە زیڤین، لە سنورەکانی قەوقاز، درێژدەبێتەوە بەرەو ڕۆژئاوا تا دەگاتە ئەرزڕووم و ئەرزینجان و کێما و عەرەبکیر و بێنیسمی و دیڤیک؛ لە باشوور، هەر لە حەڕانەوە هەتا چیاکانی شەنگال و تەلەعفەر و هەولێر و کەرکوک و سلێمانی و سنە درێژدەبێتەوە؛ لە ڕۆژهەڵات، لە ڕەواندز و باشقەڵا و ڤێزیرقەلە و سنوورەکانی وڵاتی فارس تا چیای ئارارات درێژدەبێتەوە ٢٩.

ئەگەرچی شەریف پاشا لەلایەن ئەوروپییەکانەوە بە نوێنەری کورد دانەدەنرا، سەرەڕای هەوڵ و کۆششەکانی، بەریتانییەکان بەجدی ڕەچاوی هەوڵەکانی

---

٢٦ پاشا لە ئەستەنبوڵ گەورە بووە و بە ڕەچەڵەک کورد بووە.

٢٧ هاوس و سیمۆر ١٩٢١: ١٤

٢٨ یاداشتی کوردی: ٣

٢٩ هەمان سەرچاوە. ١٢

نەکرد٣٠. پاشا نە هەڵبژێردراوبوو نە پشتگیریشی لێ دەکرا لەلایەن سەرکردە کوردەکانی ئەستەنبۆڵ و خەڵکە کوردەکەی. سەرۆک خێڵە کوردەکان چەندین تەلەگرامیان بۆ کۆنفرانسەکە نارد تێیدا دژایەتی خۆیان بەرانبەر شەریف پاشا دەربڕی و بەنوێنەری شەرعی خۆیانیان نەدەزانی، هەروەها نارەزایەتی خۆیان دژی نەخشەکەی ئەو دەربڕی.

ئەمین عەلی بەدرخان یەکێک لەسەرکردەکانی کۆمەڵەی پێشکەوتنخوازی کورد لە ئەستەنبوڵ، زۆر بەتوندی دژایەتی خۆی بۆ پلانەکانی شەریف پاشا دەربڕی، بەتایبەتی سەبارەت بە نەخشەکەی ٣١. شەریف پاشا ناوچەی (وان)، کە بە نیشتمانی ئەرمەنەکان دادەنرا نەخستبووە نێو نەخشەکە. گوایە، شەریف پاشا لەژێرەوە لەگەڵ شاندی ئەرمەنەکان ڕێکەوتبوو تا دەوڵەت هەم بۆ ئەرمەنستان هەمیش بۆ کوردستان دروستبکەن ٣٢. هەروەها هەندێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان نوێنەریان ناردە کۆنفرانسەکە بۆئەوەی دژایەتی خۆیان دژی پێشنیازەکەی شەریف پاشا لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بخەنە ڕوو، هەروەها لەجیاتی ئەوە لە دژی جودابوونەوە لە تورک، وەلائی خۆیان بۆ برایەتی تورک دەربڕی ٣٣. لە نیسانی ١٩٢٠ شەریف پاشا دەستبەرداری پۆستەکەی خۆی بوو وەک نوێنەری کوردی، لەمە بەدوا بەریتانییەکان ڕاستەوخۆ پەیوەندیان لەگەڵ سەرکردەکانی ناوچەکە گرێدا ٣٤.

---

٣٠ ماکدۆوال ١٩٩٦: ١٢٢

٣١ ئۆزۆغڵو ٢٠٠٤: ٣٩–٤٠؛ بۆزارسلان ٢٠٠٣: ١٦٩. سەید عەبدولقادر، سەرکردەی دیکەی (SAK) و ڕکابەری ئەمین عەلی بەدرخان، پشتگیری لە هەوڵەکانی شەریف پاشا کرد لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس.

٣٢ بۆزارسلان ٢٠٠٣: ١٦٩؛ ئۆلسۆن ١٩٩١: ٣٩٩

٣٣ ڤان بروینسن ١٩٩٢ : ٢٧٩ ; بۆزارسلان ٢٠٠٣ : ١٧٢.

٣٤ ئۆشی ٢٠٠٤: ١٢٩

## ڕێککەوتنی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و کورد

سەرەتاکانی سەدەی بیست و دواتریش، وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ جێبەجێکردنی ئەرک و بەرژەوەندییەکانیان بەردەوامیان بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کورددا، ئەگەرچی پشتگیری تەواوی بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیان نەدەکرد. گەڕیدە و ئەفسەرە ئەوروپییەکان تڕوانینی خۆیان لەبارەی کوردەوە لەسەر بنەمای نەتەوەسازی بنیادناوە، بەگوێرەی دیدگای ئەوان کورد تایبەتمەندییەکانی نەتەوەسازی تێدانەبووە، هەرووەها وەک گروپێکی شەرعی شایستە بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ تەماشا نەدەکرا، چونکە بە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو و خێڵەکی و دابەشبوو تەماشا دەکرا. ئەو باسانەی لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا سەبارەت بە کورد خراونەتەڕوو، نیشاندەری ڕوون و ئاشکران بۆ ئەو جۆرە تێڕوانینانە.

بەتایبەتی ئینگلیزەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە داڕشتنی چارەنووسی سیاسی کورد لەم سەردەمەدا گێڕا، پەرتەوازەیی نێومالّی کورد، فرەدەنگی کورد و ڕکابەری سەرکردەکانیان بەربەستبوون لە بەردەم دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی٣٥ .

لیۆد جۆرجی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لە نێوان ساڵانی ١٩١٦ و ١٩٢٢ دەنووسێت: «پێناچێ کورد جگەلە خێڵەکەی خۆی نوێنەرایەتی هیچی تری کردبێ» ٣٦. ئەمەش پێچەوانەی ئەو جوڵانەوە پتەو و یەکگرتوو و تۆکمەیەی ئەرمەنەکانە، کە لەلایەن نوێنەرایەتییەکی ڕێکخراو و کاریگەری ئەرمەنییەوە ڕێبەرایەتی دەکران.٣٧ ئەو تێڕوانینەی لەبارەی پەرتەوازەیی و نائامادەیی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کورد هەبوو، هەتا ئێستاش لە داڕشتنی گوتاری سیاسی بەرانبەر کورد بەردەوامە. ڕۆڵی کوردەکان لە چەوساندنەوەی کەمینەکان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەرمەنەکان لە ژێردەسەڵاتی عوسمانییەکان، بەتایبەتی لە تێوەگلانیان لە سوارەی حەمدییە لەژێر دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم،

---

٣٥ ئۆشی ٢٠٠٤، ل ١١٧-١١٨. بۆ نەبوونی پشتیوانی نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەتی کوردی لە قۆناغی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بڕوانە: باجەلان ٢٠١٩.

٣٦ لە ماکمیلان، ٢٠٠٢: ٤٥٨، لە یادەوەرییەکانی لۆید جۆرج وەرگیراوە.

٣٧ هێلمڕایچ ١٩٧٤

کاریگەری لەسەر تێڕوانینی لایەنی ڕۆژئاوایی بەرانبەر کورد و لاوازکردی دۆزی دەوڵەتی کوردی هەبوو.٣٨

لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس(١٩١٩)دا بڕیادرا ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و یۆنان دابەش بکرێن، ئەگەرچی ئەو لایەنە دەرەکیانە پلان و بەرنامەی جیاوازی خۆیان بۆ ئەو ناوچانە هەبوو. ڕکابەریی و سروشتی پەیوەندی نێوان ئەو وڵاتانە وایکردبوو بڕیادان لەبارەی دیارکردنی ئەگەری سنووری کیانێکی سیاسی زەحمەت و قورس بێت. هەریەک لەو لایەنە دەرەکیانە کیانێکی سیاسی نوێی بۆ خۆی دەخواست بۆ وەدیهێنانی هاوکاری ئابووریی و سیاسی و جێبەجێکردنی پلانی ستراتیژی خۆیان لە ناوچەکە. دەسەڵات و کاریگەری وڵاتانی ئەورووپی بەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لاواز و سنووردداربوو، جگەلە باشووری دەوڵەتی عوسمانی نەبێت، کە ویلایەتی موسڵی زۆرینە دانیشتوانی کورد دەگرێتەوە، ئەویشی جوداکربووەوە و لەژێر ئینتیدابی دەوڵەتی بەریتانی و فەڕەنسیدا بوو، دواتر هەردوو دەوڵەتی عێراق و سوریای لێ دروست بوو.

بڕگەکانی پەیمانی سیڤەر تایبەت بە گەلی کورد ئەوە دەردەخەن، ئەو بۆچونانەی لە سەدەی نۆزدە گەلی کوردی بەوە نیشان دەدا کە ئامادەی دەوڵەتی نەتەوەیی نین، تا ئێستاش لە داڕشتنی تێڕوانین وڵاتانی زلهێز، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەر زاڵبوون. ئەو پەیمانە لە ئابی ١٩٢٠ لە نێوان ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی و لایەنە براوەکانی جەنگەکە ئیمزاکرا (ئەگەرچی پەسند نەکرا)، پەیمانەکە باسی مەرجەکانی دابەشکردنی ناوچەکانی ژێر دەستی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی دەکات، ماددەکانی ٦٢-٦٤ تایبەتبوون بە بارودۆخی کورد. مێژوونووسە نەتەوەپەرستەکانی کورد هەمیشە پەیمانی سیڤەر بە زامنی شەرعی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەبینن، هەمیشە دەڵێن ئەگەر پەیمانەکە جێبەجێ بکرایە، دەوڵەتی کوردی دادەمەزرا. هەرچەندە، ئەگەر بە وردی سەیری بەڵگەنامەکەی سیڤەر بکەین، هێندەش بەدڵنیایی ئەو مافە زامن ناکات. ماددەی ٦٤ی پەیمانی سیڤەر باس لە توانای سەربەخۆبوونی کوردەکان دەکات، واتە تا چەند زەمینەسازی و ئامادەیی شارستانی و نەتەوەیی

---

٣٨ کلاین ٢٠٠٧

بۆ دروستکردنی دەوڵەت لە ئارادایە:

لەماوەی ساڵێکدا دوای جێبەجێکردنی ئەم پەیمانە، کوردەکانی ئەو ناوچانەی بەگوێرەی ماددەی ٦٢ دیارکراون، دەبێ پەنا ببەنە بەر ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان بەجۆرێک کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە ئارەزووی سەربەخۆییبوونیان لە دەوڵەتی تورکیا هەیە، ئەگەر ئەنجومەن دواتر درکی بەوەکرد کە ئەو گەلە توانای خۆبەڕێوەبردن و سەربەخۆیی هەیە، دەبێ مافی دەوڵەتبوونیان پێ بدرێت. لێرە بەدواوە، دەوڵەتی تورکیا ڕەزامەندی دەردەبڕێت بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕاسپاردەیە، هەروەها دەستبەرداری هەموو ماف و تایبەتمەندییەکی ئەو ناوچانە دەبێت.

بەریتانییەکان  لە کۆنفرانسی پاریس (١٩١٩) وازیان لە بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی هێنا بوو، هەروەها ماددەکانی پەیمانی سیڤەریش ڕاستە لەبارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بوو، بەڵام جێبەجێ نەکرا. تەنیا ناوچە کە مافی چارەنووسی پێ ڕەوابینرا، ئەگەرچی زۆر سنورداربوو، باکووری میزۆپۆتامیا بوو. لەم ناوچەیە، بەریتانییەکان بەگوێرەی بنەماکانی خاڵی ١٩ی سەرۆک ویلسن هەرێمێکی نیمچەسەربەخۆیان ساڵی ١٩١٨ بەناوی سلێمانی دامەزراند٣٩. هەرچەندە حوکمی ئەو ناوچە ئیدارییە زوو کۆتایی پێهات، کاتێ شێخ مەحمود یبەرزنجی سەرۆکی کارگێڕی ناوچەکە ڕووبەڕووی بەریتانییەکان وەستاو بەرهەڵستی کردن.

٣٩ ئێدمۆندز ١٩٧١: ٩٢، خاڵی ١٢ لە چواردە خاڵی ویلسن: «پێویستە بەشی تورکیای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئێستا دڵنیابکرێتەوە کە سەروەرییەکی پارێزراو بێت، بەڵام پێویستە ئاسایشی ژیانی نەتەوەکانی تری ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی تورکیا زامن بکرێتەوە، ئاسایشی ژیانی فەراهەم بکرێ و دەرفەتی گەشەپێدانی سەربەخۆیی بێ زەرەر و زیان فەراهەم بکرێت. هەروەها دەروازەی دەردەنیل بە بەردەوامی بکرێتەوە وەک ڕێڕەوێکی ئازاد بۆ کەشتییەکان و بازرگانی گەلان لەژێر زامنی نێونەتەوەی زامن بکرێت.

## ئەنجام

نەخشە و توێژینەوە جوگرافییەکان ڕەنگدانەوەی گوتاری جیۆپۆلەتیکە سەرەکییەکانن، لە سەدەی نۆزدەش لەگەڵ گوتاری ڕۆژهەڵاتناسی تێکەڵکران ٤٠. لە گوتاری ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەدا، شوناسی نەتەوەیی لەڕووی جوگرافیی و هەرێمییەوە ئاماژەی پێ دەدرا، کە بنەمای شوناسی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم بوو لە سەدەی نۆزدە. ئەو پۆلێنە جوگرافییانە بۆ پۆلێن و دابەشکردنی گەلان و تایبەتمەندییە نەتەوەیی و زمانەوانییەکانیان بەکاردەهێنران. وایلێهات ئەو جۆرە پۆلینکردنانە گرینگییەکی بەرچاوی، نەک تەنیا لە ئەورووپا، بەڵکو لە تەواوی جیهاندا لە لێکۆڵینەوە و نەخشەکێشانی ناسیۆنالیزمیدا بینی. لەم ڕووەوە، ئەو نەخشە ئێتنۆگرافییانەی بەدەستی گەڕیدە و جوگرافیناسە ئەورووپیەکان کێشراون نمونەی بەرچاوی ئەم جۆرە بیرکردنەوانەن.

بیرۆکەی شوناسی نەتەوەیی بە گوێرەی ڕێبازی سیاسی جوگرافی ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی لە پێشکەوتن و گەشەسەندنی شوناسی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەوە بینی ٤١، بۆ گەیشتن بە ئاستی شارستانیی ئەورووپییەکان. ئەو جۆرە تێڕوانینانە ڕەگی قووڵی داکوتا لە داڕشتنی جوگرافیای سیاسی و نەخشەسازیی ئەفسەر و جوگرافیناسە کۆلۆنیالیزمەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست.

گێڕانەوە و سەربوردەی گەڕیدە ئەورووپییەکان ڕەنگدانەوەی بەها و تێڕوانینی گەڕیدە و نوێنەری ئەو وڵاتانە بوون، کە لە کۆتاییدا بوون بە بڕیار لەسەر چارەنووسی داهاتوی سیاسی ئەو ناوچانە. بەگوێرەی ڕاپۆرت و گێڕانەوەی گەڕیدەکان، لە ڕوانگەی ڕۆژهەڵاتناسییانەی جیهان، گەلانی غەیرە ئەورووپی دواکەوتوو و ناشارستانین. تێگەشتنی شارستانییانەی ناسیۆنالیزم ئەوەیە کە هۆشیاری هەستی نەتەوەیی، مێژوو، زمان و کولتووری هاوبەش بە دیارخەری ئامادەسازی و پێوەری دانپێدانانی نەتەوەیی دادەنرێن لەلایەن ئەو گەڕیدە و ئەفسەرە ئەورووپیانەی تەماشای کورد و نەتەوەکانی تری ناوچەکەیان دەکرد.

---

٤٠ کولکاسی ٢٠٠٦: ٦٨٠

٤١ لاوفلین ١٩٨٦: ٣٢١

ئەورووپییەکان بەگوێرەی بەها سیاسیی و کولتوورییەکانی خۆیان گەلانی ئەو ناوچانەیان هەڵدەسەنگاند، ئەگەرچی تاڕادەیەک زیاتر بە ئەرێنی باسی مەسیحی و کۆمەڵگە غەیرە موسڵمانەکانیان دەکرد، نەوەک گەلێکی موسڵمانی وەکو کورد.

ئەو گەڕان و توێژینەوە و ڕاپۆرتانەی لە کوردستان لە ڕێگەی گەڕیدە ئەورووپییەکان و ئەفسەرە حکومییەکان کران، چ لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، یان لە کاتی جەنگەکە و دواتر، بوون بە بنەمای دارِشتنی سیاسەتی ئەو وڵاتانە بەرانبەر کورد. شایەنی باسە، هەموو ئەو توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژیی و زانیارییە جوگرافییانەی لەبارەی کوردەوە خرانەڕوو، بوونە بەردی بناغەی مێژوونووسین و زانستی جوگرافی نەتەوەیی کوردی لە کۆتایی دەیەکانی سەدەی بیست. لەسەر ئەم بنەمایە، نەتەوەپەرستە کوردەکان ئەو نەخشانەیان بەکارهێنا و نەخشەی تریان لەسەر دروستکردەوە بۆ ئاماژەپێکردن بە نیشتیمانی کورد و سنوورەکانی.

لەئێستادا نەخشەی کوردستانی گەورە، کە لە دەریای سپی ناوەڕاست درێژدەبێتەوە تاوەکو کەنداوی فارس، کە لەلایەن نەتەوەپەرستانی کورد کێشراوە، بە سومبلی سەرەکی شوناسی نەتەوەیی دادەنرێت، هەروەها بەگشتی لەلایەن کوردەکانەوە ئێستا بەکاردەهێنرێت. زۆرێک لە کوردەکان، چ لە کوردستان یان لە دەرەوەی کوردستان، لە داهاتوو، یان هەرکاتێک بارودۆخ گونجاو بێ، خواستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیی کوردی دەکەن.

کورد بەدرێژایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیست و یەک سوودی زۆری لە دەرفەتە هەرێمیی و نێونەتەوەییەکانەوە بینیوە، بۆ نمونە پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ مافی خۆبەڕێوەبردنی گەلی کورد لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدڕاڵ هەتا ئێستاش بەردەوامە.

## لیستی سەرچاوەکان

Agnew, John (1994), 'The Territorial Trap: The Geographical Assumptions of International Relations Theory', Review of International Political Economy 1 (1): 53-80.

Alsancakli, Sacha (2017), 'Matrimonial Alliances and the Transmission of Dynastic Power in Kurdistan: The Case of the Diyādīnids of Bidlīs in the Fifteenth to Seventeenth Centuries', Eurasian Studies 15: 222- 49.

Ateş, Sabri (2013), Ottoman-Iranian Borderlands: Making a Boundary, 1843-1914, New York: Cambridge University Press.

Bajalan, Djene Rhys (2019), 'The First World War, the End of the Ottoman Empire, and Question of Kurdish Statehood: A 'Missed' Opportunity?', Ethnopolitics, 18 (1): 13-28.

Bozarslan, H. (2003), 'Kurdish Nationalism in Turkey: From Tacit Contract to Rebellion', in: A. Vali (ed.), Essays on the Origins of Kurdish Nationalism, 163-90, California: Mazda.

Breuilly, John (1993), Nationalism and the State, Manchester: Manchester University Press.

Crampton, Jeremy W. and Krygier, J. (2006), 'An Introduction to Critical Cartography', ACME: An International E-Journal for Critical Geographies, 4 (1): 11-33.

Culcasi, Karen (2006), 'Cartographically Constructing Kurdistan within Geopolitical and Orientalist Discourses', Political Geography, 25 (6): 680-706.

Diamond, Larry and Marc F. Plattner (eds.) (1994), Nationalism, Ethnic Conflict and Democracy, Baltimore: John Hopkins University Press.

Edmonds, C. J. (1971), 'Kurdish Nationalism', Journal of Contemporary History, 6 (1): 87-106.

UK House of Commons, Foreign Affairs Committee (2018), 'Kurdish Aspirations and the Interests of the UK', Third Report of Session 2017-19.

Freeden, Michael (1998), Ideologies and Political Theory: A Conceptual Approach, Oxford: Clarendon.

Press. Harley, J. B. (1989), 'Deconstructing the Map', Cartographica, 26 (2):

1-20.

Harley, J. B. and David Woodward (eds.) (1987), The History of Cartography, Volume 1: Cartography in Prehistoric, Ancient, and Medieval Europe and the Mediterranean, Chicago: University of Chicago Press.

Helmreich, Paul C. (1974), From Paris to Sèvres: The Partition of the Ottoman Empire at the Peace Conference of 1979-1920, Columbus: Ohio State University Press.

House, Edward Mandell and Seymour, Charles (eds.) (1921), What Really Happened at Paris, the Story of the Peace Conference 1918-19 / by American Delegates. London.

Klein, Janet (2007), 'Kurdish Nationalists and Non-Nationalist Kurdists: Rethinking Minority Nationalism and the Dissolution of the Ottoman Empire, 1908-9', Nations and Nationalism, 13 (1): 135- 153.

Knight, David B. (1985), 'Territory and People or People and Territory? Thoughts on Postcolonial SelfDetermination', International Political Science Review, 6 (2): 248-272.

Kurdish Delegation to the Peace Conference. (1919), Memorandum on the Claims of the Kurd People, Prepared by General Şerif Pasha, Paris.

Laughlin, Jim Mac (1986), 'The Political Geography of 'Nation-Building and Nationalism in Social Sciences: Structural vs. Dialectical Accounts', Political Geography Quarterly, 5 (4): 299-329.

Macmillan, M. (2002), Peacemakers: The Paris Peace Conference of 1919 and its Attempt to End War, London: John Murray.

Maunsell, F. R. (1894), 'Kurdistan', Geographic Journal, 3 (2): 81-92.

Maunsell, F. R. (1890), 'Reconnaissances in Mesopotamia, Kurdistan, North-West Persia, and Luristan from April to October 1888', Vol 2, Simla: Intelligence Branch, Quarter Master General's Dept, [114v] (233/312).

McDowall, David (1996), A Modern History of the Kurds. London: I. B. Tauris.

McMurray, Jonathan S. (2001), Distant Ties: Germany, the Ottoman Empire, and the Construction of the Baghdad Railway, Westport: Praeger Publishers.

Meiselas, Susan, (2008), Kurdistan: In the Shadow of History, Second Ed., Chicago: University of Chicago Press.





Mignan, Robert D. (1839), Winter Journey Through Russia, the Caucasian Alps and Georgia: Thence Across Mount Zagros by the Pass of Xenophon and the Ten Thousand Greeks, into Koordistaun, 2 Vols, London: Richard Bentley.

Millingen, Fredrick (1870), Wild Life Among the Koords, London: Hurst and Blackett.

Muhammad, Qadir Muhammad (2017). 'Kurds and Kurdistan in the View of British Travellers in the Nineteenth Century', Doctoral Thesis, University of Leicester.

O'Shea, Maria. T. (2004), Trapped Between the Map and Reality: Geography and Perceptions of Kurdistan, London: Routledge.

Özoğlu, Hakan (2004), Kurdish Notables and the Ottoman State: Evolving Identities, Competing Loyalties, and Shifting Boundaries, Albany: State University of New York Press.

Rawlinson, H.C. (1839), 'Notes on a March from Zohab, at the Foot of Zagros, along the Mountains of Khuzistan (Susiana), and from Thence Through the Province of Luristan to Kirmanshah, in the Year 1836', Journal of the Royal Geographical Society of London, 9: 26-116.

Rich, Claudius James (1836), Narrative of a Residence in Koordistan, and on the Site of Ancient Nineveh, 2 Vols, Cambridge: Cambridge University Press.

Said, Edward. (1994), Culture and Imperialism, London: Vintage. Sidaway, James D. (2000), 'Postcolonial Geographies: An Exploratory Essay', Progress in Human Geography, 24 (4): 591-612.

Smith, Anthony D. (2004), The Antiquity of Nations, Oxford: Polity. Sykes, M. (1904). Dar-ul-Islam, London: Draft Publishers Ltd.

Tilly, Charles (1994), 'States and Nationalism in Europe 1492-1992', Theory and Society, 23 (1): 131-146.

Tyner, Judith A. (1982), 'Persuasive Cartography', Journal of Geography, 82 (4): 140-144.

Van Bruinessen, Martin (1992), Agha, Shaikh and the State: The Social and Political Structures of Kurdistan, New Jersey: Zed.

Wintle, Michael (1999), 'Renaissance Maps and the Construction of the Idea of Europe', Journal of Historical Geography, 25 (2): 137-165.



د. یاسین تەها

# ناوچە کوردنشینەکان لە سەدەکانی نێوەڕاستی ئیسلامیدا



کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی و لەنێویشیاندا سەردەمی عەباسی (١٣٢_٦٥٦ک/٧٥٠_ ١٢٥٨ز)، لەناو گەلانی تری موسوڵمان خاوەن تایبەتمەندیی خۆی بووە(١)، لە دەق و سەرچاوە مێژووییە بنەڕەتییەکاندا هەر بەناوە نەتەوەییەکەی خۆی ئاماژەی بۆ کراوە و ناوی هێنراوە(٢)، بەڵام سنووری ناوچەکانی نیشتەجێبوونی ئەم گەلە و هەرێمەکانی بڵاوبوونەوەی لە هەڵکشان و داکشان و گۆڕانی بەردەوامدا بووە و جێگیر نەبووە (٣). بەشێوەیەکی گشتی کورد نیشتەجێی چیا بوون، نیشتمانی ڕەسەنی ئەم گەلەش بەدروستی و دیاریکراوی بەرزاییەکانی بەشی سەرەوە و ڕۆژهەڵاتی «عێراقی عەرەبی»(٤) بووە(٥). لە سەرچاوە مێژووییەکانیشدا ئەم ناوچەیەی کوردی تێدا ژیاوە چەند ناوێکی هەیە؛ «دار الأكراد»(٦)، «جبال الأكراد»(٧)، «مملكة الجبال»(٨)، سەرجەم ئەمانەش ئاماژە بۆ چیا دەکەن، لە هەندێک گەشتنامەشدا هەر بە «کوهستان» ناوی هاتووە، ئەویش هەر بە مانای چیایە(٩).

دەوڵەتی سەلجوقییە تورکەکان، لە ناوەڕاستی سەدەی (٦ک/١٢ز) زاراوەی «کوردستان» یان کردە فەرمی، ئەویش پاش ئەوەی بەشێک لە ناوچە کوردییەکانی

---

١ فضل الله العمري، مسالك الابصار في ممالك الأمصار، تحقيق كامل سلمان الجبوري (بيروت: دار الكتب العلمية، د.ت)، ج٣، ص ١٩٧.

٢ لەم بارەیەوە بڕوانە: حكيم خوشناو، الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة المسلمين، (دمشق: دار الزمان، ٢٠٠٩)؛ زبير بلال إسماعيل، الأكراد في كتب البلدانيين والرحالة المسلمين في العصور الوسطى (أربيل: وزارة الثقافة، ١٩٩٩م).

٣ محمد أمين زكي، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، ترجمه، محمد علي عوني، (مصر: د.م، ١٩٦١م)، ص ٣_٤.

٤ عێراقی عەرەبی: زاراوەیەکە بەو ناوچانە وتراوە، کە کەوتوونەتە نێوان شاری تکریت و عەبادانی ئێران. بڕوانە: (مستوفی قزوینی: نزهة القلوب (تهران: دنیای کتاب، ١٩٦٣)، ص ٣٣؛ الأصطخري، المسالك والممالك (القاهرة: الهيئة العامة لقصور الثقافة، ٢٠١٠م)، ص ٥٦).

٥ جمال رشيد أحمد وفوزي رشيد، تاريخ الكرد القديم (أربيل: جامعة صلاح الدين، ١٩٩٠م)، ص ١٢.

٦ اليعقوبي، البلدان (ليدن: مطبعة بريل، ١٨٦٠م)، ص ٧.

٧ ابن خلدون، المقدمة، تحقيق، عبد الله محمد الدرويش (دمشق: دار يعربا، ٢٠٠٤م)، ج ١، ص ١٦٥؛ القلقشندي، صبح الأعشى في صناعة الإنشا (بيروت: دار الكتب العلمية، ١٩٨٧) ج ٤ ص ٣٧٣.

٨ العمري، مسالك الأبصار، ج ٣ ص ١٩٥ _ ١٩٧.

٩ ناصر خسرو، سفرنامة، ترجمه يحى الخشاب (القاهرة: الهيئة المصرية العامة للكتاب، ٢٠١٠م)، ص ١٧٢.

ڕۆژئاوای هەرێمی چیایان بەو ناوەوە لە دەوروبەری «قرمسین» ناونا (١٠)، کە دەکاتە کرماشانی ئێستا. ئەو هەرێمە لە ١٦ ویلایەت پێکدەهات، پایتەختەکەشی قەڵای بەهار بووە لە ڕۆژهەڵاتی هەمەدان(١١)، هەر لەو دەوروبەرەش چەند ناوچەیەکی تری کوردنشیشی دەگرتەوە لە چەشنی دەینەوەر(١٢)، بەم جۆرەش کوردستان وەک ناوی هەرێمێکی نیمچە سەربەخۆی سەر بە سەلجوقییەکان دەرکەوت(١٣). سەرباری ئەمەش هێشتا دیاریکردنی سنووری کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاست، کارێکی ئاسان و ورد نییە، چونکە ئەوکات سنووری جێگیر نەبووە و دەسەڵاتی میر و فەرمانڕەوا کوردەکانیش هاوتەریب لەگەڵ بارگۆڕانەکانی دەوروبەر لە هەڵکشان و داکشاندا بوون.

بەگەڕانەوەش بۆ کۆمەڵێک سەرچاوەی دێرین و توێژینەوەی نوێ(١٤)، دەکرێت ناوچە کوردنشینەکانی سەردەمی عەباسی بە چەند هەرێمێک

---

١٠ قرمسین (کرمانشاە): شارێکە سەر بە هەرێمی چیا، نزیکە لە حەلوان و هەمەدان، خەڵکەکەی تێکەڵەیەک بوون لە فارس و کورد و بە زۆرینەش کورد بوون. بڕوانە: اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ص ٤٦؛ الحموي، معجم البلدان (بيروت: دار صادر، ١٩٧٧م)، ج٤ ص ٣٣٠.

١١ هەمەدان: گەورەترین شاری هەرێمی چیا بووە، لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامیدا. بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، تحقيق كمال حسن مرعي (بيروت: المكتبة العصرية، ٢٠٠٥م)، ج٢ ص١٩٧.

١٢ دینەوەر: یەکێک بووە لە شارەکانی هەرێمی چیا و نزیک لە قرمسین (کرمانشاە) ـە، لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچیدا پایتەختی میرنشینی حەسنەویهی بووە. بڕوانە: مسكويه، تجارب الأمم وتعاقب الهمم، تحقيق، أبو قاسم امامي، (طهران، دار سروش،٢٠٠٠، ج٤، ص ٤٩٦؛ خەڵکەکەی تێکەڵەیەک بوون لە کورد و عەرەب و عەجەم، لە شاڵاوی مەغۆلدا (٦٥٦ ک/١٢٥٨ ز.) وێران بووە. بڕوانە: محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی، مێژووی حەسنەویهی و عەیاری (بەغدا: دار الحرية، ١٩٩٦م، ص ١١_١٢).

١٣ قزويني، نزهة القلوب، ص ٣٣ _٣٨؛ أرشاك بولاديان، الأكراد في حقبة الخلافة العباسية في القرنين ١٠ و ١١ م، مترجم، (بيروت: دار الفارابي، ٢٠١٣م)، ص ٤٣؛ كي لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، مترجم، (بيروت: مؤسسة الرسالة،١٩٨٥م)، ص ٢٢٧.

١٤ الفارقي، تاريخ الفارقي _ الدولة المروانية، تحقيق بدوي عبد اللطيف عوض، (القاهرة: المطابع الأميرية، ١٩٥٩م)، ص ٤٩؛ ماركوبولو، رحلات ماركوبولو، ترجمه عبد العزيز جاويد (القاهرة: الهيئة المصرية العامة للكتاب، ط٢، ١٩٩٥م)، ج١ ص ٦٩؛ شرفخان البدليسي، الشرفنامة في تاريخ الدول والأمارات الكردية، ترجمة ملا جميل بندي الروزبياني (بغداد: مطبعة النجاح، ١٩٥٣م)، ص ٢١؛ أوليا جلبي، رحلة أوليا جلبي في كردستان ١٠٦٥ ە/١٦٥٥م، ترجمة رشيد فندي (دهوك: مطبعة خاني، ٢٠٠٨م)، ص ٩٩؛ زرار صديق: الكرد في العصر العباسي حتى مجيء البويهيين (١٣٢_ ٣٣٤ هـ)، رساله ماجستير، قسم التاريخ، كلية الآداب، جامعة صلاح الدين،١٩٩٤م، ص ١٥_٤٣.

دیاری بکرێت، ئەوانیش بریتین لە: هەرێمی چیا یان «مملكة الجبال»(١٥)، کە کوردستانی سەلجوقیش لەخۆدەگرێت، لوڕستانی گەورە و بچووک(١٦)، هەرێمی «أذربيجان»(١٧)، هەرێمی ئەرمینیا و ئاران(١٨)، هەرێمی جزیرە(١٩)، هەرێمی شارەزوور(٢٠)، لەگەڵ شاری «أربل»، کە هەولێری ئێستا دەکات (٢١).

لە دەرەوەی ئەم ناوچانەش کە زۆرینەیەکی کوردی تێدا ژیاوە، خێزانە کوردەکان لە چەند ناوچەیەکی دیکەی دەوروبەری چیاکان بڵاوبوون لە چەشنی هەرێمی فارس(٢٢) ، ئەم هەرێمە چەند کۆمەڵە کوردێکی لەخۆگرتووە (٢٣)، لەم میانەیەشدا گەڕیدەکان باس لەوە دەکەن ١٠٠ هەوار و دەوروبەری ٥٠٠ هەزار ماڵی کورد لە هەرێمی فارس ژیاون(٢٤). هەر لە تەنیشتنی هەرێمی فارسیشدا

---

١٥ العمري، مسالك الأبصار، ج٣ ص ١٩٥_١٩٧.

١٦ المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ص ٢٤٤؛ الحموی، معجم البلدان، ج٥، ص ١٦، ٢٥؛ ابن حوقل، صورة الأرض (بيروت: دار صادر، ط٢، د.ت)، ص ٣١٥ و ص ٣١٨؛ أبو الفدا، تقويم البلدان (بيروت: دار صادر، د.ت)، ص ٣١٢.

١٧ أذربيجان: هەرێمێکە لە نێوان چیا وولاتی ئاران و لە بەشی ڕۆژئاوای هۆزە کوردییەکان نیشتەجێ بوون. بڕوانە: المقدسي، أحسن التقاسيم (القاهرة: مكتبة مدبولي، ١٩٩١م)، ٣٧٧؛ الحموي، معجم البلدان، ج١، ص ١٢٨.

١٨ ئەرمینیا: هەرێمێکە لە نێوان ڕۆژئاوای دەریای خەزەر وسنووری ئەرمەن و جزیرە، هاوسنووری وڵاتی ڕۆم بووە، زۆرینەی دانیشتوانەکەی کورد بوون و سنووری قەڵەمڕەویی میرنشینی شەدادی کوردی بووە (٣٤٠_٤٦٨ ک /٩٥١_ ١٠٧٥ ز). بڕوانە: (ابن حوقل، صورة الأرض،ج٢، ص ٣٣٢_٣٣٧؛ أبو الفدا، تقويم البلدان، ص ٣٨٦).

١٩ هەرێمی جزیرە: لە نێوان دیجلە و فوراتەوە لە تورکیای ئێستا دەست پێ دەکات تا دەشتاییەکانی بەغدا، گرنگترین شارەکانی بریتین لە: حەڕان، ڕوها، ڕەقە، سەرێ کانی، نسێبین، سنجار، خابور، ماردین، ئامەد، میافارقین، موسڵ. بڕوانە: الأصطخري، المسالك والممالك، ٥٢؛ ابن حوقل، صورة الأرض، ج١، ص ٢٠٧_٢٢٠؛ أوليا جلبي، رحلة أوليا جلبي، ص ٧٦.

٢٠ شارەزوور: دەڤەرێکی فراوانی نیمچە سەربەخۆ بووە، دەکەوێتە نێوان هەولێر و هەمەدان لە نزیک عێراق. بڕوانە: الاصطخري، المسالك والممالك، ١١٨؛ الحموي، معجم البلدان،٣، ٣٧٤ _٣٧٥.

٢١ أربل: شارێکی کوردنشینە سەردەمێک بە شێک بووە لە موسڵ و جزیرە، بەڵام لە کۆتاییەکانی قەڵەمڕەویی عەباسی جۆرێک لە سەربەخۆیی وەرگرتووە. بڕوانە: الحموي، معجم البلدان، ج١، ص ١٣٩.

٢٢ هەرێمی فارس: هاوسنوری کرمان وخوزستان وئەسفەهانە، لە پێنج ناوچەی جیا پێک هاتووە کە بریتین لە: فەسا، دارا ئەبجەرد، ئەستەخر، سابور، ئەردەشیر و ئەرجان. بڕوانە: (الأصطخري، المسالك والممالك، ص ٩٦_ ٩٨).

٢٣ ابن خردادبة، المسالك والممالك، ٥١؛ المقدسي، أحسن التقاسيم، ص ٤٤٦.

٢٤ الأصطخري، المسالك والممالك، ص ٦٨؛ ابن حوقل، صورة الأرض، ج٢، ص ٢٦٩_٢٧١.

کورد لە خوزستان(٢٥) بڵاوبوون و ڕۆڵی سەرەکیشیان لە ڕووداوەکانی هەرێمەکە هەبووە(٢٦)، یەکێکیش بوون لە پێکهێنەرەکانی هەرێمی خوراسان لە ڕۆژهەڵات(٢٧).

پەیوەندیی کوردیش بە وڵاتی شامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی زۆر کۆن کە سەردەمی کۆچ و ڕەوی گەلانی هیندۆ ئەوروپییە، لەم پانتاییەشدا گەلانی باپیرانی کورد (خوری و میتانییەکان) ژیاون و کۆچ و ڕەویان کردووە(٢٨)، هەندێک لە سەرچاوە مێژوویی و «بلداني» یەکانیش وڵاتی شامیان بە ناوچەی بڵاوبوونەوەی کورد ئەژمار کردووە(٢٩).  لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی بەشێک لە باکووری شامی دراوسێی جزیرە (ڕۆژئاوای کوردستانی ئێستا) سەر بە سنووری قەڵەمڕەویی دەوڵەتی دۆستەکی بوون، کە زیاتر لە سەدەیەک حوکمڕانی ناوچەکەی کردووە (٣٧٢_٤٧٨ ک/٩٨٢_١٠٨٦ ز) (٣٠).

لە سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیشدا لە میسر، ناوچەکانی شام و جزیرە لە نێوان ساڵانی (٥٧٠_٥٧٩ک/١١٧٤_١١٨٣ز) چوونەتە نێو سنوری حوکمڕانی دەوڵەتەکە(٣١)، بەوهۆیەشەوە کوردێکی زۆر لە شام و دیمەشق و حەلەب و شارەکانی تری سوریا نیشتەجێ بوون(٣٢) و بە هەمیشەیی ماونەتەوە(٣٣). کوردەکانی نیشتەجێی دیمەشق بەشدارییەکی چالاکیان لە هەڵمەتەکانی سوپای

---

٢٥ خوزستان: هەرێمێکە لە نێوان بەسرە وفارس و لە چەند ناوچەیەک پێک دێت: ئیزج، ڕامەهورمز، تەستر، جندیسابور، عەسکەر مەکرەم. بڕوانە: (أبو الفدا، تقويم البلدان، ص ٣١٢؛ القلقشندي، صبح الأعشى، ج٤ ص ٣٤٠).

٢٦ الطبري، تاريخ الرسل والملوك، تحقيق محمد أبو الفضل (القاهرة: دار المعارف، ١٩٦٧) ج٤، ص ١٧٨.

٢٧ الأصطخري، المسالك والممالك، ص ١٥٥؛ ابن حوقل النصيبي، صورة الأرض، ج٢، ص ٤٤٣.

٢٨ مسعود البوداك، التهميش الممنهج للوجود الكردي تاريخيا في جغرافية شعوب آريا القديمة، مدارات كرد، https://bit.ly/٢KFQvk٣ ، النشر: (١٣/ ١/ ٢٠١٨)، الزيارة: (٢٠/٦/٢٠٢٢).

٢٩ البكري، المسالك والممالك (بيروت: دار الغرب الإسلامي، ١٩٩٢)، ج١، ص ٣٤٤؛ ابن عربشاه، عجائب المقدور في أخبار تيمور (الهند: مطبعة كلكتا، ١٨١٧م)، ص ٢٤٥.

٣٠ عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، (أربيل: دار ئاراس، ٢٠٠١)، ج٢، ص ١٣.

٣١ محمد سهيل طقوش، تاريخ الأيوبيين في مصر وبلاد الشام والجزيرة (دمشق: دار النفائس، ٢٠٠٨)، ص ٥١_٨٣.

٣٢ علي صالح، الوجود الكردي في دمشق و دور الوجيه علي آغا زلفو، مجلة «Kurdyet»، العدد ٥ (٢٠٢٢): ص ٧٤_٧٦

٣٣ الصويركي، تاريخ الأكراد، ص ١١٧_١١٨، ١٥٤.

سەلاحەدیندا دژی خاچ دروشمەکان کردووە و تەرمی هەندێ فەرماندەشیان هەر لەو شارە نێژراوە، هەر لەوێشەوە ڕوویان کردووەتە چیای قاسیون و ناوچەکانی تری شام و لەگەڵ عەرەبدا تێکەڵ بوون(٣٤)، هێندەش ژمارەیان زۆر بووە لەگەڵ پێکهاتەکانی تر چوونەتە ململانێ و پێکدادانی گەورە درێژ خایەنەوە، (٣٥) لە کەناری دەریای ناوەڕاستیش قەڵاو پێگەیان هەبووە(٣٦).

لە پاش هەڵکشانی پێگەی بنەماڵەی ئەیوبی ڕەوادی لە میسر (٣٧) کوردەکان ئامادەیی و چالاکی زۆریان لەم وڵاتە هەبووە، ژمارەیەکی زۆریشیان لە قاهیرە و شارەکانی تری میسر نیشتەجێ بوون (٣٨). لە دەورانی سوڵتان سەلاحەدینی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی (٥٦٤_٥٨٩ک/١١٦٩_١١٩٣ز)، ژمارەیەکی زۆری کورد چوونەتە میسر، هەندێک لەو کوردانەش لە کۆشکی فەرمانڕەوایی و لە پایەکانی دەوڵەتی سەلاحەدین کاریان کردووە، لەوێش بوونەتە خاوەن پێگە(٣٩). حوکمڕانی ئەیوبییەکان لە میسر و دەوروبەری تا ساڵی ٦٤٨ک/ ١٢٤٩ز، درێژەی کێشاوە، لەم ماوەیەشدا پەیوەندی و هاتوچۆی کورد بەرەو ئەو وڵاتە بەردەوام بووە(٤٠)، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆر لە فێرخوازانی کورد ڕوویان لە زانستگای ئەزهەری میسری کردووە، کە ڕووگەی فێرخوازانی زانستە شەرعییەکانی ناوچەکە بووە، بەجۆرێک لەم دامەزراوەیە کوردەکان بوونەتە خاوەن «رواق

34 Anita Burdett, Records of the Kurds: Territory, Revolt and Nationalism, 1831–1979 (London: British Documentary Sources, 2015), P 483.

٣٥ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، تحقيق، عبدالسلام تدمري (بيروت: دار الكتاب العربي، ١٩٩٧)، ج١٠، ص ١١.

٣٦ طقوش، تاريخ الأيوبيين، ص ٤١٣.

٣٧ ابن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، تحقيق، جمال الدين الشيال، (مصر: المطبعة الأميرية، ١٩٥٧)، ج١، ص ٣؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة (مصر: وزارة الثقافة، د.ت)، ج٦، ص ٣_٤.

٣٨ محمد علي الصويركي، تاريخ الأكراد في بلاد الشام ومصر (عمان: مديرية الثقافة للأمانة العامة، ٢٠١٠)، ص ٢٠١_٢٠٢.

٣٩ عبداللطيف حمزة، الحركة الفكرية في مصر في العهدين الأيوبي والمملوكي، (القاهرة: دار الفكر العربي، د.ت)، ١٠٧؛ طه رجب، «ڕۆڵی کورد لە پەرەپێدانی مەزهەبی شافیعی لە میسر و شام لە سەردەمی ئەیوبییدا، ٥٧٠_٦٥٨ک/ ١١٧٠_١٢٦٠ز»، نامەی ماستەر، بەشی مێژوو، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی ڕاپەڕین، ٢٠١٧، ص ١٦٨؛ نظير حسان سعداوي، جيش مصر في عصر صلاح الدين (القاهرة: مكتبة النهضة، ١٩٥٦)، ص ٩؛ درية عوني وآخرون، الأكراد في مصر عبر العصور (مصر: د ن، ٢٠١١)، ص ٣٣_٣٧.

٤٠ الصويركي، تاريخ الأكراد، ص ٢٠٩_٢١٠؛ بڕوانە: بەشی سێیەم، ل ١٢٦_١٣٩.

الأكراد»ی تایبەت بەخۆیان(٤١). هەندێک لە توێژەرە میسرییەکانیش پێیانوایە کورد لە میسردا میوان نەبوون و پێشتریش هەر لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە گوزەریان بەسەر ئەم وڵاتەدا هەبووە. هەروەها پێیانوایە کورد لە میسر ڕەوەند نین، بەڵکو بەهۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە بوونەتە بەشێک لە تەونی فرەچەشن و فرەجۆری کۆمەڵگای میسری، ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی وڵاتەکە، کە لە بنەڕەتەوە مەکۆی کۆکردنەوەی چەندین ڕەگەز و ڕەچەڵەکی جیاوازە(٤٢).

جگە لە میسر و شام، کورد ڕوویان لە یەمەنیش کردووە، چونکە ئەویش لە نێوان ساڵانی (٥٦٩_٦٢٨ک/ ١١٧٣_١٢٣٠ز) بووەتە بەشێک لە سنوری قەڵەمڕەوی ئەیوبی لەگەڵ ئەویشدا وڵاتی حیجاز بەشێوەیەکی ڕەمزی(٤٣).

بەمپێیەش سنووری بڵاوبوونەوەی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامیدا بەشێوەیەکی سەرەکی بەم جۆرەیە؛ لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا و هەندێک ناوچەی تری دوورەدەستی هەرێمی چیا نیشتەجێ بوون، لەبەری ڕۆژئاواوە لە شامەوە هەتا میسر  پێگە و چالاکییان هەبووە و بەهۆی ئەیوبییەکانەوە ژمارەیان هەڵکشاوە، لەبەری باکووریشەوە لە جزیرە ژیاون و دراوسێی ڕۆمە بێزەنتییەکان بوون، لەبەری باشووریشەوە هاوسنوری عێراقی عەرەبی، ماوەیەکیش لەگەڵ ئەیوبییەکان خۆیان گەیاندووەتە وڵاتی یەمەن لەوپەڕی باشووری نیوە دوورگەی عەرەبی.

---

٤١  محمود زاید، الصراع على رواق الأكراد (السليمانية، مؤسسة ژين، ٢٠١٧)، ص ٦_٧

٤٢ بڕوانە: درية عوني وآخرون، الأكراد في مصر، ٩_٤٠.

٤٣ جميل محمود حرب، الحجاز واليمن في العصر الأيوبي (السعودية، تهامة للنشر، ١٩٨٥م)، ص ٢٥٥_٢٥٩؛ جمال عبدولي، اليمن فى العهد الأيوبى، دراسة فى التاريخ السياسى والإقتصادى والحضارى ( ٥٦٩ – ٦٢٨ هـ / ١١٧٤ – ١٢٣٠ م، رسالة دكتوراه، كلية العلوم الإنسانية، جامعة تونس للاداب والفنون والعلوم الإنسانية، ٢٠٠٠.

زمان کەرەستەی سەرەکی و بنچینەیی دروستبوونی ئەدەبە بە هەموو جۆرەکانییەوە (فۆلکلۆر، میللی، نووسراو)، چونکە نووسەران و شاعیران لە ڕێگەی زمانەوە بەرهەمە ئەدەبییەکان دەچنن؛ بۆیە بەبێ زمان ئەدەب بوونی نییە، بە پێچەوانەشەوە ئەدەب سەرچاوەیەکی گرنگ و بەردەوامی گەشەسەندن و پاراستنی زمانە، چونکە تۆمارێکی بەردەوام و زیندووی زمان و شێوازی ئەو قۆناغەیە. «ئەدەب و زمان توانیان پێکەوە شۆڕشێکی گەورە و ناوازە بەرپابکەن، کە هزر بە درێژایی مێژوو پەی پێنەبردبوو، ئەمەش بە زۆر و زەوەندی کتێب و دانراوەکان نا، بەڵکو بە بەرز ناساندنی پلەوپایەی مرۆڤ بە داهێنان لە ڕێگەی نووسین»(١)، چونکە سەرنج و هۆشی بیرمەندانی بە لای خۆیدا ڕاکێشا، لە نیشاندانی دەسەڵاتی ئەدەب و نووسەر وشاعیران لە تێهزرین وتێڕامان و چۆنیەتی ناساندنیان لە ڕێگەی ئەدەبەوە؛ بۆیە لە زمانەوانی نوێ دەقی ئەدەبی بۆتە کێڵگەیەکی سەرەکی توێژینەوەکان و میتۆدە ڕەخنەییە نوێیەکانی ئەدەبیش زیاتر لالە بابەتە زمانەوانییەکان دەکەنەوە، دەتوانین بڵێین لە ڕەخنەی نوێی ئەدەبیدا زمانەوانی ڕەهەند و بابەتی بنجییە، بەتایبەتیش لە ڕەخنەی بونیادگەریی و شێوازگەریی و سیمیۆلۆژیادا ... هتد، ئێمەش پێمانوایە ئەدەبییاتی کوردی گەنجینەیەکی فراوان و دەوڵەمەندە، کە خاوەنی دیرۆکێکی تاڕادەیەک کۆن و درێژە و خاوەنی هەزاران نووسەر و شاعیری زمانپاراوە، دەبینین بە چەند خەسڵەتێک دەرخەری بناغەیەکی پتەوی زمانی ستانداردی کوردییە، لێرەدا سەبارەت بە پەیوەندیی زمانی ستاندارد و ئەدەب چەند خاڵێک دەخەینە ڕوو:

١-نەبوونی زمانی ستانداردی کوردی نەبووەتە لەمپەر لەبەردەم ئەدەبییاتی کوردییمان، چونکە بەپێچەوانەوە هەموو ئەو سنوورانەی تێپەڕاندووە و دیاردەی نووسین بە فرەشێوەزاری لە ئەدەبی کوردیدا دیاردەیەکی حاشاهەڵنەگرە ئەمەش زیاتر لەچوارچێوەی بڕیاری ڕامیاری تەسکدەکرێتەوە، کە هەر میرنشینێک و شێوەزاری خۆی کردووەتە زمانی نووسین، بەڵام نووسەر و شاعیرانمان لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی هەوڵی نووسینیان بە زمانی خۆیان داوە؛ بۆیە دەقی ئەدەبیمان بە شێوەزارەکانی ( لوڕی و بۆتانی و گۆران و کرمانجی ناوەڕاست ... هتد هەیە و لە زۆربەی بەرهەمەکاندا زمانەکە لە ئاستێکی بەرزی داهێنان و شیعرییەتدا خۆی دەبینێتەوە، فەرهەنگی وشەیان دەوڵەمەندە و زۆر دوورە لە کەموکورتی و هەر شێوازێکیان هەتا ئەندازەیەک ڕێگەخۆشکەرە بۆ

به ستانداردبوون، لەبەرئەوەی زمانی نووسینی ئەدەب بە یەکێک لە ستووندە بنەڕەتییەکانی زمانی ستاندارد دادەنرێت، لە پاڵ هەموو ئەو پایە و بناغانەی بۆ ئەم بابەتە دەستنیشانکراون لەلایەن پسپۆڕانی ئەو بوارەدا» (٢) بۆ نموونە : مەولەوی لە شیعرێکدا دەڵێت:

**ئامــاوە وەهـــار، وەهـــار شــادی**
**بــۆی عەتر نەسیم غونچەی ئازادی**
**خــێڵخای خەفەت باربەنیش کەردەن**
**مەینەت ڕوونیان وە ماوای مەردەن (٣)**

زمانێکی ڕەوان و جوان و بەهێز و پڕ واتایە شاعیر بەکاریهێناوە و توانیویەتی بە زمانی خۆی بنووسێت، مەلای جزیریش لە بەشێکی شیعرێکیدا دەڵێت:

**ژ رەعنا نێرگزێن تەی مەست و خون ریز**
**زەمان بۆ عەهدێ جەنگ ئەنگیزی جەنگیز**
**تە جــانێ من دڤــێت ئەی جـــانێ عالەم**
**ژ من بستین ب لەعلێن خوی شەکەر ریز(٤)**

ئەم کۆپلە شیعرەش زمانێکی ئەدەبی بەرزی تێدا بەکارهاتووە، وشە و زاراوەکانی کوردین و شاعیر سەرکەوتووانە هەست و بیری خۆی بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو دەربڕیوە، ئەم تایبەتمەندییە لە بەشێکی هەرە زۆری ئەدەبیاتی کوردیی سەرجەم شێوەزارەکاندا بەدیدەکرێت، بەڵام ئەدەبیاتی شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست (سۆرانی) بە بەراورد بە شێوەزارەکانی تر بەرفراوانتر و دەوڵەمەندترە.

٢- دەقی ئەدەبی سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ دەستنیشانکردن و زانین و دیاریکردنی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر زمانێکدا هاتوون لە قۆناغە جیاوازەکان و هەڵاوێرکردنی سیما و ئەدگارە هەنووکەییەکانی لەگەڵ قۆناغەکانی پێش خۆی(٥)

چونکە هەر دەقێک ((هەڵگری ماکی سەردەمەکەی خۆیەتی و هەڵگری وردەکارییەکانی سیستەمی زمانی سەردەمەکەیەتی؛ هەربۆیە دەقێکی کۆن لە دەقێکی نوێ بە سیستەمە زمانییەکەی جیادەکرێتەوە، بە ئاشکرا ئەو گۆڕانانەی بەسەر زمانەکەدا هاتووە بەپێی واقیع و بارودۆخی خوڵقاندنی دەقەکە دیاردەکەوێت.)) (٦)، نالی دەڵێت:

تەبعی شەککەر باری من، کوردی ئەگەر ئینشا دەکات
ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی، لە عەمدەن وا دەکا
یا لەمەیدانی فەساحەتا بە میسلی شەهسوار
بێ تەئەمول بەو هەموو نەوعە زوبانی ڕادەکا
کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا(٧)

نالی بە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست دەستیکرد بە نووسینی شیعر، بە هەر هۆکارێکی ڕامیاریی یان خودی بێت، بناغەی زمانی ستانداردی کوردیی دارشت، چونکە دوای ئەو هەتا ئێستا ئەو شێوەزارە ئەدەبییاتی پێدەنووسرێت، بە درێژایی ئەو ماوە مێژووییە زۆرەی دوای نالی چەندین گۆڕانی هەمەجۆری لە ئاستە جیا جیاکاندا بەسەردا هاتووە، دەقی ئەدەبی بەڵگە و سەرچاوەی هەرە سەرەکی بووە لە پاراستن و دەرخستنی ئەو گۆڕان و گەشەسەندن و جیاوازییانەی بەسەر زمانی کوردیدا هاتوون لە شیعری کلسیک و شیعری نوێ و شیعری هاوچەرخدا.

٣-شێوازی هەر نووسەر و شاعیرێک کۆمەڵێک بنەما بەشداری لە ڕسکانیدا دەکەن، لادان یەکێکە لەو بنەمایانە، هەروەک جان کۆهین کردوویەتییە بنەمای تیۆرییە شیعرییەتییەکەی و پێیوایە هیچ دەقێکی ئەدەبی و شیعر بەتایبەتی لە لادان بەدەر نییە. واتە چۆن ئەدەب سوود لە زمان وەردەگرێت بۆ دروستکردنی لادان، زمانیش بە هەمان شێوە سوود لە ئەدەب وەردەگرێت بۆ گەشەکردن و بەرەوپێشبردنی خۆی.

## ناساندنی چەمکی زمان و ئەدەب:

زمان باشترین کەرەسەی دەربڕینە بە لای مرۆڤەوە بەتایبەتی بە لای ڕۆشنبیر و ئەدیبەوە، شیعریش بە حوکمی ئەوەی زیاتر بۆ هەست و سۆز و ناخی پەیاموەرگرەکەی دادەڕێژرێت و دەنووسرێت، زیاتر لە ڕێی جۆرە زمانێکی هەست دەرخەری واتادارەوە کاریگەریی خۆی بەسەر خوێنەرانی ڕادەگەیەنێت. هەروەها زمان بۆ شیعر کرۆک و ناخە، یان جلوبەرگە بەهۆیەوە خۆی دەڕازێنێتەوە و سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت؛ بۆیە لە فۆرمی شیعریدا زمان گرنگیی تایبەتیی خۆی هەیە.

سادەترین پێناسەی ئەدەب زمانە، چونکە باشترین کەرەسەکانی ڕازاندنەوەی بەرهەمی ئەدەبی زمانە، شیعریش وەک بەشێکی زۆر گرنگی ئەدەب ڕاستەوخۆ بە




زمان خۆی دەڕازێنێتەوە. هەروەها سادەترین پێناسەی ئەدەب دەربڕینێکی جوانە لەڕێی هەڵبژاردنی زمانێکی کاریگەر بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بە پەیاموەرگری دەقەکەی. لەم حاڵەتەدا دەقنووس وەک پەیامنێرێک هەوڵدەدات کەرەستەی لەبار هەڵبژێرێت بۆ ڕاگەیاندنی بیر و بۆچوونەکانی لەنێو دەقەکەیدا ئەویش زمانە، کەوا بە بنەمایەکی سەرەکیی ئەدەب دادەنرێت.

پێناسەی زمان لە زانستی زماندا ئەوەیە: کەرەسەیەکە بۆ دەربڕین و هۆیەکە بۆ لێکتر گەیشتن، هەروەها لەم زانستە پێناسەی زمان بەوەش دەکرێ کەوا دیاردەیەکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییە. کەواتە لەم جۆرە پێناسانە ئەرک و خەسڵەتەکانی زمان ڕوونکراوەتەوە، بەڵام لە بواری زانستی ئەدەبدا چەندین پێناسەی هەمەڕەنگ بۆ زمان کراوە، زیاتر لە بواری شیعردا جۆراوجۆریی ئەرک و خەسڵەتەکانی زمان خراونەتە ڕوو.

وەک دەوترێت «شیعر هونەرێکە شاعیر لە ڕێگای زمانەوە بە شێوازێکی ڕێک و تەکنیکی هونەری مامەڵەکردنی هونەرەوە، لە پانتایی فەرهەنگی زماندا دەستەبەری دەکات ".(٨)

هاوکێشەی نێوان شیعر و زمان کاریگەریی خۆی دەبێت لەو کاتەی شاعیر زمانێکی باڵا هەڵدەبژێرێ بۆ نواندنی کاریگەریی خۆی بەسەر پەیاموەرگرەکەیدا، جیاوازیی خۆی هەیە لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی خەڵکیدا، چونکە « شاعیر بە زمانێکی زۆر باڵا و پڕ لە دەسەڵات بۆ بابەت و ناوەرۆک دەڕوانێت «. زمان وەک دیاردەیەکی مرۆڤایەتی لە گۆڕاندایە بە پێی ڕۆژگاری ئەدەبی هەندێ وشەی تازەتر دروستدەبێت، یان هەندێ وشە سواو و بێ کەڵک دەبێت، ئەم جۆرە دیاردە زمانەوانییە زیاتر لە نێو هەردوو جۆری شیعری کلاسیکی و شیعری نوێ بەرچاودەکەوێت.

**پەیوەندیی زمان و ئەدەب:**

زمان ئامرازی سەرەکی گەیاندن و لێکتێگەیشتنە و بنەما و کۆڵەکەی بنەڕەتی نووسینی ئەدەبیات و بەرهەمە مرۆڤایەتییەکانە، بەپێچەوانەوە ئەدەبیاتیش بووەتە سەرچاوە و بەڵگەنامەیەکی دروست و زانستی لە پاراستن و هێشتنەوە و دەرخستنی چەندین دیوی شاراوەی زمان، چونکە کاتێک ئەدەب بەپێی قۆناغ و سەردەمی نووسین کۆمەڵێک تایبەتمەندی و ئەدگار لەخۆدەگرێت وردە وردە گۆڕانی بەسەردادێت، ئەوا

یەکێک لە بنەڕەتەکانی ئەو گۆڕانە زمانە؛ بۆیە چەندین وشە و زاراوە هەن لەڕووی داڕشتن و چەمکی واتایی کەم تا زۆر بەر ئەو گۆڕانکارییانە دەکەون، بەمەش زمانی قۆناغێک لە زمانی قۆناغێکی تر جیاوازتر دەبێت.

هەموو هونەرێکی ئەدەبی بە زمان دروستدەکرێت، جیاکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی باڵا و لاواز، بە واتا پۆلێنبەندییە ئەدەبییەکان، چ لە ڕوانگەی ژانرەکانەوە بێت، یان لەناو یەک ژانری ئەدەبیدا بەهۆی زمانەوە ئەنجامدەدرێت، هەروەها بەهۆی ئەدەب و بەکارهێنانە ئەدەبییەکانی زمانێکەوە دەکرێت زمانی ستانداردی نەتەوەیەک دروستبکرێت، چونکە زمانی نووسین دەبێت بە زمانی ستاندارد، کولتووری نووسراو لەناو زۆربەی میللەتاندا ئەگەر هەبووبێت ئەدەب بووە بە (شیعر و پەخشان)ەوە، کاتێک ئەو ئەدەبە توانیویەتی ڕەگێکی قووڵی هەبێت و کاریگەریی لەسەر خوێندەواران دروستکردبێت، ئەوە بووەتە بنەما بۆ زمانی یەکگرتوو، بۆ نموونە زمانی ستانداردی ئینگلیزی، ئەو یاسا و دەستوورانەی لە زمانی ستانداردی ئینگلیزیدا هەن، سەرەتاکەیان بۆ ئەو ئەدەب و نووسینانە دەگەڕێتەوە، کە لە سەدەی (١٦) و (١٧)دا، لەسەر دەستی شاعیرێکی گەورەی وەکو (شکسپیر) هاتنە ناوەوە، لە ئەنجامی کاریگەریی ئەو ئەدەبییاتە بە تایبەتی شانۆگەرییە شیعرییەکانی شکسپیر لەسەر خوێندەواران و پەڕینەوەیان بۆ ناو خەڵکەکە، وایلێهات زمانی نووسینی ئەو سەردەمە ببێتە بنەمایەک بۆ زمانی یەکگرتووی ئینگلیزی.

**ئاستە جیاوازەکانی زمان و پەیوەندییان بە ئەدەبەوە:**

١-ئاستی دەنگسازی: هەموو زمانێک یاسا و ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، هەر لادانێک لەم یاسا و ڕێسایانەش کاریگەریی لەسەر ئەو مەبەست و پەیامە دەبێت، کە قسەکەر دەیەوێت بیگەیەنێت بە گوێگر، بە کەمترین ئەرک و خێراترین کات و بە زۆرترین بڕی بیر، کە ئەمانە لە کارکردنی زمان و زمانەوانیدا بنەمای سەرەکین، بەڵام بۆ شیعر و زمانی شیعر، ئەگەر وەک زمانی ئاسایی بێت، ئەوە لایەنێکی گرنگی شیعربوونی وشە و دەربڕاوەکان لەدەستدەدات، بەمەش جوانی شیعرەکە لەناودەچێت، لادانی دەنگی کاتێک ڕوودەدات، کە شاعیر لە یاسا دەنگییەکان لابدات، شێوەیەک بەکاربێنێت، کە لەڕووی دەنگەوە لە زمانی ئاساییدا بەکارنایەت، کە ئەمە زۆر پێویستە بۆ پاراستنی کێشی شیعر بۆ نموونە : دیلان لە شیعری(کوننە پەپووی شەڕ)دا دەڵێت:

**پووچ تره لە داری گەننەڵ**
**پیس تره لە ڕێوی دەغەڵ (٩)**

وشەی (گەننەڵ) فۆنەتیکییانە و بەپێی گۆڤەری سلێمانی بەکارهێنراوە، چونکە لەو گۆڤەرەدا دەنگەکانی(د، ت، ە، ک) لە هەندێک جێگەی وشەدا، ئەگەر زیان بەواتای وشە نەگەیەنێت، ئەوا دەکەون یان گۆناکرێن، لە وشەی(گەندەڵ)دا، دەنگی (د) کرتێنراوە و شاعیر لەو ڕێگەیەوە شیعرییەت و جوانکاریی دروستکردووە.

٢- ئاستی وشەسازی: بە گوێرەی پێوانە و بە لادان لە ڕێساکانی ڕۆنانی وشەی زمانی کوردی، وشەیەکی تازە بۆ زمان زیاد دەکات و بەکاریدەهێنێت، یاخود شاعیر بەسودوەرگرتن لەو وشەسازییەی لە زماندا هەیە، بە لادان لە سنووردارێتی بەکارهێنانی وشەی نوێ دروستدەکات، نموونە بۆ وشەی دارێژراو: نالی دەڵێت:

**ئەی تەلەفی گفتوگۆ، جامیعی کیذب و درۆ**
**واعیظییە ئیشی تۆ، عاشقی یە کاری من (١٠)**

لێرەدا نالی بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی کوردی (ناو+ی) و بە لادان لە سنووردارێتی هەمان یاسا وشەی (عاشقی) دروستکردووە.

نموونە بۆ وشەی لێکدراو: نالی دەڵێت:

**دائیم لە دووتە مێگەلی ژن، نێرگەل ی پیاو**
**بەم ڕیشەوە لە پێشەوە بووبی بە سەرگەلە (١١)**

لێرەدا شاعیر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی کوردیی(ناو+پاشگری گەل) و بە لادان لە یاساکە وشەی (نێرگەل)ی دروستکردووە.

٣-ئاستی ڕستەسازیی: شاعیر هەوڵدەدات لە ڕێگەی گۆڕینی ڕیزبەندیی کەرەستەکانی ڕستەی زمانەکەوە، لە زمانی ئاسایی لابدات، بەمەش لادانی ڕستەسازیی ڕوودەدات، واتە لە یاسای(بکەر+بەرکار+کردار) لادەدات و کەرەستەکان پاش و پێش دەخات، دەتوانین بڵێین شاعیر زۆرجار بۆ پاراستنی کێش ئەم کارە دەکات، بۆ نموونە:

**عەجەب ئەستێرە شەو هەڵدێ لە تاوی خوسرەوی خاوەر**
**بەڕووی تۆم دیدە هەڵنایێ، شەو و ڕۆژ گەرچی بێدارم(١٢)**

لەم دێڕەدا شوێنگۆڕکێ بە کەرەستەکانی ڕستە کراوە، لەبری ئەوەی کە بڵێ(بە

ڕووی تۆ دیدەم هەڵنایێ) دەڵێت (بە ڕووی تۆم دیدە هەڵنایێ)، بەواتایەکی تر شوێنی جێناوی لکاوی (م) کە لە بەکارهێنانە ئاساییەکەی زماندا دوای وشەی(دیدە) دێت، گواستوویەتییەوە بۆ دوای جێناوی سەربەخۆی تۆ کە ئەمەش بۆ پاراستنی کێش کراوە.

٣- ئاستی واتاسازیی: ئەم ئاستە کار لەسەر واتای وشە و دەربڕاوەکان دەکات، لادان لەو سیما واتاییانەی کە زاڵن بەسەر بەکارهێنانی وشەیەکدا لە زمانی بەکارهاتوودا، لادانی واتایی چەندین جۆری جیاوای هەیە: بۆ نموونە بە ڕووەککردن: ئەم جۆرە لادانە بریتییە لە پێدانی تایبەتمەندییەکانی ڕووەک بە مرۆڤ، بۆ نموونە:

**لێوی تۆ ئاوی بەقا من خضرم**

**فەیضی تۆ ڕەحمەت و، من سەوزەگیا (١٣)**

لێرەدا شاعیر خۆی چواندووە بە سەوزەگیا، کە ئەمەش بە ڕووەککردنە، نموونە بۆ بە مرۆڤکردن، بریتییە لە پێدانی تایبەتمەندیی مرۆڤ بە شتە نازیندووەکان:

**فەرشی کەففی بەری پێتە نەرگس**

**سەری داخستووە وەک چاوی حەیا (١٤)**

کەواتە پەیوەندییەکی گرنگ لە نێوان ئاستە جیاوازەکانی زمان و ئەدەب و بەخشینی سیفەتی ئەدەبی بە دەقدا هەیە.

**زمانی شیعری:**

بەهۆی ڕایەڵە و پەیوەستییە بەردەوامەکانی ئەم دوو لایەنەوە (زمان و ئەدەب) یەکێک لە دیارترین چەمکە ئەدەبییەکان زمانی شیعرییە، زمان لایەنێکی گرنگ و بنەڕەتییە لە شێوازی ئەدەبیدا، چونکە زمان و مۆسیقا و وێنەی هونەری سێکوچکەی بنەڕەتیی شێوازی ئەدەبین و لە بواری شیعریشدا زمانی شیعر گرنگترین بەشەکانی شێوازی شیعرییە، بەهۆیەوە شاعیر دەتوانێ جوانی و کاریگەریی شێوازە شیعرییەکەی پێشکەشبکات، هەر لایەنی زمانی شیعری بووەتە جۆرە جیاکردنەوەیەک لە نێوان شێوازی کلاسیکی و شێوازی نوێی شیعر نووسیندا. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین زمانی شیعری دەکرێ ببێتە کەرەستەیەکی لەبار بۆ توێژینەوەی سیمانتیکی لە نێوان هەردوو بواری تۆژینەوەی زمانی و توێژینەوەی ئەدەبی، چونکە بە جوانی لە بواری شیعردا ئاستەکانی زمان لە





بوارەکانی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیدا خۆی دەنوێنێت، چونکە دەنگی پیتەکان ڕۆڵی خۆیان هەیە لە بەخشینی مۆسیقای شیعری، هەروەها جۆری وشەکان لەڕووی بڕگەسازییەوە ڕۆڵی خۆیان هەیە لە بەخشینی کێشناسی بە شیعرەکە و لایەنی ڕستەسازی ڕۆڵی خۆی هەیە لە بەخشینی واتای شیعری.

بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین زمانی شیعر دەچێتە خانەی زمانی باڵاوە، کەوا جیاوازیی هەیە لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی خەڵکیدا وەک چۆن زمانناسی بەناوبانگ دی سۆسێر جیاوازیی لە نێوان هەردوو جۆری زمانی نووسین (language) و زمانی ئاخاوتنی(speak) خەڵکی دیاریکردووە، هەرچەندە « زمانی شیعر بە بەشێک لە پێشکەوتنی زمانی ئاسایی دادەنرێت، ڕەنگدانەوەشی لە بەرهەمی ئەدەبی و فۆلکلۆری کارێکی ئاسایی و زیندووە بە گۆڕانی شێوازیش دادەنرێت»، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە شیعری کوردیدا دیاردەی ڕەنگدانەوە و بەکارهێنانی شێوەزاری کوردی بەدیدەکرێت، تەنانەت لایەنی دیالێکت ڕۆڵی مێژوویی خۆی هەیە لە دیاریکردنی قۆناغە مێژووییەکانی شیعری کوردیدا، بەشێوەیەک سەرەتا بە زاری لوڕی نووسراوە وەک هۆنراوەکانی (بابە تاهیری هەمەدانی) و پاشتر بە زاری گۆران نووسراوە وەک لە هۆنراوەکانی (بێسارانی و صەیدی هەورامی، خانای قوبادی، مەولەوی)، پاشتریش بە زاری کرمانجیی سەروو وەک لە هۆنراوەکانی (مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی) بەدیدەکرێت، پاشتریش بە شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست هۆنراوەی کوردی نووسراوە وەک لە هۆنراوەکانی :(نالی، سالم، حاجی قادری کۆیی، مەحوی، گۆران، کامەران موکری، جەلالی میرزا کەریم، شێرکۆ بێکەس، قوبادی جەلیزادە و بەختیار علی ...) بەدیدەکرێت، تائێستاش پێی دەنووسرێت.(١٥) کەواتە زمان و ئەدەب بەشێکی گرنگی ناسنامەی هەر نەتەوەیەک پێکدەهێنن و بوون و بەرەوپێشچوونی هەر نەتەوەیەک بەم دوو لایەنە گرنگەوە بەستراوەتەوە.

## ئەنجام

زمان و ئەدەبییات دوو لە بنەما سەرەکی و گرنگەکانی بوونی هەرنەتەوەیەکن و ناسێنەری بوونی مرۆڤن لە هەر جێگایەکی دونیا بێت، بەشێکی گرنگ لە ناسنامەی تاکی کورد پێکدەهێنن، ئەدەبییات دەکرێت وەک پێوەرێک سوودی لێوەربگیرێت بۆ بە ستانداردکردنی زارێک یان شێوەزارێک و کردنی بە زمانی ڕەسمی نەتەوەیەک، چونکە سەرچاوەیەکی گرنگ و دەوڵەمەندی پاراستنی زمانی کوردییە بە هەموو

زار و شێوەزارەکانییەوە و بە چەندین قۆناغی جۆراوجۆر و درێژدا تێپەڕیوە و توانیویەتی خۆی بسەلمێنێت. دەتوانین بڵێین شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست شێوەزارێکی گونجاوە بۆئەوەی بکرێت بە زمانی ستانداردی کوردی، چونکە لە ئێستادا زمانی ئەدەبییات و نووسین و یاسادانان و پەروەردە و بەڕێوەبردنە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:


١-لطفی عبدلبدیع، الترکیب اللغوی للادب بحث فی فلسفه اللغه و الاستطیقا، مصر، مکتب لبنان، ١٩٩٧، ل٣

٢-بەکر عومەر، چەند لایەنێکی زمانەوانی، هەولێر، ناوەندی ئاوێر، ٢٠١٤، ل١٨٨

٣-ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، بە دیالێکتی گۆرانی(هەورامی)، چ٣، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٧، ل١١٤.

٤-مەلای جزیری، دیوان، توێژاندنا صادق بەهائەددین ئامێدی،چ١، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٧، ل٢٢٣.

٥- سافیە محەمەد ئەحمەد، سۆران عەبدولڕەحمان حەمەد، ئەدەبیاتی کوردی وەک بناغەیەکی بە ستانداردبوونی زمانی کوردی، ژمارە٦ ی ٢٠٢٢،kurdiname international Academical journal، ل٧٠.

٦-عەبدوڵا ڕەحمان، توێژینەوەی دەق لە ڕوانگەی زمان و ئەدەبەوە، چ١، هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری، ٢٠١٧، ل٧٦.

٧-نالی، دیوان، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، سنە، بڵاوکراوەی کوردستان، ١٣٨٧، ل٧٦.

٨-د. ئازاد ئەحمەد مەحموود، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چ٢، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە١٨٨، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٧.

٩-دیوانی شیعری محەمەد سالح دیلان، ئامادەکردن و لێکدانەوەی پەراوێزنووسین و پێشەکی، دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین، هەولێر، کوردستان، ٢٠١٣، ل١١٢.

١٠-دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

١١-سەرچاوەی پێشوو.

١٢-سەرچاوەی پێشوو.

١٣-سەرچاوەی پێشوو.

١٤-سەرچاوەی پێشوو.

١٥-د. عدل گەرمیانی، خەسڵەتەکانی شیعری کوردیی هاوچەرخ، لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ڕەخنەیی پراکتیکییە، سایتی دەنگەکان، ٢٠١٣.



د. سامان مستەفا ڕەشید

# خشتەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی تایبەت بە پۆلی یەکەم و دووەمی قوتابخانەی قەزای گوڵعەنبەر

## بۆ ساڵی خوێندنی ١٩١٢-١٩١٣

خشتەکە بریتییە لە بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی پەروەردەی دەوڵەتی عوسمانی بەشی تۆماری خوێندنی سەرەتایی کە بە کۆدی ( ٣٢/٤٥١) پارێزراوە، بریتییە لە خشتەی تاقیکردنەوەکانی قوتابخانەی سەرەتایی قەزای گوڵعەنبەر بۆ ساڵی خوێندنی ١٩١٢- ١٩١٣ ی هەردوو پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی، لەبەرئەوەی لە ئەسڵی بەڵگەنامەکەدا یەکەمجار پۆلی دووەمی نوسیوە و لەژێریدا پۆلی یەکەمی نووسیوە، منیش بە بنەڕەت گرتنی ئەسڵی بەڵگەنامەکە وەک خۆی وەرمگێڕاوە و سەرەتا خشتەی پۆلی دووەم داناو ئینجا پۆلی یەکەم.

سەبارەت بە گرنگی و بایەخی خشتەکە، جیالەوە خشتەکە، بەڵگەنامەیەکی فەرمی گرنگ و بە بایەخە بۆ تێگەیشتن و ڕۆشنایی خستنە سەر ڕەوشی خوێندنی فەرمی لە قەزای گوڵعەنبەر، لە ڕێگەی خشتەکەوە دەزانین کامانەن ئەو بابەتانەی لە پۆلەکانی یەکەم و دووەمی سەرەتاییدا خوێنراون، هەروەک خشتەکە زانیاریشمان دەداتێ لەمەڕ ئاستی خوێندن و ڕێژەی دەرچوون لە قوتابخانەکەدا.

بەگوێرەی زانیارییەکانی ناو خشتەکە بە هەردوو پۆلی یەکەم و دووەمی قوتابخانەی گوڵعەنبەر لە ساڵی خوێندنی ١٩١٢-١٩١٣ بەکۆی گشتی (٢٥) قوتابی هەبووە، بەجۆرێک لەو (٢٥) قوتابییە هەشت قوتابییان لە پۆلی دووەم و (١٧) قوتابییشیان لە پۆلی یەکەم بوون،١ ئەمە لەکاتێکدایە ژمارەی قوتابییەکانی پۆلی یەکەم و دووەمی هەمان قوتابخانە لە ساڵی خوێندنی ( ١٩١١-١٩١٢) بە کۆی هەردوو پۆلەکە (٦٠) قوتابی بووە.٢

بەگوێرەی داتاکانی ناو خشەکە لە کۆی ئەو (٢٥) قوتابییە، (١٥) قوتابییان دەرچوون و چوونەتە پۆلی بەرزتر، (١٠) قوتابیشیان دەرنەچوون و لە پۆلەکانی خۆیاندا ماونەتەوە، بە چەشنێک لەو هەشت قوتابییەی پۆلی دووەم شەش قوتابیان دەرچوون و تەنها دوو قوتابیان ماونەتەوە، ئەو دوو قوتابییەش بە هۆکاری جیاواز بەشداری تاقیکردنەوەکانیان نەکردووە، یەکەمیان قوتابییەک بووە بەناوی (احمد حمدی بن مرحوم محمد بگ) کە خەڵکی خودی هەڵەبجە بووە بە هۆکارێک کە ڕوووننەکراوەتەوە بەشداری هیچ یەکێک لە تاقیکردنەوەکانی نەکردووە، هەرچی ئەوی دیکەیان قوتابییەک بووە بە ناوی (علی رضا بن قائمقام مجید افندی) ئەمەیان کوڕی قایمقامی ئەو کاتی گوڵعەنبەر مەجید ئەفەندی بووە، وەک لە بەشی تێبینی خشتەکەدا ئاماژەی پێدراوە ناوبراو لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا گەڕاوەتەوە بۆ مەملەکەتی خۆی(بەدلیس) و بەشداری تەنها دوو تاقیکردنەوەی کردووە و تاقیکردنەوەکانی تری ئەنجام نەداوە، لەبەرئەوە دەرنەچووە.

سەبارەت بە شوێنی لەدایکبوونی قوتابییەکان، لە کۆی هەشت قوتابییەکەی پۆلی دووەم، چوار قوتابیان لە هەڵەبجە لەدایکبوون و چوارەکەی دیکەش، یەکێکیان

---

1 BOA. MF. IBT. 451. 32.

٢ بڕوانە: د. سامان سەلاح، ڕەوشی خوێندنی میری لە گوڵعەنبەر(هەڵەبجە) لە بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانییدا، گۆڤاری خاڵ، ژمارە (٤٣)، زستانی ٢٠٢٤، ل ١٢٤-١٣٠.

وەک ئاماژەمان پیدا کوڕی قایمقامی ئەو کاتی هەڵەبجە بووە و خەڵکی بەدلیس بووە، دانەیەکی دیکەشیان لە عەشیرەتی جاف بووە، قوتابییەکی تریان شوێنی لە دایکبوونەکەی سلێمانی بووە، چوارەمیشیان خەڵکی گوندی عەبابەیلێ بووە.

## خشتەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی پۆلی دووەم

| ژمارە | ناوی سیانی | قورئانی معجز | علم حال | تەجوید منیف | علم حساب | تاریخ عثمانی | جغرافیا | قرائت | املا | حسن خط | تێکڕا | شوێنی لە دایکبوون | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١. | ڕشید مدحت بن ملا علی | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٩٠ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ٢. | احمد حمدی بن مرحوم محمد بگ | . | . | . | . | . | . | . | . | . | . | هەڵەبجە | ماوەتەوە بەشداری تاقیکردنەوەی نەکردووە. |
| ٣. | امین منیر بن ملا محمد افندی | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٩ | ١٠ | ٨٩ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ٤. | علی رضا بن قائمقام مجید افندی | ١٠ | ١٠ | . | . | . | . | . | . | . | ٢٠ | بەدلیس | ماوەتەوە بەهۆی ئەوەی گەڕاوەتەوە بۆ مەملەکەتەکەی خۆی |
| ٥. | امین ناطق بن محمود اغا | ٨ | ١٠ | ٩ | ١٠ | ١٠ | ٥ | ١٠ | ٤ | ٨ | ٧٤ | جاف عشائیری | دەرچووە |
| ٦. | رشید فایز بن نادر اغا | ١٠ | ٨ | ٧ | ٩ | ١٠ | ٧ | ١٠ | ٣ | ٨ | ٧٢ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ٧. | محمد وفا بن ملازم محمد افندی | ١٠ | ١٠ | ٨ | ١٠ | ١٠ | ٨ | ١٠ | ٩ | ٣ | ٧٨ | سلێمانی | دەرچووە |
| ٨. | جعفر هادی بن شێخ فتاح | ٧ | ٨ | ٨ | ٧ | ٣ | ٨ | ٤ | ٣ | ٣ | ٥١ | ابا عبیده (عەبابەیلێ) | دەرچووە |

هەرچی سەبارەت بە پۆلی یەکەمە، بە داتاکانی خشتەی تایبەت بە پۆلی یەکەم، لە کۆی (١٧) قوتابی (١٠) قوتابی دەرچوون و چوونەتە پۆلی بەرزتر و (٧) قوتابیشیان دەرنەچوون و ماونەتەوە لە پۆلەکەی خۆیاندا، سەبارەت بە شوێنی لە دایکبوونی قوتابییانی پۆلی یەکەمیش، بە گوێرەی زانیارییەکانی ناو خشتەکە لە کۆی (١٧) قوتابییەکەی پۆلی یەکەم (١٢)یان لەدایکبووی هەڵەبجە بوون، (٣) قوتابیشیان لە عەشیرەتی جاف بوون و شوێنی لە دایکبوونیان نەنوسراوە، قوتابیەکیش لە دایکبووی سلێمانی بووە و دانەیەکیش (شطره).

## پۆلی یەکەم

| ژمارە | ناوی سیانی | قرئانی معجز البیان | علم حال الشریف | علم حساب | قرات | املا | حسن خط | تێکڕا | شوێنی لە دایکبوون | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٩ | عبدالله مخلص بن حاجی عبدالرحمن | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٨ | ١٠ | ٥٨ | جاف عشائیری غیرمحرر | دەرچووە |
| ١٠ | محمود شوکت بن خالص | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٦ | ١٠ | ٥٤ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١١ | محمد محسن بن حاجی عزیز اغا | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٧ | ٧ | ٣ | ٤٦ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١٢ | سعید سعدی بن فرج اغا | ٧ | ١٠ | ١٠. | ٧ | ٣ | ٥ | ٤٢ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١٣ | سلیمان بهجت بن محمد بگ | ٨ | ١٠ | ١٠ | ٥ | ٥ | ٧ | ٤٥ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١٤ | عبدالقادر رمزی بن امین بگ | ٧ | ٩ | ٩ | ٩ | ٤ | ٥ | ٤٣ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١٥ | احمد جمیل بن ولی اغا | ٨ | ٩ | ١٠ | ٧ | ٧ | ٤ | ٤٥ | شطره | دەرچووە |
| ١٦ | محمد واصف بن کوخه احمد اغا | ٠ | ٩ | ٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٨ | هەڵەبجە | ماوەتەوە |
| ١٧ | سعید سدقی بن احمد غا | ٠ | ١٠ | ٨ | ٠ | ٧ | ٣ | ٢٨ | هەڵەبجە | ماوەتەوە |
| ١٨ | احمد شاکر بن حاجی عزیز اغا | ٦ | ٨ | ١٠ | ٥ | ٣ | ٣ | ٣٥ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ١٩ | فرج لطفی بن محمود اغا | ٠ | ٨ | ٨ | ٥ | ٠ | ٢ | ٢٣ | جاف عشائیر غیرمحرر | ماوەتەوە |
| ٢٠ | رشید رشدی بن محمود اغا | ٠ | ٩ | ٧ | ٧ | ٠ | ٣ | ٢٦ | جاف عشائیر غیرمحرر | ماوەتەوە |
| ٢١ | محمود فوزی بن احمد اغا | ٠ | ٦ | ٦ | ٠ | ٠ | ٢ | ١٤ | هەڵەبجە | ماوەتەوە |
| ٢٢ | سید احمد بن حاجی ملا عزیز | ٠ | ٥ | ٩ | ٠ | ١ | ٣ | ١٨ | هەڵەبجە | ماوەتەوە |
| .٢٣ | محمد عاکف بن عثمان بگ | ٠ | ٥ | ٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ١١ | سلێمانی | ماوەتەوە |
| ٢٤ | علی تالب بن عبدالکریم افندی | ١٠ | ١٠ | ٨ | ٥ | ٤ | ٣ | ٤٠ | هەڵەبجە | دەرچووە |
| ٢٥ | صالح حلمی بن درویش افندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | هەڵەبجە | ماوەتەوە |

لە کۆتایی بەڵگەنامەکەدا ئاماژە بەوەکراوە کە، سێ خشتەی ئەنجامی تاقیکردنەوە گشتییەکان کە بەگوێرەی زانینی خۆیان بۆ ساڵی ١٩١٢-١٩١٣ز ئەنجامیانداوە، ئەنجامەکان دەریدەخەن لە کۆی بیست و پێنج قوتابی پانزەیان دەرچوون و ئەو دە قوتابییەکەی دەرنەچوون و لە پۆلەکانی خۆیاندا ماونەتەوە، بەگوێرەی ڕێنماییەکان سێ کۆپی خشتەکە ڕێکخراوە و پەسەندکراوە و دانەیەکی هەڵگیراوە و دووانیشیان لە ٢٧ی اغستۆس ١٣٢٩/ ٩ی ئەیلولی ١٩١٣ نێردراوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی موسڵ. لە بەشی خوارەوەی بەڵگەنامەکەش: ناو و مۆری قایمقام و عدلیە و مامۆستا و کاربەدەستانی گوڵعەنبەری لەسەرە.



کلعنبر قضاسی مکتبنه مخصوص امتحان جدولیدر سنه ۱۳۲۹

MF.İBT.00451

## سەرچاوە

BOA. MF.IBT. 451.

-د. سامان سەلاح، ڕەوشی خوێندنی میری لە گوڵعەنبەر (هەڵەبجە) لە بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانیدا، گۆڤاری خاڵ، ژمارە (٤٣)، زستانی ٢٠٢٤.

**نووسینی:**

**عبدالله حسن زاده میر علی، مامۆستای زانکۆی سمنان- ئێران**
**محمد امین محمد پور، خوێندکاری زانکۆی سمنان- ئێران.**

**وەرگێڕانی: ئەرکان ئەحمەد حەسەن (جاف)، خوێندکاری دکتۆرا لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ- زانکۆی ڕاپەڕین- کوردستان- عێراق.**

# بیرەوەرینووسین
## لە ئەدەبیاتی فارسیدا [1]



١ ئەم توێژینەوەیە لە بنەڕەتدا لە گۆڤاری زانستی: (پژوهشهای نقد ادبی و سبک شناسی (علمی- پژوهشی)، شماره ٣ (پی درپی ١١)، بهاری ٢٩٣١، صص ٥٦- ٨٨) بڵاوکراوەتەوە.

**پوختە:**

لەم توێژینەوەیەدا، هەوڵدەدرێت بەجیاکردنەوە و شیکردنەوەی نووسینەوەی بیرەوەری لە ئەدەبیاتی فارسیدا، پێکهاتە، بیرەوەری، شێواز و تەکنیک، زمانی نووسین، ئاوازی نووسین و گۆشەنیگاکانی نووسینەوەی بیرەوەری بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. دەرەنجامی بەدەستهاتوو ئەوە دەردەخەن کە نووسینەوەی بیرەوەری یەکێکە لە شێوازە ئەدەبییەکان، ئەگەرچی ڕیشەیەکی کلاسیکی هەیە، بەڵام قۆناغەکانی گەشەسەندنی لە دونیای نوێدایە و بەسەر سێ لقدا دابەش دەبێت. ئەوانیش بریتین لە: بیرەوەری نووسراو، بیرەوەری زارەکی و یاداشتی ڕۆژانە. بیرەوەرینووسین پشت بەگێڕانەوە دەبەستێت و بە بەراورد بە شێوازەکانی دیکەی بەرهەمە ئەدەبییەکان کەمتر ڕەنگدانەوەی وێنەی خەیاڵی تێدا دەبینرێت.

**کلیلە وشە: بیرەوەرینووسین، پێکهاتە، بیرەوەری، یادداشتنووسی.**

**پێشەکی:**

بیرەوەرینووسین، یەکێکە لە بابەتە ئەدەبییەکان، کە بابەت و دەربڕینی تایبەت بە خۆی هەیە، لەم توێژینەوەیەدا ئەوە ڕوووندەکرێتەوە کە بیرەوەری چییە؟ نووسینەوەی بیرەوەری چ دەستکەوتێکی هەیە؟ چ پێکهاتە و تایبەتمەندییەکی هەیە، کە بەرهەمێکی بیرەوەرینووسین بەشێوەیەک دەناسێنێ کە لە بەرهەمەکانی دیکەی وەک: ڕاپۆرت، وتار و توێژینەوە، مێژوونووسی، ژیاننامە، سەفەرنامە و داستاننووسی جیادەکاتەوە. لەم ڕووەوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی نێو ئەم توێژینەوەیەدا، بیرەوەری و بیرەوەرینووسین لە ئەدەبیاتی فارسیدا و تایبەتمەندییەکانی دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و چەند قۆناغێک ڕوووندەکرێتەوە.

سەرەتا باس لە پێناسەی بیرەوەری و مێژووی بیرەوەری تا ئەمڕۆ دەکەین و دواتر جۆرەکانی نووسینەوەی بیرەوەری و ڕۆڵی گێڕانەوە، تەکنیک، زمان، ئاواز و گۆشەنیگای بینینی بیرەوەری وەک شێوازێکی ئەدەبی ڕووندەکەینەوە و جیاوازییەکانی بیرەوەری لەگەڵ مێژوونووسی، بیۆگرافی، داستان و ڕاپۆرتنووسی دەخرێنە ڕوو. بە سەرنجدان لە نووسینی چەند نووسەرێکی توێژینەوە زانستییەکان کە دەربارەی نووسینەوەی بیرەوەری بڵاوکراونەتەوە، وەک: خاطره نگاشتەها و خاطره نویسی در گستره ادب مقاومت و فرهنگ جبهه (بیرەوەری و بیرەوەرینووسین لە زەمینەی ئەدەبی بەرگری و کولتووری بەرەکانی جەنگ)،

بررسی سیر خاطره نویسی در دفاع مقدس با تأکید بر کتاب «دا»، (لێکۆڵینەوەی ڕەوتی بیرەوەرینووسین جەنگی بەرگری پیرۆز، کتێبی «دا» بە نموونە)، کە لە پێگەی بەڵگەنامە زانستییەکانی ئێراندا تۆمارکراوە، بەڵام بە تێڕوانینێکی گشتگیرانە باس لە بیرەوەرینووسین نەکردووە.

**ئەلف) بیرەوەری چییە؟**

چەمکی بیرەوەری (یادەوەری)، بەگشتی لە فەرهەنگدا بە: «ئەو شتەی بەدڵدا تێپەڕ دەبێت، هزر، ئەندێشە، خەیاڵ ... هتد، واتا کراوە. وشەی بیرەوەری لە فەرهەنگنامەی (دیهخودا)دا بە: «بابەتێک کە بەسەر کەسێکدا هاتبێت و شوێنەوارێکی لە یادگەی کەسەکەدا مابێتەوە، ڕابردووی مرۆڤەکان، ڕووداوەکانی ڕابردوو کە کەسێک بە چاوی خۆی دیبێتی یان بیستبێتی، بینراو یان بیستراوەکانی ڕابردوو» (دهخدا، ١٣٧٢، ذیل خاطره) واتا کراوە. بەسەرنجدان لە ئەو دیدگا جیاوازانەی کە لە بارەی (بیرەوەری)یەوە بوونیان هەیە، دەتوانرێت سێ پێناسە لەبارەی بیرەوەرینووسین و بیرەوەرییە نووسراوەکانەوە بخرێنە ڕوو:

**ئەلف- ١) بیرەوەرینووسین:**

نووسینەوەی ‌بارودۆخ، ڕووداو و بابەتگەلێکە کە خودی نووسەری بیرەوەری تیایاندا ئامادە بووە. لەم شێوازەدا ئەوەی کە نووسەری بیرەوەری دەیهێنێتە بوون، پەیوەستە بە باسکردنی بارودۆخی کەسانی دیکە و ڕوونکردنەوەی ڕووداوە دەرەکییەکان و ڕۆڵی نووسەری بیرەوەرییەکە تیایدا، لەبەرئەوە، باسکردنی بارودۆخی خودی خۆی وکار و هەنگاوەکانی نووسەر لەنێو بیرەوەریدا، ڕۆڵێکی لاوەکی دەبینێت و هەر لەم ڕوانگەیەوەیە کە بیرەوەرییەکان لە ڕووی پێکهاتەوە زیاتر لە ڕاپۆرت و گێڕانەوە مێژووییەکان نزیکدەبنەوە، وەک: خاطرات حسین فردوست: ظهور و سقوط سلطنت پهلوی/ بیرەوەرییەکانی حسین فردوست: دەرکەوتن و ڕووخانی سەڵتەنەتی پەهلەوی.

**ئەلف- ٢) بیرەوەرینووسین:**

نووسینەوەی بارودۆخ، ڕووداو و بابەتگەلێکە کە بەشێوەیەکی گشتی ڕۆڵ و کاریگەری نووسەری بیرەوەرییەکە لە قۆناغێکی دیاریکراو یان ژیانی نووسەرەکە دەخاتە ڕوو. یادداشتە ڕۆژانەکان بەگشتی چەخت لە قۆناغێکی تایبەت و هەستیاری نووسەرەکە دەکەنەوە. وەک: (عبور از بحران، خاطرات علی اکبر هاشم رفسنجانی/ دەرچوون لە قەیرانەکان، یادداشتی علی ئەکبەر هاشمی ڕەفسنجانی).

لەم ڕووەوە، ئەوەی بابەتی بنەڕەتی بیرەوەرییەکان لە خۆی دەگرێت، پەیوەست دەبێت بە ڕۆڵ، بۆچوون، کردار و وتەی نووسەر بەرامبەر ڕووداوەکانی ڕابردوو. ڕووداوە دەرەکییەکان بە بەراورد بە بابەتەکانی بیرەوەری بەشێوەیەکی لاوەکی باس دەکرێن. ئەم جۆرە بیرەوەرینووسییە، بە (بەپێی باودۆخ) ناودەبرێن و نووسەر تیایاندا زۆربەی ڕووداوە گرنگەکان و جێ سەرنجەکان لە ژیانی ڕابردوویدا باس دەکات و بەشێوەیەکی ئاسایی قۆناغێکی درێژ لە ژیانی خۆی لە خۆدەگرێت، وەک بیرەوەری: محمد عەلی ئیسلامی ندوشن: روزها/ ڕۆژگاران.

**ئەلف- ٣): بیرەوەرینووسین:**

باسکردنی ڕووداوەکانی نووسەرە بە تێکهەڵکێش لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕابردوو و گێڕانەوەی کرداریی کرداریی خەڵکانی دیکە (کمری: ١٣٨٣، ١٦- ١٧). ئەم دەربڕینە، بەواتا گشتییەکەی، بیرەوەرینووسین هاوواتا و هاوشێوەی هەردوو شێوەکەی پێشووترە. لەبەرئەوە، بیرەوەرینووس بەسودوەرگرتن لەوانەی کە بیستوویەتی و بینیویەتی و خودی خۆی ڕۆڵی هەبووە لە ڕووداوەکان، بەشێوەیەکی ئاوێتە دەست بە نووسینی بیرەوەرییەکانی خۆی دەکات، بەمەش شێوازێکی گشتی و گشتگیر دەبێت لە بیرەوەرینووسین دا، وەک بیرەوەری: محسن نجات حسینی: برفراز خلیج فارس/ فڕین بەسەر کەنداوی فارس.

**ب) بیرەوەرینووسین لە ڕابردوو و ئێستەدا:**

قد خلت من قبلکم سنن فسیروا فی الارض فانظروا کیف کان عاقبه المکذبین. هذا بیان للناس و هدی و موعظه للمتقین (ال عمران: ١٣٧- ١٣٨).

بیرەوەرینووسین هەر لە کۆنەوە سەرنجی زۆرێک لە نووسەران، ئەدیبان و تەنانەت خەڵکە سادەکەشی بەلای خۆدا ڕاکێشاوە، بەڕادەیەک کە کەمتر دەتوانی کەسێک بدۆزیتەوە کە بیرەوەرییەکی بۆ گێڕانەوە پێ نەبێت. ئامانج لە نووسینەوەی بیرەوەری، تۆمارکردنی ڕووداوەکانی ڕابردووە بۆ مێژوو یان تۆمارکردنی مێژووە بۆ خودی کەسەکە. بۆئەوەی بیرەوەرییەکیش بەزیندوویی بمێنێتەوە، پێویستە ڕووداوی گرنگ و هەستیاری تێدا تۆمار بکرێت یان بەسەرهاتی کەسایەتی گرنگ و کاریگەری تێدا تۆمار بکرێت.

لە مێژووی ئێراندا نووسینەوەی ژیاننامە قوڵاییەکی مێژوویی دوورودرێژی هەیە بەڕادەیەک کە لە بەشەکانی خودانامە کە دواتر لە شانامەدا کۆکرایەوە،

تەنانەت هەندێ لە کەتیبەکانی وەکوو کەتیبەکانی کێوی بێستوون، دەتوانرێت بەشێوازێک لە نووسینەوەی ژیاننامە هەژمار بکرێن. نوسراوی کارنامەی ئەردەشێری بابەکان، نموونەیەکە لەم جۆرە بەرهەمانە کە هاوشێوەی ئەم بەرهەمە لە ئیبن نەدیم و جاحز و کەسانی دیکەی وەک ئەوان چاوەڕاون دەکرێت، لە سەردەمی ساسانییەکان نموونەی زۆری ئەم شێوازی نووسینە بوونی هەیە، لە زۆربەیاندا، وەک خودانامە، ئەفسانە لەگەڵ حەقیقەتدا ئاوێتە کراوە(رستگار فسایی: ١٣٨١، ٢٨١).

بیرەوەرینووسین ئەگەرچی ڕیشەیەکی قوڵی کلاسیکی هەیە، بەڵام پایەکانی گەشەسەندووی لە دونیای ئەمڕۆدا بەدی دەکرێت. تۆمارکردنی ساتە هەستیارەکانی مێژوو کە کاریگەری لەسەر چارەنووسی گەلێک هەیە، لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسانە، مرۆڤ ناسانە، مەعریفەتناسانەیان لەبارەیەوە دەکرێت و یەکێکە لە پێکهاتە بنەڕەتییەکانی بیرەوەرینووسین کە لە ئێستەدا وەک لقێکی ئەدەبیی هاوچەرخ لێی دەڕوانرێت.

**پ) جۆرەکانی بیرەوەرینووسین:**

بەشێوەیەکی گشتی بۆ نووسینەوەی بیروەری سێ شێواز بوونی هەیە: بیرەوەری نووسراو، بیرەوەری زارەکی و یادداشتی ڕۆژانە (شهبازی: ١٣٨٦، ٣٦). بیرەوەری زارەکی بە تێپەڕینی کات لە یادگەدا دەسڕێتەوە یان لەلایەن خاوەن بیرەوەرییەکەوە بەشێوەیەکی زارەکی لە شوێنێکدا گێڕدراوەتەوە و لە قۆناغی دووهەمدا دەنووسرێتەوە. یادداشتی ڕۆژانەش لەلایەن کەسەکەوە و بەشێوەیەکی ڕۆژانە دەنووسرێت، وەک: یاداشت های ڕووزانە نیما یووشیج.

**ت) بیرەوەرینووسین و یادداشتی ڕۆژانە:**

یاداشتی ڕۆژانە شێوازێکە لە بیرەوەرینووسین کە تیایدا نووسەر ڕووداوەکانی خۆی بشێوازی ڕۆژانە و تۆمارکردنی ڕێکەوت دەنووسێت. لەسەر بنەمای دیاریکراو، تۆمارکردنی مێژوو، گێڕانەوەی ڕووداوەکان و ڕەچاوکردنی ڕیزبەندی کات، ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی یادداشتی ڕۆژانە دەنووسرێن.

بەواتایەکی دیکە، یادداشت نووسینێکە ئەگەر بەرواری تێدا دیاری نەکرابێت بە یادداشتی ڕۆژانە دانانرێت. هەروەها لە لە یاداشتەکاندا دەبێت شێوازی گێڕانەوەی ڕووداوەکان دوابەدوای یەک بن و ڕیزبەندی کاتیان تێدا ڕەچاو بکرێت، لەڕاستیدا، یاداشتی ڕۆژانە وەک لقێک لە بیرەوەرینووسین هەژمار دەکرێت.

ئەو هۆکارانەش کە یادداشتنووسی بە بیرەوەرینووسین دەزانێت بەهۆی دوو هۆکارەوەیە: ١- یاداشتەکانی ڕۆژانەش هاوشێوەی بیرەوەری نووسراو و بیرەوەری زارەکی ڕووداویان تێدا تۆمار کراوە و بینراو و بیستراوەکان و کەسی گێڕەوە ئامادەیی تێدا هەیە و دەینووسێت. ٢- پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی چۆنیەتی نووسینی یاداشتی ڕۆژانە تاڕادەیەکی زۆر هەمان پێوەرن لەچوارچێوەی بیرەوەری نووسراو و زارەکیدا بوونیان هەیە.

یاداشتی ڕۆژانە، لەلایەکەوە جیاوازییەکی ڕوونی لەگەڵ بیرەوەرینووسیندا هەیە و ئەویش لە شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ کاتدا، لە بیرەوەرینووسیندا، ڕووداوە بیستراوەکان و بینراوەکان بە پشتبەستوو بە یادگە و لە ئەنجامی بیرکردنەوە لە بابەتەکان وەبیردەهێنرێنەوە و دوای تێپەڕبوونی کاتێک دەنووسرێنەوە. بەواتایەکی دیکە، نووسەری بیرەوەری لەکاتێکدا دەست بە نووسین دەکات کە ماوەیەک بەسەر ڕووداوەکاندا تێپەڕیوە، لەبەرئەوەیە کە بیرەوەرینووسین بە ڕەگەزی بیرکردنەوە و وەبیرهێنانەوەدا تێدەپەڕێت، بەڵام یادداشتی ڕۆژانە کاتێک دەنووسرێت کە هێشتا سەرەنجامی ڕووداوەکە دیار نییە و نووسەر سات بە سات و کات بە کات ڕووداوەکان تۆمار دەکات. هەربۆیە لە کاتی نووسینی یاداشتی ڕۆژانەدا، ڕووداوەکان بۆ نووسەر بەشێوەی بیرکردنەوە نییە و پشت بە یادگە نابەستێت، هەر لەبەرئەوەشە کە بەکارهێنانی فەرمانەکان لە دەقی یاداشتنووسی ڕۆژانەدا لە زۆرێک لە کاتەکاندا فەرمانی ڕانەبردوو بۆ کاتی ئێستا بەکاردەهێنرێت.

کەواتە، ئەگەر لە ڕوانگەیەکی ئەدەبی و هونەرییەوە لەم بابەتە بڕوانین، بەشێوەیەکی گشتی بیرەوەرینووسین لە ڕووی چەمک و پەخشان نووسییەوە، بە بەراورد بە یاداشتی ڕۆژانە وەزن و قافیەی زیاتری هەیە. بیرەوەرینووسین زیاتر کاتێک ئەنجام دەدرێت کە ڕووداوەکە کۆتایی پێ هاتووە و نووسەر لە ژینگەیەکی ئارام و ئاساییدا و دوورە لە کاریگەرییەکانی ساتی ڕووداوەکە دەست بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی دەکات و لە ژینگەیەکی لەو شێوەیەشدا کاتی هەڵبژاردنی چەمکی نایابی هەیە و بابەتی سەرنجڕاکێش بەکاردەهێنێت، کە زیاتر ڕوانگەیەکی ئەدەبیانەی هەیە.

بەڵام کەسێک کە یادداشتی ڕۆژانە دەنووسێت، تاڕادەیەکی زۆر بێبەشە لە چەمکی نایاب و ژینگەی ئارام، هەربۆیە نووسەری یاداشتی ڕۆژانە لەکاتی ڕووداوەکەدایە و هەوڵدەدات دەقی ڕووداوەکە بنووسێت و ئامانجی نووسینی سات بە ساتی ڕووداوەکەیە و کەمتر کاتی ئەوەی هەیە کە چەمک و وشەی ئەدەبی بەکاربهێنێت.

هەربۆیە، ئەگەر لە ڕوانگەی توێژینەوەی ئەدەبی و مێژووییەوە لە بیرەوەرینووسین و یادداشتنووسی بڕوانین، ئەوا یادداشتی ڕۆژانە بە بەراورد بە بیرەوەرییەکان جیاوازییان هەیە. بەواتایەکی دیکە، ئەوەی بۆ مێژوونووسێک گرنگە بوونی بەڵگەنامەی پێویستە، لەبەرئەوە یادداشتی ڕۆژانە بەهۆی ئەوەی کە نووسەر لەکاتی ڕووداوەکە و بەبێ تێپەڕینی کات نووسیویەتی، ئەوە بڕوا پێکراوتر و بە بەڵگەدارترە، بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەیەکی ئەدەبییەوە لە بیرەوەرینووسین بڕوانین، ئەوا بیرەوەرینووسین بە بەهێزتر دادەنرێت، بەڵکو لە دونیاشدا، یەکێکە لە باشترینەکان. نووسینەکانی بیرەوەری، ئەدەبی تر و یاداشتەکانی ڕۆژانەش بەڵگەنامەدارترن و بڕوا پێکراوترن. یادداشتی ڕۆژانە زیاتر جەختدەکاتەوە لەسەر قۆناغێکی تایبەت و هەستیار لە ژیانی نووسەرەکە.

بە تێڕوانینێکی گشتی و گشتگیرانە بۆ یادداشتنووسی ڕۆژانە، ئەوە دەردەکەوێت کە سەرجەمی یاداشتەکان بەیەک شێواز و پێوەری دیاریکراو نەنووسراون، خۆ ئەگەر بمانەوێت پۆلێنیان بکەین، ئەوە دەتوانین چوار شێواز دیاری بکەین:

**ت- ١) ئۆتۆبیۆگرافی[1] (ژیاننامەی خودی):**

بەشێکی دیاری نووسینەوەی یادداشتنووسی ڕۆژانە بەم شێوازە دەنووسرێت. لەم جۆرە نووسینەی یادداشتدا، نووسەر کارەکتەری سەرەکی ڕووداوەکانە و بەشێوەی ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکان و بارودۆخی دەوروبەر، ژیانی ڕاستەقینەی خۆی ڕووندەکاتەوە، وەک یاداشتی: عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسنجانی: (عبور از بحران/ تێپەڕین لە قەیران)

**پ- ٢) ڕووداونووسی:**

لەم شێوازەی نووسینی یاداشتەدا، نووسەر کەمتر باس لە خۆی دەکات و زیاتر ڕووداوەکانی دەوروبەر تۆمار دەکات، وەک: مێژووی بەیهەقی.

**ت- ٣) ڕووداونووسی ئاوێتە بە نووسەر:**

لەم شێوازەی نووسینی یاداشتدا، نووسەر هاوکات لەگەڵ نووسینی ڕووداوەکانی دەوروبەر، باس لە کەسایەتی خودی خۆشی لەنێو ڕووداوەکان دەکات، وەک: بیرەوەرییەکانی مەهدی بازرگان.

---

١ ئۆتۆبیوگرافی، نووسینی ژیاننامە لەلایەن خودی کەسەکە خۆیەوە، بەڵام بیۆگۆافی، هەر نووسینی ژیاننامەیە، بەڵام لەلایەن نووسەرێکی دیکەوە. (وەرگێڕ)

**ت- ٤) ڕاپۆرتی ڕێکخراوەیی:**

لەم شێوازی نووسینی ڕاپۆرتی ڕێکخراوەییەدا، هەموو ئەو شتانەی کە دەبینرێن تۆمار ناکرێن، بەڵکو تەنها ئەو ڕووداوانە تۆمار دەکرێن، کە بۆ ڕێکخراوێکی دیاریکراو گرنگییان هەیە.

**ث) دەستنووسەکان:**

«لە بەرامبەر یادداشتی ڕۆژانەدا، دەستنووسەکانیش بوونیان هەیە. دەستنووسەکان، یاداشت گەلێکی پەرتەوازەن کە تایبەت بە بابەتێکی دیاریکراو دەنووسرێن، بەروار و ڕێکخستنی تێدا نییە و قۆناغبەندی گێڕانەوەیی تێدا ڕەچاو ناکرێت. ناوەڕۆکی دەستنووسەکان بەشێوەیەکی گشتی باس لە ژیانی کەسایەتی نووسەر دەکات» (فرووغی: ١٣٨٦، ٥٦)، وەک یاداشتەکانی: عەلی شەریعەتی.

**ج) ئۆتۆبیوگرافی (ژیاننامەی خودی).**

ئۆتۆبیوگرافی یان ژیاننامەنووسی لەلایەن خودی کەسەکەوە بەشێوەی بیرەوەری، یادداشت و بیرەوەری گەلێکن کە هەندێکجار کەسانێک لەبارەی خۆیانەوە دەینووسن، لەگەڵ باسکردن لە کەسایەتی، بۆچوون و هەستی خۆیان تۆمار دەکەن و بە زمانێکی دۆستانە، ڕوون و سەرنجڕاکێش، باس لە خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیان دەکەن.

خودی ژیاننامە، زۆربەی کات ڕووداوە گرنگ و جێ سەرنجەکان کە لە ژیانی ڕابردووی نووسەردا ڕوویانداوە، تۆمار دەکات و بەشێوەیەکی گشتی قۆناغێکی دوورودرێژی ژیانی نووسەر لەخۆدەگرێت. کۆمەڵێک نموونەی لەم جۆرە نووسینەش بوونیان هەیە وەک: «محمد غزالی: النقذ من الضلال. محمود واصفی: بدایع الوقایع. یادداشتنامەی شا تەهماسب بە پێنووسی خۆی. بیرەوەری سیاسی ئەمن دەولە. واقعیات تیموری و ذیل آن. تزوکات تیمور. بیرەوەری ژیانی ناسردین شا، بیرەوەری حاج سەییاح، ناظم الاسلام کرمانی: تأریخ بیداریی ایرانیان. ملک الشعرای بهار: تأریخ احزاب سیاسی. حاج میرزا یحیی دولت آبادی: حیات یحیی. خاطرات و خطرات مخبر السلطنە. بیرەوەری سیاسی فەرەح» (رستگار فسایی: ١٣٨١، ١٦٠- ١٦١).

گرنگی و چۆنێتی ئەم یاداشتانە، جیاوازە لەوەی کە، پەیوەست بێت بەوەی کە نووسەر لە چ چینێکی کۆمەڵایەتی و بۆچوون و ئارەزووەکانی چین؟ بیرەروەری

(ڕوونکردنەوەی ژیانی من) باسی بارودۆخی نووسەرەکەی واتە، عەبوڵڵا مستەفی
ییە، بەڵام بەوتەی خۆی: «مەبەستی سەرەکی، باسکردنی بارودۆخە، بەتایبەت
ڕوونکردنەوەی شێوازی ڕەوتی فەرمانە دەوڵەتیی و کارگێڕییەکانە لە شەست
حەفتا ساڵەی ژیانی من دا...». ئەم کتێبە بەرهەمێکی دەوڵەمەند و زیندووی
جۆری بیرەوەرییە، کە تیایدا هەندێک لە گۆشەکانی مێژووی ئێرانی بە ڕوونی
و دەوڵەمەندی تێدا باس کراوە، بەشێوەیەک کە هەندێک بەش لە بەشەکانی کە
ئوتۆبیۆگرافییە، هەندێ کات خوێنەر دەخاتە یادی کتێبەکەی: ئەبوولفەزڵی بەیهەقی
(یوسفی: ١٣٨٧، ج٢، ٣٦٢).

**چ- پێکهاتەی (ڕەگەزەکانی) بیرەوەرینووسین:**

لە پێکهاتەی بیرەوەریدا ئەم ڕەگەزانە بوونیان هەیە:

**چ-١) گێڕەوە، شوێن و کات:**

بیرەوەرینووسین، وەک هەر نووسراوێکی دیکە، بەش و بنەمای خۆی هەیە کە
گرنگترینیان وەک: گێڕەوە، بابەت، شوێن و کات. لە بیرەوەرینووسیندا، گێڕەوە لە
ناوەندی ڕووداوەکاندا بوونی و ئامادەیی هەیە و نووسینەکە لە خەیاڵدانی ئەوەوە
کە سەرچاوە دەگرێت لەنێو ڕووەکەدا بووە، بەڵام دەگونجێت کە خۆی ناوەندی
سەرەکی بیرەوەرییەکە نەبێت، بەڵکو کەسی گێڕەوە بەشێک بووە لە وردەکای
نێو ڕووداوەکە و تێیدا بەشدار بووە. گرنگی کەسی گێڕەوە لەو ڕووەوەیە بابەتی
سەرەکی بیرەوەریی و شێوازی نووسینەوەی بیرەوەرییەکە دیاری دەکات.

تایبەتمەندی بنەڕەتی لە بیرەوەریدا، بینینی ڕووداوەکانە لەلایەن گێڕەوەوە.
ئەڵبەتە دیتنی ڕووداوەکان لە بیرەوەرینووسین و گێڕانەوەی واقعییەت و
ڕاستەقینەیی ڕووداوەکە لەلایەن گێڕەوە، بەدیدێکی پڕاوپڕ لە نییەتپاکی و بێلایەنی
و بەبێ تێکدانی پێش و دواخستنی کاتی ڕووداوەکە و بابەتەکان ئەوەندەی لە
توانایدا هەیە، واتا دەدات بە نووسینەکە.

کەسی گێڕەوە و نووسەری بیرەوەری، لەژێر کاریگەری دوو هۆکاری
سەرەکیدا ڕووداوەکە دەگێڕنەوە: یەکێکیان پێگەی جوگرافییە کە ڕووداوەکەی
تێدا ڕوویداوە، دووهەمیشیان ئەو پێگەیەیە کە گێڕەرەوە بیرەوەرییەکەی تێدا
دەگێڕدرێتەوە (امیرخوانی: ١٣٨٦، ١٠٤).

بیروەرییەکان لە دەرەوەی کات و شوێندا نین، لەبەرئەوە، وردەکاری لە تۆمارکردنی

کات و شوێن بەوپەڕی توانا و باسکردنی وردەکاری بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، گرنگییەکی زۆری لە بیرەوەرینووسیندا هەیە. ڕووبەڕووی سڕینەوەی هەندێک لە بابەتی ڕووداوەکان، یان گەورەکردنی هەندێک بابەتی دیکە، نابینەوە، بەواتایەکی دیکە لە بیرەوەریدا، خەیاڵاوی بوون و چیرۆک دروستکردن و ئەفسانە ڕۆڵی نییە.

**چ- ٢) بوونی کات و وەبیرهێنانەوە:**

بیرەوەرینووسین، نووسراوەکانی بیرەوەری، بیستراوەکان و بینراوەکان، بە پشتبەستوو بە یادگە و لە ئەنجامی وەبیرهێنانەوەی بابەتەکان و گەڕان بەنێو کاتدا تێپەڕبوون، بەواتایەکی دیکە، بیرەوەرینووس لەکاتێکدا دەست بە نووسینەوەی ڕووداوەکان دەکات، کە ڕوویانداوە و کاتێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، هەربۆیە بیرەوەرینووسین نزیکییەکی زۆری لەگەڵ یادگە و وەبیرهێنانەوەدا هەیە.

**چ- ٣) یادێک لە ڕابردوو:**

لە بیرەوەرینووسیندا یادکردنەوەی ڕابردوو بوونی هەیە. ڕادەی نزیکی و ڕاستەقینەیی بیرەوەرییەک، بە بارودۆخی ڕاستەقینەیی ڕووداوەکە بەراورد دەکرێت و هەڵدەسەنگێنرێت. پەیوەستبوون بە واقیعییەت و بارودۆخی کاتی ڕووداوەکە، مۆڵەت بە خەیاڵاتی بوون و لادان نادات بەو کەسەی کە بیرەوەری دەگێڕێتەوە یان دەنووسێتەوە، یان بەلانی کەمەوە، خەیاڵاوی بوون و لادەربوون سنووردار دەکات.

**چ- ٤) لایەنی کەسی (خودی):**

بیرەوەری ئەزمونێکی کەسی و خودییە، بەو واتایەی کە کەسی گێڕەوە یان نووسەری بیرەوەری لە شوێنی ڕووداوەکە و کاتی ڕووداوەکەدا ئامادەیی هەبووە و خودی خۆی ئەزموونی ڕووداوەکەی کردووە، ئەمەش تایبەتەندییەکی کەسی و خودی هەیە. دەگونجێت گواستنەوەی ڕوداوەکە بەگێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە، هیچ پاڵنەرێکی هەستی و خەیاڵی بۆ کەسانی دیکە نەبێت، لەکاتێکدا کە ڕاپۆرت، وتار، نووسینی مێژوویی و بابەتەکانی دیکەی نووسین، دەبێت سوودی بۆ کەسانی دیکەش هەبێت. تایبەتمەندی کەسی ئەم ئەزموونە، بەو واتایە کە بیرەوەرییەکان ئەو کاتانە دەتوانن وەک نووسینێک پەیامێک بگەیەنن، کە گێڕەوەی بیرەوەرییەکە یان نووسەری بیرەوەرییەکە پەیوەندییەکی دەروونی لە نێوان ناخی خۆی و بیرکردنەوە و هزری گوێگر یا خوێنەردا دروستبکات.

بە واتایەکی دیکە، سوودی بیرەوەری بۆ بیسەر یان خوێنەر، پەیوەستە بە

گرنگیدانی گێڕەوە یان نوسەری بیرەوەرییەکە، ئەویش بە بەدیهێنانی زەمینەیەکی هزریی و فەرهەنگی کە دەتوانێت بیرەوەرییەکان لە ئەزموونێکی تاکەکەسی خودییەوە بکات بە ئەزموونێکی گشتی و گشتگیر.

**ح) ڕۆڵی گێڕانەوە و تەکنیکەکانی لە بیرەوەرینووسیندا:**

بیرەوەرینووسین پشتبەستووە بە گێڕانەوە. ئەم گێڕانەوەیە لە بیرەوەریدا واتە ڕوونکردنەوە و تایبەتمەندی و وێنەدان بە ڕووداوێک. لە گێڕانەوەی بیرەوەریدا، بەراورد بە بابەتە ئەدەبییەکانی دیکە، بەکارهێنانی وێنەی خەیاڵی تیایدا کەمترە.

بیرەوەری پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و بنەڕەتی بە ڕووداوێکی واقیعییەوە هەیە، لەبەرئەوە، دەبێت بیرەوەری دوو کەسی جیاواز لەبارەی یەک ڕووداوەوە، تاڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی یەکتر بن، بەڵام ئەوەی کە دەبینرێت هەندێک جار جیاوازە. هۆکاری ئەم جیاوازیەش دەتوانرێت لە تەکنیکی نووسینەوەدا ببینرێت، لەبەرئەوە سەرنجدان و گرنگیدان بە تەکنیک لە کاتی نووسینەوەی بیرەوەری و ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکاندا ڕۆڵی دیاری هەیە.

یەکێک لەو تەکنیکانەی کە هاوکاری بیرەوەرییەکان دەکات بەوەی کە زیاتر لە ڕاستییەوە نزیک بن، گرنگیدانە بە وردەکاری ڕووداوەکان. تەکنیکێکی دیکە کە دەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشی و کاریگەربوونی بیرەوەرییەکان، بریتییە لە ڕێکخستن و ئامادەکاری بۆ نووسین، هەندێ کات ئەم ئامادەکاریی و ڕێکخستنە تێکدانی کاتی ڕووداوەکانە، واتە بەشێک لە ڕووداوەکە زووتر یان درەنگتر لە کاتی خۆی دەنووسرێت، بۆئەوەی کە، ساتە هەستیارەکانی ڕووداوەکان بە باشی هەست پێ بکرێن و کەسی گێڕەوە یان بیرەوەرینووس، پێشتر هەندێک لە بارودۆخ و زەمینەکانی پەیوەست بەو کاتە، کە لە دوای ڕووداوەکە لێی تێگەیشتووە، ڕووندەکاتەوە. ئەم شێوازی ڕوونکردنەوەیە کاریگەری زیاتری هەیە و سەرکەوتووترە.

تەکنیکێکی دیکە بریتییە لە سڕینەوە، مەبەست لە سڕینەوە ئەوەیە، کە کەسی گێڕەوە دەتوانێت لەکاتی گێڕانەوە یان نووسینەوەی بیرەوەرییەکەیدا، بابەتگەلێکی ناپێویست و نا گرنگ لە ڕووداوەکە بسڕێتەوە بۆئەوەی ڕێکخستنی گرنگی ڕووداوەکە تێکنەدات و کاریگەریی گێڕانەوەکە زیاتر بێت. هەروەها تەکنیکێکی دیکە لە تەکنیکەکان بریتییە لە کورتبڕی، بیرەوەرینووس یان نووسەری بیرەوەرییەکان پێویستە سوود لەو چەمکانە وەربگرێت، کە زۆرترین واتایان هەیە، کورتبڕی بەوواتایە نایەت، کە بەشێکی ڕووداوەکان بپەڕێنرێت، بەڵکو بەواتای

هەڵبژاردنی چەمکی گونجاو دێت. هەربۆیە، بیرەوەرینووس و نووسەرەکان دەبێت شارەزایی باشیان لە بەکارهێنانی چەمکەکاندا هەبێت، بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا بەکاریانبهێنن و خوێنەر و بیسەر لە زیادەڕەویی و دووبارە کردنەوە ڕزگار بکەن، هەندێک کات نەنووسراوەکان و نەگوتراوەکان لە بیرەوەرییەکدا کاریگەرترن، ئەمەش کاتێک ئەو کاریگەرییەی دەردەکەوێت کە سەرەداوێکی ئەم نەنووسراوانە، یان ئەم نەگوتراوانە لە بیرەوەرییەکاندا بوونیان هەبێت.

**خ) ڕۆڵی زمان لە بیرەوەرینووسیندا:**

زمان یەکێکە لە هۆکارە گرنگ و کاریگەرەکانی نووسینەوەی بیرەوەری، کە کاریگەری لەسەر خوێنەر و بیسەر دروستدەکات و بەشێوازی ئەدەبی جیاواز دەردەبڕدرێت، بۆ نووسینی بیرەوەری چوار جۆری زمان دەکرێت سوودیان لێوەربگیرێت:

**خ- ١) زمانی ئاخاوتن (گوفتاری):**

نووسەر بە هەمان ئەو شێوازەی کە ڕۆژانە قسەی پێ دەکات هەر بەو شێوازە بیرەوەری دەنووسێتەوە و هیچ دەستوەردانێک لە شێوازی ڕێکخستنی وشەکاندا ناکات. واتە شێوازی گفتوگۆی ڕۆژانە بەسەر نووسیندا زاڵە و ڕێکخستنی ڕێزمانی تێدا ڕەچاو ناکرێت.

**خ- ٢) زمانی نووسین:**

ئەم شێوازی نووسینە، بەشێوازێکی دیاریکراو و جیاواز لە شێوازی ئاخاوتن دەنووسرێت و لە بابەتی ڕێزمانی نزیکتر دەبێت. لە زمانی نووسیندا، هەندێک لە تایبەتمەندی ئاخاوتن دوور دەخرێتەوە و زمانی ڕۆژنامەیی بەکاردەهێنرێت، لە نووسینەوەی بیرەوەریدا ئەم جۆرە شێوازی نووسینە زیاتر بەکاردەهێنرێت.

**خ- ٣) زمانی پێوەر (ستاندەر):**

ئەم زمانە زیاتر لە زمانی ڕاگەیاندنەکانی گرووپێک و سنوورێکی جوگرافی دیاریکراو بەکاردەهێنرێت و دەکرێت نووسەر فێری ببێت. ئەمە زمانێکە کە پێکهاتەی ڕستە تێیدا ڕەچاو دەکرێت و لە سنوورێکی جوگرافی دیاریکراودا بەکاردەهێنرێت کە هەمووان لێی تێبگەن. هەندێکجار نووسینی بیرەوەری ئەوەندە گرنگی پێدەدرێت کە ڕێکخستنی ڕستە و گەیاندنی هەواڵەکە، زیاتر گرنگی پێ دەدرێت وەک لە گێڕانەوەیەکی ئاسایی.

**خ- ٤) زمانی ئەدەبی:**

زمانی ئەدەبی هەندێک جار لە نووسینەوەی بیرەوەریدا بەکاردەهێنرێت، لەم شێوازی نووسینەدا گرنگی بە داڕشتن دەدرێت و هەواڵێک یان ڕووداوێک دەکرێتە بەهانە بۆ نووسینێکی ئەدەبی. لە زمانی ئەدەبیدا، ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە و گرنگی پێ دەدرێت، واتای نادیار و دووهەمی وشەکانە، کە تێیدا هەست و سۆز دەجووڵێنێت. بەپێچەوانەی زمانی ئاسایی، گواستنەوەی پەیام لە زمانی دەبیدا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێت و ئەرکی تێگەیاندنی هەواڵێکە. لەڕاستیدا نووسەر کاتێک کە سەرقاڵی نووسینەوەی بیرەوەرییەکەیە، لە بنەڕەتدا سەرقاڵی بەرهەمهێنان یان داڕشتنی دەقێکی ئەدەبییە، بۆ گواستنەوەی پەیامەکانیش، پێویستە سوود لە هەستی دەروونی و سۆز، وەربگرێت.

د( دوورکەوتنەوە لە زمانی ئاخاوتن لە بیرەوەری نووسراودا:

لە بیرەوەری نووسراودا، گۆڕینی زمانی نووسین بە زمانی ئاخاوتن، بەواتای لەبەرچاونەگرتنی بنەما سەرەکییەکانی دەق نووسین دێت. لەڕاستیدا وەک چۆن لەکاتی ئاخاوتندا بەشێوەی زمانی نووسین نادوێین، لەکاتی زمانی نووسینیشدا نابێت وەک زمانی ئاخاوتن تۆمار بکرێت. جگە لەو کاتانەی کە وەرگرتنی ڕاستەوخۆ هەیە و ئەویش دەخرێتە نێو کەوانە و تێیدا ئازادی تۆمارکردن زیاترە، دەبێت تەواوی نووسراوەکە بەپێی بنەما ئەدەبییەکان بێت.

بۆ نزیکبوونەوەش لە زمانی ئاخاوتن، دەتوانرێت سود لە هەندێک چەمک وەربگیردرێت، کە گونجاوترە، بۆ نموونە لەبری «تەواو بوو» دەتوانرێت «کۆچی دوایی کرد» یان «لە دونیا ڕۆیشت» بەکاربهێنرێت. هەروەها تێکەڵکردنی بنەما سەرەکییەکانی ڕستەسازی، یەکێکی دیکەیە لە شێوازەکانی نزیککردنەوەی زمانی نووسین لە زمانی ئاخاوتن. بەکارهێنانی زمانی ئاخاوتن لە یادەوەری نووسراودا بەمەبەستی دروستکردنی نزیکی و ئاوێتە بوونە لەگەڵ دەروونی خوێنەردا. هەربۆیە تێکەڵکردنی بنەما سەرەکییەکانی ڕستەسازی، دەبێت لەپێناو هەمان ئامانجدا بێت.

**ذ) ئاوازی نووسینی یادەوەری:**

ئاوازی نووسینی یادەوەری بەشێوەکی گشتی، دۆستانەیە و بە دەروونێکی سادە و دڵ ئارامییەکی گشتییانە دەنووسرێت و هاوشێوەی نامەی دۆستانەی نێوان دوو هاوڕێیە، کە زیاتر زمانی هەست، دەروونی و سۆز بەکاردەهێنرێت. لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەتوانین یەک ڕستە بە چەندین ئاوازی جیاواز دەرببڕین،

بۆ نموونە وەک دەگوترێت: (فڵان کەس دڵی پاکە)، دەتوانین بە بابەتێکی، خۆشویستانە، گاڵتە ئامێز یان بەشێوەی پرسیاری و تەنانەت وەک هەڕەشەش دەتوانرێت بەکاربهێنرێت.

لەکاتی گێڕانەوەی یادەوەریدا، دەکرێت ئەم تەکنیکە زیاتر ڕەنگبداتەوە، بەڵام کاتێک کە یادەوەرییەکە دەبێت بە نووسراو، ئەوکات دەبێت چەمکی دیکە بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە بەکارهێنانی چەمکی هاوشێوە، وەک دەگوترێت: (تۆپێنرا، کوژرا، شەهید کرا) کە یەک ناوەڕۆکیان هەیە، بەڵام شێوازی دەربڕینیان جودایە. بەکارهێنانی ئەو چەمکانەی پێشوتر، بەپێی ئاوازەکەی، بارودۆخی نووسەرەکە دەردەخات.

بابەتێکی دیکە بەکارهێنانی زیادەڕەوییە لە نووسیندا، دەتوانرێت بەسوودوەرگرتن لە زیادەڕەوی و دووبارەکردنەوە، بەسەرهاتی لێکۆڵینەوە، بابەتێکی نووسینی ئەرێنی بگۆڕێت بۆ بارودۆخێکی نەرێنی و بەپێچەوانەشەوە. کەسی گێڕەوەی بیرەوەری یان بیرەوەرینووس دەتوانێت بە دروستکردنی ئاوازێکی تایبەت لە شێوازی زمان و دەربڕینی پەخشانیدا، کاریگەری لەسەر نووسینەکە دروستبکات. لە شێوازی ئاخاوتنی کەسانی نێو ڕووداوەکانەوە، دەتوانرێت زەمینەی ژینگەیەکی زمانەوانی و پەخشاننووسی فەراهەم بکرێت.

**ژ) گۆشەنیگای ڕوانینی بیرەوەری:**

لە بیرەوەرینووسیندا، وەک جۆرێک لە جۆرەکانی ئەدەب، بەهۆی ئامادەیی ڕاستەوخۆی نووسەر، ڕەنگدانەوەی کەسایەتی تاکی تێدا بەدی دەکرێت. واتە ناوەڕۆکی بنەڕەتی بیرەوەرینووسین بریتییە لە (من). نووسەر هەمیشە هەوڵدەدات لە ناوەڕۆکی ڕووداوەکاندا، ئەو (من)ە بە خوێنەرانی بناسێنێت. لەم پرۆسەیەشدا، نووسەر سەرەتا لە دەرەوە لەو (من)ە دەڕوانێت، بۆئەوەی بتوانێت بیبینێت و دواتر توانای ئەوەی هەبێت کە بیخاتە بەر دید و هەڵسەنگاندنی خوێنەرە، بۆئەوەی خوێنەران کاتێک ڕووداوەکان هەست پێدەکەن بزانن ئەو (من)ە بە چ شێوەیەک ژیاوە، ئەو کاتەیە کە ئیدی خوێنەر توانای هەیە کە خۆی لەبری «من»ی بیرەوەری گێڕەوە بناسێت.

بەشێکی زۆری نووسینەکانی وەک: ژیاننامە، یادداشتی ڕۆژانە، ڕاپۆرتنووسی هەروەک بیرەوەری وان، لە هەموو ئەم نووسینانەدا ئامادەیی (من) لە ناوەندی ڕووداوەکاندا، یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکان، بەڵام هەریەک لەو (من)انە، لە گۆشەنیگای نووسینەوەی بیرەوەرییەوە ئەرکی جیاوازیان هەیە.

«لە بیرەوەرینووسیندا، ئامادەبوونی (من) لەناو ڕووداوەکاندا، تەنها ڕاستەقینەیی

بوونی ڕووداوەکە نیشاندەدات. لەم جۆرە نووسینانەدا (من) ناوەند نییە، بەڵکو بەئامادەیی (من) ناوەندبوون و ناوەڕۆکی ڕووداوەکە ڕوونتر دەکرێتەوە. لەڕاستیدا بیرەوەرینووسین، دووبارە زیندووکردنەوەی بابەتێکە کە لە یادگەدا بەرەو لەناوچوون دەڕوات، ئەڵبەتە هەندێک کات دەگونجێت کە بابەت و (من) ببن بە ناوەند بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەک» (فروغی، امیر خوانی: ١٣٨٦، ١٠٤).

لە گێڕانەوەی ڕووداوێک یان نووسینی ژیاننامەی کەسێتیدا، (من) ناوەندی سەرەکی نووسینەکەیە. لەم جۆرە نووسینەدا (من)ی ناوەند دەستێکی باڵای هەیە. لە بیۆگرافی یان ژیاننامە و هەندێک نووسینی دیکەشدا، (من) ئامادەیی هەیە، بەڵام ئەم (من)ە لەگەڵ (ئەو)دا دەردەکەوێت. لە بیۆگرافیدا، بابەتی (من) لە زمانی کەسێکی دیکەوە باس دەکرێت و ئەم کەسە (گێڕەوە) بەشێوەیەکی نەستی (لا ئیرادی) کاریگەری دەبێت لە لایەنگیریی نووسینەکەدا.

بەڵام لە یادداشتی ڕۆژانەدا، ئامادەبوونی (من) زیاتر دەردەکەوێت. نووسەرێک ڕووداوگەلێکی سروشتی تۆمار دەکات، کە دەگونجێت لەنێویاندا ڕووداوێکی تایبەتیش تۆمار بکات. «ڕاپۆرتەکانیش بە ئامادەیی (من) پەیدا دەبن، بەڵام ڕاپۆرت بەرهەمی ئامادەیی هوشیارانەی گێڕەرەوەیە لەنێو ناوەڕۆکی ڕووداوەکاندا، واتە ڕاپۆرتدەر سەرەتا دەزانێت لەنێو دەقی ڕووداوەکەدا بەدوای چیدا دەگەڕێت و چی لە ئامادەبوونی خۆی لەنێو ڕووداوەکەدا دەوێت» (هەمان سەرچاوە، ٨٦- ٨٧).

**ژ) بیرەوەرینووسین ئەدەبی:**

لە مەیدانی ئەدەبیدا، بیرەوەرینووسین یەکێکە لەو نووسراوانەی کە لەچوارچێوەی نووسراوی ئەدەبیدا هەژمار دەکرێت. هەر بابەتێکی ئەدەبی بابەت و تۆمارکردنی تایبەت بە خۆی هەیە. بیرەوەرینووسینش بەهۆی ئەوەی کە شێوازی دەربڕین، بابەت، ئاواز، گۆشەنیگا و کەسایەتی تایبەت بە خۆی هەیە، کەوایە شێوازێکی ئەدەبییە.

هەڵبەتە لە بابەتی ئەدەبیدا، دیارترین تایبەتمەندییەکان بریتییە لە: سۆز، سەلیقە و خەیاڵاتی ئەدەبی. بەڵام لە نووسینی بیرەوەرییەکاندا، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانیان نەبوونی خەیاڵ و زیاتر نزیکبوونە لە ڕاستییەوە، هەربۆیە دەکرێت بگوترێت، وەک یەکێک لە بابەتە ئەدەبییەکان، دەکرێت بێ کەموکووڕی نەبێت، بەڵام ئەگەر لەو گۆشە نیگایەوە لە بیرەوەری بڕوانین کە ئەو بابەتە ڕاستەقینە و لەنێو یادگەی کەسی گێڕەوەدا، سۆز و خەیاڵاتێکی هەستیار دروستدەکات، کەواتە بیرەوەرینووسین جۆرێکی ئەدەبییە.

بیرەوەرینووسینش، وەک هەر بابەتێکی دیکەی ئەدەبی، کێشەکانی نووسین، شێوازی دەربڕین، زەمینەسازی، وردەکاریی و کورتبڕی، کاریگەری دەبێت لە تێگەیشتن، لێوردبوونەوە و بەدواداچوون، بەمەش ڕادەی هەڵسەنگاندن و ڕەخنە دروست دەبن.

**ژ) دووبارە نووسینەوە (پێداچوونەوە)ی یادەوەری:**

یادەوەری نووسی دوو ژینگەی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەوانیش:

ژینگەی فیزیکی: کە بریتییە لە وردەکارییەکانی بابەتەکە. بەسەرهات وردەکارییە بینراو و مادییەکان.

ژینگەی پاڵنەر: کە بریتییە لە پاڵنەر و کاریگەرییە ڕۆحی و دەروونییەکان.

بیرەوەری نووسێک کە دەیەوێت بیرەوەرییەکان دووبارە بنووسێتەوە یان دروستیان بکات، نابێت ڕێگە بدات هیچ جۆرە بابەتێکی شاراوە لە ژینگەی فیزیکی یان لە ژینگەی پاڵنەری بیرەوەریدا بوونی هەبێت، لەبەرئەوە، بوونی هەر جۆرە ناڕوونییەک و نا تێگەیشتنێک لە ڕاست و دروستی واتای ڕستەکان، دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرهەمێکی ناتەواو بنووسرێت. هەربۆیە بۆ دروستکردنی دەقی گونجاو لەم شێوازەدا، پێویستە سوود لە شێوازی دووبارە نووسینەوە (پێداچوونەوە) و دووبارە دروستکردنەوەی دەقی نوێ وەربگیردرێت.

کار و گرنگی ئەو نووسەرەی کە پێداچوونەوە بۆ بیرەوەری دەکات، جیاوازە لە ئیشی ئەو کەسەی کە دووبارە دایدەڕێژێتەوە و دەقی نوێ دروستدەکات. لە دروستکردن و دووبارە داڕشتنەوەیدا، تەکنیک و شێواز گەلێک بەکاردەهێنرێت کە لە پێداچوونەوەی بیرەوەریدا پێویستت پێیان نییە. لەبەرئەوە لێرەدا زۆر ئیشمان بە چوارچێوەی پێداچوونەوە و دووبارە دروستکردنەوەی دەق نییە، لە بەرامبەریشدا ئاماژە بە هەندێک لەو بنەما و ڕێسایانە دەکەین کە پێویستە لەلایەن هەڵسەنگێنەری بیرەوەری (ئەو کەسەی بە بیرەوەرییە نوسراوەکەدا دەچێتەوە) لەبەرچاو بگیردرێت.

نووسەر، بۆ پێداچوونەوەی بیرەوەرییەکانی تایبەت بەو کەسانەی کە لە ژیاندا نەماون، و بۆ دروستکردنی دەق لە نووسینەوەی بیرەوەریدا، پێویستە ڕەچاوی هەندێک بنەما و پێوەر بکات کە بریتیین لە:

خۆبواردن لە ڕوونکردنەوە و درێژەدان بە بابەتی نا پێویست.

دوورکەوتنەوە لە بابەتی جوانکاریی و ڕووداوەکان و بابەتی لاوەکی و نا کاریگەر.

بابەتی سەرەکی بیرەوەرییەکە دیاری بکرێت و تەواوی بابەتەکانی دیکە لە خزمەت و چوارچێوەی بابەتە سەرەکییەکەدا بخولێنەوە و بە ڕوونی تۆمار بکرێن.

ئاخاوتنە زیادەکانی کەسی گێڕەوە بسڕێتەوە.

شێواز و ئاستی زمانێک بەکاربهێنێت کە نزیک بێت لە ئاست و زمانی کەسی گێڕەوەی بیرەوەرییەکە.

نووسەر لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکاندا باس لە ژینگەی بیرەوەرییەکە و کەسایەتییەکانی نێو بیرەوەرییەکە بە پێی پێویست دەکات. گرنگە ئەم باسکردنە هاوتەریب بێت لەگەڵ گێڕانەوەی گێڕەوەدا، ئەگەر نووسەر لە ئاستێکی جیاواز لە زمانی گێڕەوە بابەتەکان تۆمار بکات، ئەوە دەقەکە ڕووبەڕووی کەموکورتی دەبێتەوە. هەندێکجار کەسی گێڕەوە لەکاتی گێڕانەوەی بیرەوەرییەکەیدا، پێش ئەوەی باس لە ڕووداوەکە بکات، چەند ڕستەیەک لەبارەی یەکێک لە کەسانی کۆچکردووی نێو بیرەوەرییەکە دەڵێت، گرنگە نووسەر ئەو وتانەی کە زیاتر بابەتی پێدا هەڵگوتنن یان هەرشتێکی دیکەن، بەوپەڕی وردی و کورتی بنووسێت و پێویستە هەندێکیان لێ هەڵبژێریت و بەشە زیادەکەی بسڕێتەوە.

پێویستە ئەو نووسەرەی کە دەست بەپێداچوونەوەی یادەوەری دەکات، ڕەچاوی شێوازی گواستنەوەی پەیامەکان بە خوێنەران بکات. گواستنەوەی پەیام بە زمانێکی ئەدەبی، ناڕاستەوخۆیە؛ بەپێچەوانەی زمانی ئاسایی ئاخاوتن و گفتوگۆ کردن کە زیاتر ئامانجی تێگەیاندنی ڕاستەوخۆی کەسی بەرامبەرە. هەڵسەنگێنەری بیرەوەری کاتێک کە پێداچوونەوە بە بیرەوەرییەکدا دەکات، واتە دەقێکی ئەدەبی بەرهەم دەهێنێت، هەربۆیە پێویستە لە گواستنەوەی پەیامەکەیدا، سوود لە زمانی هەستی سۆزداریی و دەروونی و خۆشەویستی وەربگرێت.

گرنگیدان بە مۆسیقای زارەکی و مۆسیقای واتایی یەکێکی دیکەیە لە بەشە گرنگەکانی دروستکردنی دەق. مۆسیقای زارەکی هەمان ئەو چەمکانەن کە دانانیان پێکەوە ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لە گواستنەوەی واتای پەیامەکان. کورتی و پوختی ڕستەکان، گونجاویی زارەکی چەمکەکان لەگەڵ یەک و گرنگیدان بە چەمکە هاوکارەکان لە ڕستەدا، لە گرنگترین بابەتەکانی پەیوەست بە مۆسیقای زارەکین.

مۆسیقای واتاییش، واتە گونجاویی و پەیوەندی واتایی لە نێوان چەمکەکاندا.

هەڵبژاردنی چەمکی گونجاو، سەرەکیترین و پڕکێشەترین کاری نووسەرە. نووسەرێک کە پێداچوونەوە بۆ بیرەوەری دەکات، ئەگەرچی شارەزایی باشی

لە ئاستی زمانی کەسی گێڕەوەدا هەیە، بەڵام بۆ گواستنەوەی واتا و ناوەڕۆکی بابەتەکە، هەندێک چەمک هەڵدەبژێرێت و بەکاریان دەهێنێت.

پێکەوە بەستنێکی لۆژیکیانەی بەشەکانی دەقەکان پێکەوە، هەمان پەیوەندی نێوان هۆکار و دەرەنجامە، کە پێویستە تەواوی ڕەگەزەکانی زمان لە یەک دەقدا بوونیان هەبێت و ئەمەش پەیوەستە بە توانا و لێهاتوویی نووسەرەوە. توانایی و لێهاتوویی نووسەر، هەمان بەدواداچوونە بۆ گەیشتن بە ئامانج و ناوەڕۆکی بابەت و پەیامەکە، کە نووسەر بەدوایدا دەگەڕێت. ئەو دەرئەنجامەی کە لە پەیوەندی نێوان هۆکار و دەرئەنجام نێو دەقەکەدا دەردەکەوێت، بریتییە لە: دروستکردنی یەک بۆچوون و ئاراستە، یەک بابەتیبوون لەنێو دەقدا و دروستکردنی توانای تێگەیشتن و هەڵهێنجاندن لەلای خوێنەر.

نووسەر لە قۆناغی دروستکردنی دەقدا، هەوڵدەدات کە ژینگەیەک لە نووسیندا بڕەخسێنێت کە خوێنەر لەگەڵیدا ئاوێتە ببێت، بەواتایەکی دیکە، لە نێوان خوێنەر و دەقەکاندا پەیوەندی دروستدەکات. خوێنەر و دەق پێکەوە ئاوێتەی یەکدی دەکات و دەیانکات بە دۆست. خوێنەر کاتێک لەگەڵ دەقدا ئاوێتە دەبێت کە بخرێتە نێو ژینگەی ڕاستەقینەی ڕووداوەکەوە. نووسەر هەردوو ژینگەی فیزیایی و پاڵنەری پێکەوە ئاوێتە دەکات و بەشێوەی دەق و بە زیندوویی پێشکەشی خوێنەری دەکات. باشترین ڕێگا بۆئەوەی خوێنەر بخەیتە نێو ژینگەی ڕووداوەکەوە، بریتییە لە وەسفکردن. وەسفکردن و گێڕانەوە، بەشێکی گرنگی کاری نووسەرە.

لە بەشە گرنگەکانی نووسینەوەی بیرەوەری، ئەوە زمانی کەسایەتییەکانە کە لە گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و گفتوگۆکانی نێو بیرەوەرییەکەدا بەکاردەهێنرێت. نووسەر کە لە پێگەی دروستکردنی دەقدایە، بۆئەوەی بتوانێت زمانێکی ورد و دروست بۆ دەقەکەی هەڵبژێرێت و زمانی کەسایەتییەکانی نێو ڕووداوەکان دروستبکاتەوە، ئەوە ئەو پێگەیەی کە کەسایەتییەکانی نێو ڕووداوەکەی تێدا بووە، بەوردی لێیان دەکۆڵێتەوە و لەسەر بنەمای وتەی کەسایەتییەکان، دەقی گونجاو لە بیرەوەرییەکەدا دادەنێت. بۆ تێگەشتن لەو پێگەیانەش، باشترین و سادەترین ڕێگا ئەوەیە کە خۆی بخاتە شوێن و پێگەی ئەوانەوە.

**س) مێژوو و بیرەوەری:**

بەریەککەوتن و ئاشنابوونی سیاسی، ئابووریی و کولتووری ئێران لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا، کاریگەری زۆری کردە سەر کۆمەڵگەی ئێرانی سەردەمی قاجار. ئاشنابوون

و شارەزایی پەیداکردن لە میتۆدی نوێی مێژوونووسی و لەناوچوونی میتۆدە کۆنەکانی مێژوونووسی ئێرانی، یەکێکە لە گرنگترین دەستکەوتەکانی ئەو بەریەککەوتنە شارستانێتییە. بیرەوەرینووسینی نوێ پشتبەست بە هوشیاری (من)ی تاکوو شوناسی گشتی و کۆ، یەکێکە لە شێوازەکانی پەیوەست بەم بابەتە، کە لە ناوەڕاستی سەردەمی ناسرەدین شاوە لەژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی هزریی و دیاردەکانی ئەوروپاییە بووە هەتا کۆتایی دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە، بەتایبەت بە سەرهەڵدان و ڕوودانی شۆڕشی دەستووری لە ئێران گۆڕانکاری دیاری بەسەردا هات.

«ڕووداونووسی یان تۆمارکردنی ساڵانەی ڕووداوە مێژووییەکان بەپێی ڕیزبەندی مێژووی ڕووداوەکان، شێواز و جۆرێکی تایبەتی مێژوونووسین و بیرەوەرینووسین بووە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئێران، وڵاتانی ئیسلامی، شارستانییەتی ئاسیایی و تەنانەت وڵاتانی ئەوروپیشدا. لە ڕووداونووسیندا، ڕووداوە گرنگەکان بەشێوەیەک تۆمار دەکرێن کە تاڕادەیەک نووسەران تیایاندا دەکەونە پشتی مەیدانی ڕووداوەکانەوە. نووسەر هەوڵدەدات کە ڕاپۆرتەکەی خۆی بەشێوەیەکی گشتی (نا شەخسی) تۆمار بکات و بەدەگمەن هەست بە ئامادەیی خودی ڕووداونووس لە نێو ڕووداوەاندا دەکرێت» (اشرف: ١٣٨٨، ٣٤٩).

مێژوو، خودی بیرەوەرییە و بیرەوەریش بە سەرەکیترین کەرەستەی خاوی مێژووی نوسراو دێتە هەژمار. بیرەوەری بابەتێکی کەسییە و کەسایەتییەک گێرەوەی یەکەمی ڕووداوەکانە، بەڵام مێژوو، ئەزموونی خودی کەسەکە نییە. کەسی سێیەمە کە بە پشت بەستوو بە سەرچاوە جیاوازەکان کۆدەکرێتەوە، هەربۆیە لە مێژوودا، بڕیاردان و داوەریکردن، نەتیجەگیریی و دەرەنجامە، بەڵام لە بیرەوەریدا، ئەوە تۆمار دەکرێت کە بەسەر کەسێکدا هاتووە.

بەپێچەوانەی بیرەوەرییەوە، مێژوو ڕەوانبێژی زیاتری تێدایە. لە بیرەوەریدا، نووسەر کەمترین دەستوەردان دەکات، بەڵام مێژوو دەکرێت بە ڕاسپاردن بنووسرێتەوە. لە بیرەوەریدا، نووسین بەبێ هیچ پلان و بەرنامەیەک ئەنجام دەدرێت. بیرەوەرینووس، گریمانە و پرسیاری نییە، بەڵام مێژونووس، پلان و گریمانەی هەیە و لە بیرەوەرییەکان دەکۆڵێتەوە و پشتبەست بە ئەو بیرۆکە و ئاڕاستەیەی کە هەیەتی، زانیاری لە بیرەوەرییەکان وەردەگرێت.

لەکاتی بەدواداچوون بۆ مێژونووسی، دەبێت بیرەوەرییەکان، لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکەشدا کە لەبەردەستان، بەراورد بکرێن. بیرەوەرییەکانی

سەدەی ١٣ و بەتایبەت لە بواری سیاسیدا، بە ئامانج و مەبەست نووسراون. ئیعتمادوسەڵتەنە لە بیرەوەرییەکانیدا، بەشێوەی گاڵتەئامێز باس لە دوژمن و نەیارەکانی خۆی دەکات. بیرەوەرینووسین وەک تۆمارکردنی بەشێکە لە فلیمێک، بەڵام ئەو کەسەی کە تەواوی ڕووداوەکان وەک فلیمێکی تەواو تۆمار دەکات، بریتییە لە مێژونووس. بیرەوەرینووسین بوارێکی ئەدەبیی هەیە و ئامانجی سەرەکیی تێیدا ڕەچاوکردنی پێوەرە ئەدەبییەکانە. مێژوو، کاتێک بیرەوەری لا پەسەندە، کە بەڵگەنامەیی و بەڵگەدار بێت.

**ش) بیۆگۆافی (ژیاننامە) و بیرەوەری:**

ژیاننامە لە زمانەوانیدا، بەواتای مێژووی ژیانی کەسێک، یان بەشێکە لە ژیانی کەسێک لە ئەو چوارچێوەیەی کە نووسەرێک لەبارەی ژیانی ئەو کەسەوە هەیەتی. ژیاننامەنووسیش هاوشێوەی مێژونووس سود لە بیرەوەری وەردەگرێت، ئەگەر نووسەری بیرەوەرییەکە هاوڕای ئەوکەسە بێت کە ژیاننامەکەی دەنووسرێت، ئەوا ئەو بەشانەی بیرەوەرییەکە کە سودی بۆی دەبێت، وەریدەگرێت. ئەگەریش نەیاری بێت، ئەوا لە بیرەوەرییەکاندا، کەموکوڕییەکانی ئەو کەسە دەدۆزرێتەوە. لەم ڕۆژگارەدا، بەشێکی زۆری ڕێگا گشتییەکانی نووسینی ڕۆمان، لە نووسینی ژیاننامەشدا بەکاردەهێنرێن.

**ص) داستان و بیرەوەری:**

بیرەوەری دەگونجێت پێکهاتەی داستان لەخۆبگرێت بەڵام شێوازی نووسینی داستان بە بەراورد لەگەڵ بیرەوەریدا، جیاوازییان هەیە. ڕۆمان و داستان پشتبەستوون بە گۆڕانکاریی و گەشەی کەسایەتییەکانی ناوی، بەڵام ناوەڕۆکی بیرەوەری پشتبەستووە بە ڕووداو. کەسایەتییەکان لەنێو بیرەوەرییەکاندان و هیچ کەسایەتییەکی تێدا پەروەردە ناکرێت و ناکرێتە پاڵەوان. بۆ نموونە: (خسی در میقات) لە نووسینی جەلال ئال احمد، (حج) لە نووسینی عەلی شەریعەتی، نووسینی بیرەوەرین و لەسەر وێناکردنی کەسایەتی نەنووسراون.

لە سەفەرنامەدا، زاڵێتی نووسەر بەسەر نووسینەکانی خۆیەوە، زیاترە. جووڵەی بیرەوەری، زیاتر بەلای داستانەوەیە، لە داستاندا، ژینگەیەک دروست دەکرێت، بەڵام بیرەوەری پێویستی بە داستان دروستکردن نییە و خۆی ژینگە و ڕووداوی ڕاستەقینەی هەیە و دەگێڕدرێتەوە. گۆشەنیگای داستان، زیاتر کەسی یەکەم و

سێیەمە، بەڵام لە بیرەوەریدا، بەگشتی کەسی یەکەمە. ئاوازی بیرەوەری، دۆستانە و خۆمانەیە، بەڵام ئاوازی داستان بەپێی بارودۆخ و ڕەگەزەکانی داستانەکە، جیاوازە.

**ض) ڕاپۆرت و بیرەوەری:**

ئەگەرچی لە قۆناغەکانی ڕابردووی دووردا، هەندێک لە سەفەرنامە و ڕاپۆرتەکان، شێوەیەک لە بیرەوەرییان تێدا دەبینرێت، بەڵام ناچنە چوارچێوەی پێناسەی نوێی بیرەوەرییەوە و سنورێکی دیاری جیاکەرەوەیان لەگەڵ بیرەوەریدا هەیە. ڕاپۆرت، باسکردن، یان ڕوونکردنەوەی وردەکاری بارودۆخێک، پێگەیەکی جوگرافی یان ڕووداوێکە و بەشێوەیەکی گشتی پشتبەستووە بە بینین یان لێکۆڵینەوە یان هەردووکیان. زۆرێک لە وتارەکان یان ستوونی ڕۆژنامەکان (ستونی ڕووداوەکان، ستوونی سیاسی، هەواڵی و هونەری و ...) و زۆرینەی داستانە شێوە دۆکیۆمێنتارییەکان، سودیان لە ڕاپۆرت وەرگرتووە. ڕاپۆرت، هەواڵگەیاندنە لەبارەی ڕووداو یان بابەتێکەوە. وەک ڕاپۆرتی ڕوداوێک، کارێک، گەشتێک، ڕاپۆرتی سیاسی و ڕاپۆرتی هەفتانە. ڕاپۆرت وەک بیرەوەری نییە، ڕاپۆرت هیچ ئیشی بە تایبەتمەندییەکانی دەق دروستکرن، بابەتی ڕۆحی و هۆکار و چۆنیەتی ڕووداو و ڕادەی ڕاستەقینەیی بابەتەکە نییە و تەنها بە هەواڵەکە و ڕوونکردنەوەییەکی گشتی بابەتەکە، کۆتایی پێدەهێنێت.

«هونەری ڕاپۆرتنووسین، بریتییە لە خستنەڕووی زانیاری، ڕاستی، هۆکار، پرس و ڕووداوەکان، دەرئەنجام و پێشکەشکردنی ڕێگەچارەیەک، کە بەشێوەیەکی کورت و پوخت، ڕێکوپێک و لۆژیکی، ڕاست و ڕەوان بۆ خوێنەر دەگوازرێتەوە. بەواتایەکی دیکە، پەیامێکە کە بە خێرایی، ڕاستی و ڕوونی بەخوێنەر دەگەیەنێت، ئەم پەیامەش پشتبەستووە بە بنەمای سادەنووسین و ڕاستنووسین. ئامانج لە ئامادەکردنی ڕاپۆرت، پێشکەشکردنێکی ڕێکوپێکانەی بیروباوەڕ و هزر و زانیارییە بەسادەترین شێوە لەسەر بنەمای نەخشە و پلانێکی دیاریکراو» (رستگار فسایی: ١٣٨١، ٢٧٨).

**ط) بیرەوەری میدیایەکی بەهێزە:**

بیرەوەری گێڕانەوە و بیرەوەرینووسین لەمڕۆدا کە لە ماوەی کەمتر لە چرکەیەک زانیارییەکان دەگوازرێنەوە و هیچ ڕووداوێک نییە کە لە چاوی کامێرای ناوەندە هەواڵییەکان بشاردرێنەوە، میدیایەکی تایبەتە. نەبوونی ئامێری

تۆمارکردنی ڕووداوەکان لە هەندێک کات و شوێنی تایبەتدا، وەک: شەوانی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان، ژوورەکانی زیندان و کۆمەڵگە زۆرەملێکان و ... هتد، یەکێکە لە هۆکارەکانی گرنگی بیرەوەری میدیاییە. سەرباری ئەوەی کە لایەنگیری میدیاکان لە گواستنەوەی زانیارییەکان، دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵک بە گومان و هەستیارییەوە بڕواننە زانیارییەکانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەکان و لە بەرامبەریشدا، باوەڕی زیاتریان بە بیرەوەرییەکان و گێڕانەوە زاربەزار و سینە بەسینەکان بۆ دروست ببێت. ئەڵبەتە ڕۆڵی بڵاوکراوە و ڕێکلامی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەراورد ناکرێت بە ڕۆڵی پێداهەڵدان و ڕێزگرتنی خەڵک لە کتێب و فیلمەکان.

لە دونیایەکدا کە دەزگا میدیاییەکان لە دەستی دەسەڵاتدرەکاندایە، یان زۆرینەی میدیاکان حکومین و گرووپەکانی دیکە دەستیان بە دامەزراوە میدیاییەکان ناگات، بیرەوەری کەسایەتییەکان گرنگی زیاتر پەیدا دەکات. هەربۆیە، سەرباری بوونی ژمارەیەکی کەمی فارسی زمان لە دونیادا، بەڵام ژمارەی پێگە ئەلیکترۆنییە فارسی زمانەکان، ڕێژەیەکی ئێجگار زۆرە. لەم کۆمەڵگایانەدا، بیرەوەری پێگە و گرنگی زیاتر پەیدا دەکات.

## ئەنجام

بیرەوەری (یادەوەری) بە زۆری لە فەرهەنگدا بەوە واتا کراوە کە: «هەرشتێک کە بە دڵدا تێدەپەڕێت، هزر، ئەندێشە، هەست و خەیاڵ و ...».

بیرەوەرینووسین، باسکردنی ڕەوشی خودی کەسەکەیە و هەوڵی نووسەرە بۆ ئاوێتەکردنی لەگەڵ باسی پرس و ڕووداوەکانی ڕابردوو، لەگەڵ بیرخستنەوەی چەندی و چۆنی ڕەوشی کەسانی دیکەیە.

بەشێوەیەکی گشتی بۆ نووسینەوەی بیرەوەری، ئاماژە بە سێ شێواز کراوە: بیرەوەری نووسراو، بیرەوەری زارەکی و یادداشتی ڕۆژانە.

بیرەوەرینووسین، ئەگەرچی مێژوویەکی قووڵی هەیە، بەڵام مەیدانی گەشەسەندووی لە دونیای ئەمڕۆدایە.

لەبوار و مەیدانی ئەدەبیدا، بیرەوەرینووسین بەهۆی ئەوەی کە شێوازی خستنەڕوو، بابەت، ئاواز، گۆشەنیگا و کەسایەتی تایبەتی هەیە، بە یەکێک لە شێوازە ئەدەبییەکان دێتە هەژمار.

بیرەوەرینووسین، ڕەگەز و بنەماگەلێکی هەیە کە: گێڕەوە، بابەت، شوێن و کار لە گرنگترین ڕەگەزەکانییەتی.

بیرەوەرینووسین لەگەڵ ڕەگەزی «بیرخستنەوە» و «وەبیرهێنانەوە» نزیکییەکی زۆری هەیە. پەیوەستبوونی بیرەوەری بە ڕووداوێکی ڕاقستەقینەوە، ڕێگەی خەیاڵیبوون بە کەسی گێرەوە یان هەڵسەنگێنەر نادات یان تارِادەیەکی باش خەیاڵیبوون بە سنوورنەبەزاندنی ڕاستەقینەکان، سنوردار دەکات.

بیرەوەری، نزیکییەکی ڕاستەوخۆ و بنەڕەتی لەگەڵ ڕاستیدا هەیە، بەڵام کاتێک بیرەوەری دووکەس لەسەر یەک ڕووداو، هاوشێوەی یەکتری نییە، دەتوانین هۆکاری ئەوە لە شێواز و تەکنیکەکەیدا بدۆزینەوە؛ لە پێداچوونەوەدا، گرنگیدان بە تەکنیک و شێوازی پێداچوونەوە لە ڕوونکردنەوەی بیرەوەریدا، ڕۆڵی کاریگەری هەیە.

بیرەوەرینووسین پشت بە وەسفکردن و گێڕانەوە دەبەستێت، گێڕانەوە لە بیرەوەریدا، باسکردن، تایبەتمەندی پێدان، بینایی پێدان، زیندوویەتی پێدان و خستنەبەرچاوی بابەتەکەیە بە خوێنەر و بەکارهێنانی خەیاڵ تیایدا، کەمترە لە هەر بابەتێکی دیکەی ئەدەبی.

پێداچوونەوە و دووبارە نووسینەوەی بیرەوەری، کە لە ساتەوەختی دروستکردنی دەقێکی ئەدەبیدایە، دەبێت بۆ گواستنەوەی پەیامەکەی سود لە زمانی هەست، سۆز و دەروونی وەربگرێت؛ ئاوازی بیرەوەری، دۆستانە، ڕوون، دڵنشین و گشتییانەیە و هاوشێوەی نامەکانی خۆشەویستی و دۆستانەیە.

کارەکتەری سەرەکی لە بیرەوەرینووسیندا، (من)ە؛ لەبیرەوەرینووسیندا، ئامادەیی (من) لە مەیدانی ڕووداوەکەدا وەک یەکێک لە پایە بنەڕەتییەکان، خۆی وێنا دەکات و ئەم ئامادەییەش نیشانەی ڕاستیگەرایی بابەتەکەیە.

بیرەوەرینووسین، ئەزموونێکی کەسییە، بەو واتایەی کە گێڕەوە یان نووسەری بیرەوەرییەکە، خۆی لە شوێنی ڕووداوەکە و کاتی ڕوودانیدا، ئامادەیی هەبووە و ڕاستەوخۆ ئەزموونی کردووە.

بیرەوەری کاتێک دەتوانێت وەک دەزگایەکی میدیایی پەیامەکەی خۆی بگوازێتەوە، کە گێڕەوە یان نووسەری بیرەوەرییەکە بتوانێت پەیوەندییەکی دەروونی، هزری، ئەدێشەیی لەگەڵ هزر و دەروونی خوێنەردا دروستبکات و ئەو بیرەوەرییەی کە ئەزموونیکی کەسییە، بگۆڕێت بە ئەزموونێکی گشتی و دوورخستنەوەی لە تاکگەرایی.

بیرەوەری گێڕانەوە و بیرەوەرینووسین، میدیایەکی تایبەتە.

## لیستی سەرچاوەکان


**ئەلف) کتێب:**

دهخدا، علی اکبر: (١٣٧٢)، لغت‌نامه دهخدا، تهران، دانشگاه تهران.

رستگار فسایی، منصور: (١٣٨١)، انواع نثر فارسی، تهران، سمت.

فروغی، محمد قاسم. امیر خوانی، مسعود: (١٣٨٦)، گامی در راه علمی شدن خاطره نویسی، تهران، بنیاد حفظ آثار و ارزش‌های دفاع مقدس.

کمری، علیرضا: (١٣٨٣)، با یاد خاطره، ج١، تهران، سوره مهر.

یوسفی، غلامحسین: (١٣٧٨)، دیداری با اهل قلم، تهران، علمی.

**ب) توێژینەوە:**

اشرف، حمید: ( بهمن و اسفند ١٣٨٨)، سابقه خاطره نگاری در ایران، بخارا. شماره ٧٤. ص ٣٤٩.

حقیری، لیلا: (١٣٨٩)، بررسی سیر خاطره نویسی دفاع مقدس با تاکید بر کتاب «دا»، پایان نامه کارشناسی ارشد، انشکده ادبیات و زبان‌های خارجی، دانشگاه علامه طباطبایی.

شهبازی، عبدالله: (١٣٨٣)، خاطره نویسی سنت غربی نیست، هفته‌نامه خاطره امروز، شماره ١، ص ٣٦.

کمری، علیرضا: (١٣٧٠)، خاطره نگاشته‌ها و خاطره نویسی در گستره ادب مقاومت و فرهنگ جبهه، خلاصه مقاله‌های سیمینار بررسی ادبیات انقلاب، تهران، سمت.

# عوسمانییەکان

## ١٩٣٩- ٢٠١٠

**بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان-**
**بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)**

**................................ بەشی: دووەم ................................**

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**



**تێبینی:**

١- بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیایە، بۆ هەر سەرنج و ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە سەیری ژمارەکانی پێشتری گۆڤاری خاڵ بکات.

٢- تەنها بۆ وشەی (عوسمانی) گەڕاوین و ئەم ئەنجامانەمان بەدەست هێناوە.

٣- لە ژمارەی پێشوودا، بەشی یەکەمی ئەم بیبلیۆگرافیایە بڵاوکراوەتەوە و لەم ژمارەیەیشدا، بەشی دووەمی پێڕستکارییەکەی بڵاودەکەینەوە.

**کورتکراوەکان:**
پ.: پێوانە (بە سانتیمەترە و پانی پێش درێژی نووسراوە)
پ.د.ک.: پارتی دیموکراتی کوردستان
چ.: چاپخانە
چاپ.: نۆرەی چاپ
ژ.: ژمارە
ژ.س.: ژمارەی سپاردن
ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب: ISBN: International Standard Book Number
س.: ساڵ
ش.: شوێن
ل.: لاپەڕە
ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
و.: وەزارەت.
؟: هەر زانیارییەکی نادیار و نەزانراو

**پێڕستکاری ٢٠٠١- ٢٠١٠**

**١) بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستاندا**
نووسین: فاتیح ڕەسووڵ
چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: ستۆکهۆڵم، ISBN: ٩١- ٨٩١٥٠-١٢-٠، س.: ٢٠٠١، ل.:٤١٤، پ.:١٤×٢١
ناوەرۆک: کورد و سووریا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا.

**٢) چەند ڕاستییەکی مێژوویی شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شۆڕشەکانی دیکەی بارزان تا ساڵی ١٩٤٥**
نووسین: مەنسوور شێخ ڕەئووف بەرزنجی
چاپ.: یەکەم، چ.: خەبات، ش.: دهۆک، ژ.س.: ٣٤٢، س.: ٢٠٠١، ل.:١٦٦، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: فەسڵی یەکەم- هەندێ بابەتی وەک: ململانێی دەوڵەتی عوسمانی و میرانی کورد لە سەدەی نۆزدەدا/ هێرشی سەربازی دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانی بۆ سەر دەڤەری بارزان.

**٣) کوردستان لە سەردەمی ئاشتی-دا**
نووسین: د.ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر
وەرگێڕانی لە ؟: محەممەد نووری تۆفیق
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ.: یەکەم، چ.: سەردەم، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣، س.: ٢٠٠١، ل.:٤٠٤، پ.:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: ئەو گەلەی کە ماوەیەکی دوور و درێژ لە ژێر حوکمی عوسمانی ئیستبدادیدا ژیاوە نەیتوانیوە شارستانییەتییەک دروست بکات وەک گەلانی ئازاد و سەربەست.

**٤) مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان لە ناوچەی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێراندا**
نووسین: عەلی نەقی ئەلحوسەینی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئاسۆس هەردی
پێداچوونەوە: حەسەن عەبدولکەریم
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٤٢، س: ٢٠٠١، ل:١٣٠، پ:١٠×٢٠
ناوەرۆک: باسی حکوومەتی (ئەحمەدخان) ی کوڕی سوبخان وێردیخان و پەنابردنی بۆ دەوڵەتی عوسمانی.

٥) **وتاری مێژوویی**
نووسین: د.کاوس قەفتان
لە بڵاوکراوەکانی چاپخانە و ئۆفسێتی سەرکەوتن
چاپ: یەکەم، چ: سەرکەوتن، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٩، س: ٢٠٠١، ل:٨٥، پ:١٧×٢٣
ناوەرۆک: دەربارەی یاسای باجگری و دۆخی ناوچە کوردییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەیەمدا.

٦) **بەعێراقی کردنەوەی کێشەی باشووری کوردستان- کێ قازانجی لێ دەکا!؟**
نووسین: کاوە نادر
لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی ڕێگای ڕەنجدەران
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٢، ل:٢٥، پ:١١×٢١
ناوەرۆک: کورد و عوسمانی و تورکیای کەمالی.

٧) **تورکمان: کوردی تورکزمان- ئەم پەرتووکە هۆشدارنامەیەکە بۆ بە ئاگا هێنانەوەی خەڵکانێک، کە ڕاستیی ڕەسەنی نەتەوایەتیی خۆیان لێوونبووە- بەرگی یەکەم**
نووسین: ئیماد شێخانی
لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی کوردنامە
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سوێد، ژ.س: ٤٧٤، ISBN: ٩٥٢-٩٨-٣٥٨١-٨، س: ٢٠٠٢، ل:١١٢، پ:١٦×٢١
ناوەرۆک: لە سەرهەڵدانی عوسمانییەکان تا شەڕی چاڵدێران/ بەدڕەفتاری و ناموسوڵمانێتی سوڵتانی عوسمانی.

٨) **شاری سلێمانی ١٩١٨- ١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی-یە**
نووسین: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی
چاپ: یەکەم، چ: زانست، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٥٨، س: ٢٠٠٢، ل:٢٨٠، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: بەشی یەکەم: سلێمانی لە دوا ساڵەکانی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانیدا ١٨٩٠- ١٩١٨.

٩) **کورد و باکوری کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لە پیران- بەرگی دووەم**
نووسین: محەممەد ڕەسووڵ هاوار
لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک
چاپ: یەکەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٥٢، س: ٢٠٠٢، ل:٤٦٦، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: هەڵوێستی پاشماوەی خیلافەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ.

١٠) **مێژووی پشدەر- بەرداشتەکانی تاریخیم لەسەر بەرداشتەکانی عەبدوللائاغای سیوەلە**
نووسین: عەبدوللائاغای سێوەڵە
ئامادەکردن: عومەر سالاری

چاپ: یەکەم، چ: ڕەهرەو، ش: مەهاباد، ISBN: ٩٦٤-٦٨٠٦-٥٠-٣، س: ١٣٨١ (٢٠٠٢)، ل: ٦٠، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: شەڕی عەشیرەتی پشدەر لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی تورکیا.

**١١) میرنشینییەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە سەردەمی فەرمانڕەوایی قاجارەکاندا- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، ڕامیاری و ئابووریی**
نووسین: نازناز محەممەد عەبدولقادر
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٥، س: ٢٠٠٢، ل: ٢٤٦، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی دووەم: پەیوەندییەکانی دەوڵەتی قاجاری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیا و بەریتانیا و کاردانەوەی لەسەر کوردستانی ڕۆژهەڵات/ پەیوەندیی ئێران و عوسمانی و کاردانەوەی ئەم پەیوەندییە لەسەر میرنشینەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات/ پەیوەندیی میرنشینیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ میرنشینانی کوردستانی ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی.

**١٢) مێژووی هاوچەرخی کورد- بەرگی یەکەم**
نووسین: دیڤید ماکداول
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئەبوبەکر خۆشناو
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب ڕێکخستن (ی.ن.ک.) کتێبی ڕووناکبیری
چاپ: ؟، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٥٧، س: ٢٠٠٢، ل: ٩٣٧، پ: ١٧×٢٣
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٠٠- ١٨٥٠/ بەشی چوارەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٥٠- ١٩١٤/ بەشی حەوتەم: نەخشەی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- دابەشبوونی کوردستانی عوسمانی.

**١٣) مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا ساڵانی شەست**
نووسین: یووسف ئەحمەد دەرگەڵەیی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٢، س: ٢٠٠٢، ل: ١٨٦، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: هەولێر و عوسمانییەکان.

**١٤) مێژووی هاوچەرخی کورد- بەرگی یەکەم**
نووسین: دیڤید ماکداول
وەرگێڕانی لە ؟ بۆ زمانی فارسی: ئیبراهیم یونسی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئەبوبەکر خۆشناو
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب ڕێکخستن (ی.ن.ک.) کتێبی ڕووناکبیری
چاپ: ؟، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٥٧، س: ٢٠٠٢، ل: ٤٧٧، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٠٠- ١٨٥٠/ بەشی چوارەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٥٠-

١٩١٤/ بەشی حەوتەم: نەخشەی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- دابەشبوونی کوردستانی عوسمانی.

**١٥) ئاغا و شێخ و دەوڵەت- بەرگی دووەم**
نووسین: مارتین ڤان برۆینسن
وەرگێڕانی لە زمانی ئەڵمانییەوە: د.کوردۆ عەلی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧٦، س: ٢٠٠٣، ل: ٤٣٠، پ: ٢٢×١٦
ناوەرۆک: موڵکایەتی و پەیکەری کارگوزاریی ئیمپراتۆریتی عوسمانی لە سەدەکانی پانزە و شانزەدا.

**١٦) ئاین و مەسەلەکانی دیموکراسی و ئینتەرناسیۆنالیزم**
نووسین: فەرید ئەسەسەرد
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)
چاپ: ؟، چ: بینایی، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٣، ل: ٧٠، پ: ١١×١٦
ناوەرۆک:
دەوڵەتی عوسمانی- تورک و عەرەب.

**١٧) پشدەر- لیکۆلینەوەیەکی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوورییە لە سەرەتای سەدەی بیست-دا تا ساڵی ١٩٥٨**
کۆکردنەوە و نووسین: دارا خدر حەسەن
لەسەر ئەرکی (ئازاد جندیانی) چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٣، ل: ١٥٠، پ: ١٥×٢١
ناوەرۆک: بەشی دووەم: پشدەر لە کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانییەکان تا ساڵی ١٩٣٢/ شەڕی پشدەری و دەوڵەتی عوسمانی.

**١٨) ڕاپەرینی عەلەوییەکانی زاگرۆس یا لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەسەر ئەهلی حەق**
نووسین: محەممەد عەلی سوڵتانی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: حەسەن عەبدولکەریم و کەمال ڕەشید
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان- وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: و- کشتوکاڵ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٢٧، س: ٢٠٠٣، ل: ٢٩٣، پ: ١٦×٢٣
ناوەرۆک: ڕاپەرینی شاوەیسقولی دژی خەلیفەی عوسمانی.

**١٩) شەکرە شارەکەم سلێمانی- لێکۆڵینەوە و ڕەخنە**
نووسین: د.حسێن محەممەد عەزیز
لە بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانیی نوێ- سەرۆکایەتیی شارەوانیی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٨٥، س: ٢٠٠٣، ل: ١٥١، پ: ١٥×٢١
ناوەرۆک: عوسمانی و سەفەوی.

**٢٠) مێژووی هاوچەرخی کورد**
نووسین: دیڤد مەکداول
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئەبوبەکر خۆشناو

لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران
چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٣٧، س: ٢٠٠٣، ل:٧٤٧، پ:١٧×٢٣
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٠٠- ١٨٥٠/ بەشی چوارەم: کوردستانی عوسمانی ١٨٥٠- ١٩١٤/ بەشی حەوتەم: نەخشەی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابەشبوونی کوردستانی عوسمانی.

**٢١) پوختەیەک لە مێژووی کورد لە سەرەتاوە تا ئێستا**
نووسین: مەلا خالید فریزی
چاپ: یەکەم، چ: بژار، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٧١، س: ٢٠٠٤، ل:٣٦٩، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: حکوومەتی عوسمانی و کورد.

**٢٢) دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو**
نووسین: کەمال ڕەئووف محەممەد (بابی لالۆ)
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٧٠، س: ٢٠٠٤، ل:٦٦٦، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەزبەتەییێکی بێزاریی سلێمانی بۆ سوڵتانی عوسمانی ١٩٠٢/ جەمعیەتی ئیتتحاد و تەرەقیی عوسمانی لقی سلێمانی ١٩٠٨.

**٢٣) سیستەمی میرنشینی لە کوردستان- سەرهەڵدان و ڕوخانی/ کورتەیەکی مێژوویی سەبارەت بە گرنگی سیاسی و گەنجینە کەلتوریەکەی لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم**
نووسین: د.سەعد بەشیر ئیسکەندەر
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: جەوهەر کرمانج
لە بڵاوکراوەکانی پڕۆژەی ٦٠ کتێب دەربارەی پێکهاتە فکرییەکانی دیموکراسی
چاپ: یەکەم، چ: داناز، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٦٠، س: ٢٠٠٤، ل:٣٣٦، پ:١٥×٢٣
ناوەرۆک: بەشی دووەم: میرنشینە کوردییەکان و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لە نێوان سەدەی شازدە و هەژدەدا.

**٢٤) سێ قوربانییەکە (شێخ سەعید بەرزنجی- شێخ عەبدولسەلام بارزانی- شێخ زاری ئەلزەوبەعی)**
نووسین: عەبدولمونعیم غولامی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: ئیحسان ئیروانی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ:یەکەم،چ:و-پەروەردە،ش:هەولێر، ژ.س: ٢٠٤، س: ٢٠٠٤، ل:٧٨، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: هۆکارەکانی ڕق هەڵسانی تورکە عوسمانییەکان لە شێخانی بارزانییەکان.

**٢٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی فەڕەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢**
ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە زمانی فەرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣١٨، س: ٢٠٠٤، ل:٢٠٩، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: پاشکۆی سێیەم: کوردەکانی فارس و هێرشی عوسمانی.

**٢٦) کام ڕێگا؟ کۆمەڵێک وتار و گفتوگۆ**
**نووسین: بابەکر دەرەیی**
لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی ڕەنج
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٤، ل:٤٠٧، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: عوسمانی و کورد: لە هەڵلوشینی سامانەوە بۆ فەوتاندنی زمان.

**٢٧) کورد تورک عەرەب**
نووسین: سیسیل جۆن ئیدمۆندس
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: حامید گەوهەری
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: ؟، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٠، س: ٢٠٠٤، ل:٥٤٢، پ:١٧×٢٣
ناوەرۆک: سنووری ئێران و عوسمانی: ١٦٣٩- ١٩١٤.

**٢٨) کورد و کوردستان**
نووسین: ئارشاک سافراستیان
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئەمین شوان
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: دووەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٠٦، س: ٢٠٠٤، ل:١٦٦، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: فەسڵی سێیەم: هەڵمەتی جیهانگیریی عوسمانییەکان و خێڵە کوردەکان/ فەسڵی چوارەم: هەڵگەڕانەوەی کوردان لە عوسمانییەکان.
تێبینی: هەمان ئەم کتێبە پێشتر کورتەیەکی لەلایەن (عەبدوڵڵا شاڵی) یەوە بەناونیشانی (مێژووی کورد و کوردستان) وەرگێڕراوە... بڕوانە کتێبی ژمارە ٢٨.

**٢٩) محەممەد پاشای ڕەواندوز- لێکۆڵینەوەیەک لە کەسایەتی و قۆناغی حوکمەکەی لە ڕوانگەی ئایینی و دەروون ناسییەوە**
نووسین: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٩٧، س: ٢٠٠٤، ل:٢٩٤، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی چوارەم: محەممەد عەلی پاشا و دەوڵەتی عوسمانی.

**٣٠) ناوچەی کەرکووک و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە**
نووسین: د.نووری تاڵەبانی
وەرگێڕانی لە ؟: محەممەدی مەلا کەریم
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: دووەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٩١، س: ٢٠٠٤، ل:١٥٠، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: وەزعی شاری کەرکووک لە هەر دوو چەرخی عوسمانی و پاشایەتیدا.

**٣١) ئەتڵەسی کەرکووک- مێژوویی، کارگێڕی، سروشتی، مرۆیی، رامیاری، ئابووری**
ئامادەکردن: هاشم یاسین حەمەدئەمین و سەردار محەممەد عەبدولڕەحمان
لە بڵاوکراوەکانی لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان
چاپ: یەکەم، چ: دار المغرب، ش: هەولێر؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٥، ل:٧٨، پ:٢٩×٤٣
ناوەرۆک: کەرکووک لە سەردەمی عوسمانییەکان/ کارگێڕیی کەرکووک لە ویلایەتی مووسڵ لە سەردەمی عوسمانی.

**٣٢) بارودۆخی سیاسی کوردستان ١٨٨٠- ١٩٤٦**
نووسین: موجتەبا بورزوویی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: نازناز محەممەد عەبدولقادر و یوسف خزر چووپان و سۆران عەلیپوور
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٢١، س: ٢٠٠٥، ل:٤٩٦، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: کورد و ناکۆکییەکانی سنووری ئێران و عوسمانی.

**٣٣) تورک و تورکچێتی**
نووسین: د.عینایەتوڵڵا ڕەزا
وەرگێڕانی لە؟: ئەبوبەکر خۆشناو
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب ڕێکخستن- بەشی ڕووناکبیریی (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٢٦، س: ٢٠٠٥، ل:٨٢، پ:١١×١٦
ناوەرۆک: هیچ ناونیشانێکی تێدا نییە، وەک دەردەکەوێت باس لە مێژووی (تورکچێتیی) دەکات لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە تا (مستەفا کەمال ئەتاتۆرک) و دوای ئەویش...

**٣٤) چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد**
نووسین: د.عوسمان عەلی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: کامەران جەمال بابان زادە
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: دیکان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٣، س: ٢٠٠٥، ل:٣٩٤، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: کورد لە ململانێی ڕووسی- عوسمانیدا.
تێبینی: ئەم کتێبە ساڵی ٢٠٠٩ بە دوو بەرگ چاپ کراوەتەوە.

**٣٥) چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی (دیالێکتی سلێمانی)**
نووسینی : ئەلیکساندەر خۆدزکۆ
وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
پێداچوونەوەی زمانەوانی و پێشەکی:

فەرهاد شاکەلی
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٧٣، س: ٢٠٠٥، ل: ١٨٤، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک:پاشکۆی سێیەم: نامەی حاجی میرزا ئاقاسی بۆ سەدری ئەعزەمی عوسمانی.

**٣٦) کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان- بەشی یەکەم**
نووسین: کەلیموڵڵا تەوەحودی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: عەدنان بەرزنجی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٩٤، س: ٢٠٠٥، ل: ٣٩٧، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: دەوری کوردەکانی خوراسان لە ئاستی کردنە دەرەوەی تورکەکانی عوسمانی لە ئێران/ دەوری کوردەکانی خوراسان لە شەڕی دووەمی نادر و عوسمانییەکاندا.

**٣٧) من و بولبول- چەند مەلۆیەک لە خەرمانی محەمەد مستەفا کوردی**
نووسین: جەلال کوردی (جەلال محەممەد مستەفا کوردی)
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: دێکان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٢، س: ٢٠٠٥، ل: ٢٩٨، پ: ١٤×٢٠
ناوەرۆک: شیکردنەوەی شیعری کلاسیکی جەنگی بابانی و عوسمانی.

**٣٨) لێکۆڵینەوەیەک لەسەر سروشتی کۆمەڵگای عێراق**
نووسین: د.عەلی وەردی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: بەرزان ئەحمەد
لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
چاپ: سێیەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٥٠، س: ٢٠٠٥، ل: ٣٣٣، پ: ١٤×٢١
ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: عێراق لە سەردەمی عوسمانییەکاندا.

**٣٩) بیرەوەرییەکانی بەرهەڵستێک- بەربەرەکانیی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی**
نووسین: شەریف پاشای خەندان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: زریان ڕۆژهەلاتی
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٢٩، س: ٢٠٠٦، ل: ١٦٢، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: پرۆگرامی پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی عوسمانی/ پاشکۆ: بەرنامەی سیاسیی دەستەی ڕیفورمی بنچینەیی عوسمانی.
تێبینی: لە ناسنامەی کتێبەکەدا، ناونیشان

و ناوی نووسەر بە شێوەیەکی جیاوازتر نووسراوە: لەبارەی کێشەی کوردەوە، سەبارەت بە دوورخستنەوە و بڵاوەپێکردنی کوردان، بۆ ناوی نووسەریش (جەلادەت عالی بەدرخان) نووسراوە. وەک لێمان کۆڵییەوە، بۆمان دەرکەوت کە هەڵەی چاپ بووە و وەک سەرەوە تەواوە.

**٤٠) چەردەیەک لە مێژووی کورد**
نووسین: کەیوان ئازاد ئەنوەر
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٠، س: ٢٠٠٦، ل: ٢٣٠، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: دەرکەوتنی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی/ شەڕی چاڵدێران (هۆکار و ڕووداو و دەرئەنجامەکانی)/ پەیمانەکانی ڕێکخستنی سنوور/ میرنشینە کوردییەکانی ئەم قۆناغە مێژووییە/ ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی گەلی کورد لە سەدەی نۆزدەیەمدا/ سیاسەت و خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و گەلی کورد/ ململانێی ئەوروپاییەکان لەسەر کوردستان لە سەدەکانی ١٨- ١٩ی زایینیدا/ کوردستان و چوار سەدە داگیرکاری عوسمانی و فارسەکان.

**٤١) چەپکە گوڵێک لە بیرەوەرییەکانی گوندی کورەداوی شارباژێر**
نووسین: ئەحمەد ساڵح ڕەشید (پێشنوێژ)
چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژ.س: ٨٠٧، س: ٢٠٠٦، ل: ١٨٤، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆک: دەستی عوسمانی و دەوڵەتی عێراق ...

**٤٢) حاجی بابە شێخ- سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی میلیی کوردستان**
نووسین: عومەر فارووقی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل: ١٧٤، پ: ١٦×٢٥
ناوەرۆک: دەقی فەرمانی سوڵتانی عوسمانی/ بەڵگەنامەکان.

**٤٣) ڕاپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکووک- ماوەی ١ی کانوونی دووەم تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩**
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: سەربەست کەرکووکی
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٧١، س: ٢٠٠٦، ل: ١٧٣، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: داهاتی قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

**٤٤) فەتواکەی مەلای خەتێ (ئەفسانەی مێژوونووسێک)**
نووسین: حەسەن مەحموود حەمەکەریم
لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشک
چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: ؟، ژ.س: ٥٣٦، س: ٢٠٠٦، ل: ١٠٠، پ: ١٦×٢٢

ناوەرۆک: نەخشەی عوسمانییەکان بۆ لەناوبردنی میر محەممەد و داود پاشا و دەسەڵاتی محەممەد عەلی پاشا لە شامدا.

**٤٥) کەرکووک- ناوی- مێژووی کۆنی- دانیشتوانی- دەسەڵاتەکانی**

نووسین: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی
ئامادەکردن: شێرزاد محەممەد ئەمین ڕۆژبەیانی
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی کەرکووک
چاپ: یەکەم، چ: ئارابخا، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:١٣٢، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: کەرکووک- ناوی، مێژووی کۆنی، دانیشتوانی، دەسەڵاتی، کەرکووک لە سەردەمی پەیدابوونی عوسمانیدا.

**٤٦) کەرکووک شاری قەڵا و ئاگر و خوێن- ڕێگا چارەسەر: نموونەی برۆکسل یان بەرلین**

نووسین: عەلی مەحموود محەممەد
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی کەرکووک
چاپ: یەکەم، چ: ئارابخا، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:٢٥٢، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: شاری عێراقی لە سەردەمی عوسمانییەکان.

**٤٧) کوردەکان کێن؟**

نووسین: ماهیر عەبدولسەلام خەلیل
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٨٧، س: ٢٠٠٦، ل:٩٠، پ:١٤×٢١
ناوەرۆک: کورد لە ژێر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسیدا.

**٤٨) کتێبی ئێزدییەکان (جیلوە و مەسحەفا ڕەش) و بیبلیۆگرافیای ئێزدیاتی**

نووسین: ئەنستاس ماری کەرمەلی
وەرگێڕانی لە زمانی فرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٨٥، س: ٢٠٠٦، ل:٢٦٨، پ:١٥×٢٠
ناوەرۆک: پاشکۆی یەکەم: سکاڵانامەی پیاوماقوڵانی ئێزدی بۆ دەسەڵاتکارانی عوسمانی.

**٤٩) مێژووی ڕواندز**

نووسین: مەمدووح سەلیم مزوری
چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٨٢٨، س: ٢٠٠٦، ل:٣٨٠، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: دەورانی عوسمانی/ هەڵوێستی عوسمانی لەم ڕووداوانەی دوایی/ هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی لە میری کۆرە/ هێرشەکانی عوسمانی بۆ سەر میری کۆرە/ هێرشەکانی دەوڵەتی سوندخورەکان بۆ سەر وڵاتی عوسمانی.

**٥٠) هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا**

نووسین: جەلیلی جەلیل
وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە: ئەنوەر قادر محەممەد
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- سلێمانی
چاپ.: دووەم، چ.: کارۆ، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣٩، س.: ٢٠٠٦، ل.:١٩٦، پ.:١٥×٢١
ناوەرۆک: پێشەکی/ کوردی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ڕێگای وریابوونەوەی نەتەوەیی گرتنەبەر.

**٥١) هەمیشە دڵ ڕەق و بێدەنگین**
نووسین: نەجات نووری
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)
چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٥٤٠، س.: ٢٠٠٦، ل.:١٦٢، پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک:
کوشتنی براکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

**٥٢) چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی خورماتوو**
نووسین: حەسەن بارام
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەهەند، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٧٣٨، س.: ٢٠٠٧، ل.:٢٢٠، پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک: خورماتوو لە سەردەمی عوسمانییەکاندا.

**٥٣) چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو**
نووسین: مێجەر ئی.بی.سۆن
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ.: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٧٢١، س.: ٢٠٠٧، ل.:٢٢٢، پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک: هۆزی هەمەوەند لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا/ کێشەی سنووری عوسمانی- ئێرانی لە پەیماننامەی پاریس لە پرۆتۆکۆلی ١٨٦٩.

**٥٤) ڕۆڵی ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی باشوری کوردستان**
نووسین: نوخشە عەبدول
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕوون، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٨٦٦، س.: ٢٠٠٧، ل.:١٥٥، پ.:١٤×٢٠
ناوەرۆک: تێکەڵبوون بە دەسەڵات و پەیوەندی لەگەڵ عوسمانییەکان.

**٥٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران-دا- زنجیرە بەڵگەنامەی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا** (١٨٨٠ز)
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: محەممەد حەمە باقی
لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستان
چاپ.: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٧٤، س.: ٢٠٠٧، ل.: ٢٧٠، پ.:١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەرایی: وەرگێڕ (لێرە و لە لاپەڕە «٥»دا هاتووە: شوێن پێ هەڵگرتنێکی مێژوویی ئەم بەڵگەنامانە شوێن پێ هەڵگرتنی مێژووی دەرکەوتن و درەوشانەوەی ناوبانگ و کەسایەتیی شێخ عوبەیدوڵڵا «١٨٣٠-١٨٨٣»یە... هەروەها لە لاپەڕە ١٥دا نووسراوە: لەنێوان ئەم بەڵگەنامانەوە دەردەکەوێ کە شێخ عوبەیدوڵڵا لەبەرامبەر ئەم دەستدرێژییانەی ئێران و عوسمانیدا، هەمیشە هۆشیارانە و بە گیانی دیپلۆماتیکانەوە کاردانەوەی هەبووە و هیچ دەستپێشخەری هێرش و پەلامار نەبووە. بۆیە لە خوێندنەوەی ئەم ١٦ بەڵگەنامەیەدا، دەزانین کە هێرش و شاڵاوەکانی ئەم ماوەی چەندان ساڵە، بەلای زۆرەوە لای هێزەکانی ئێرانەوە بوون...).

**٥٦) کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠- ١٩٠٠ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویە**

نووسین: کامەران محەممەد حاجی

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٤، س: ٢٠٠٧، ل: ٣٢٢، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەشی سێیەم: کاریگەریی کێشەی ڕۆژهەڵاتی لەسەر ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجاری و سیاسەتیان بەرانبەر بە کورد/ سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی قاجاری بەرانبەر بە کورد/ کێشەی ڕۆژهەڵاتی و کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بە کورد/ پێکهێنانی سوارەی حەمیدی.

**٥٧) کوردە ئۆردنییەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا لەگەڵ کورتەیەک لەسەر کوردەکانی سوریا، لوبنان، فەلەستین**

نووسین: محەممەد عەلی سوێرکی کورد

وەرگێڕانی لە ؟: حەمید گەردی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٣٢، س: ٢٠٠٧، ل: ٣٦٦، پ: ١٦×٢٣

ناوەرۆک: ناودارانی کورد لە سەردەمی ئەیووبی و مەملووکی و عوسمانییەکان.

**٥٨) کورد- کلیلی گۆڕانکارییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە**

نووسین: محەممەد گەردی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٨٥٩، س: ٢٠٠٧، ل: ١١٦، پ: ١٤×٢٠

ناوەرۆک: ئەنقەرە هێشتا خەون بە میراتی عوسمانییەوە دەبینێت.

**٥٩) میر عەبداڵ خانی بدلیس (١٦٠٥-١٧٠١) بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لە مێژووی کورددا**

نووسین: بوار نوورەدین

له بڵاوكراوەكانی مەكتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ك.)
چاپ: یەكەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٥٠، س: ٢٠٠٧، ل: ٢٣٢، پ: ١٣×٢١
ناوەرۆك: تاوان و تاڵان و تۆقاندنی ئەو سەردەمەی عوسمانییەكان لە كوردستاندا/ شێوازی جەنگ/ هۆكاری شكستی میرنشینی بدلیس/ دەسكەوتی عوسمانییەكان لەم شەڕەدا.

**٦٠) میر عەبدال خانی بدلیس بلیمەتێكی فەرامۆشكراو لە مێژووی كورددا**
نووسین: بوار نوورەدین
چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٥٠، س: ٢٠٠٧، ل: ١٦٠، پ: ١٦×٢٤
ناوەرۆك: هەمان ناوەرۆكی چاپی یەكەمی هەیە، بە كەمێك زانیاریی زۆرترەوە، بڕوانە كتێبی پێش خۆی ژمارە ٣٧٩.

**٦١) ئەرمەنۆساید- سەدەیەك لە پەیوەندییەكانی كورد و ئەرمەن**
نووسین: مامەند ڕۆژە
له بڵاوكراوەكانی مەڵبەندی كوردۆلۆجی
چاپ: یەكەم، چ: تیشك، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٦١، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٢٤، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆك: قۆناغی یەكەم: عوسمانی و جینۆسایدی ئەرمەن.

**٦٢) توركیا لە ئەتاتوركەوە بۆ ئەردۆغان**
**نووسین: مەنال لوتفی**
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: مەجید ساڵح- موحسین ئەدیب
له بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان
چاپ: یەكەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٣٩، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٤٧، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆك: بەشی چواردەیەم: مێژووی عەرەب لە ئەرشیفی عوسمانیدا.

**٦٣) جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ كوردان ١٩١٢-١٩٢٢ یەكەم ڕێكخراوی یاسایی تەلەبەی كورد**
نووسین: مالمیسانژ
وەرگێڕانی لە زمانی توركییەوە: زریان ڕۆژهەڵاتی
پێشەكی و پێداچوونەوە: عەبدوڵڵا زەنگەنە
له بڵاوكراوەكانی بنكەی ژین
چاپ: یەكەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٣٢، س: ٢٠٠٨، ل: ٤٦٠، پ: ١٥×٢٠
ناوەرۆك: بەڕێوەبەرایەتیی ئاسانكاری كاروباری بەرژەوەندیی عوسمانی/ بەڕێوەبەرایەتیی تەسهیلی مەسالیحی عوسمانی.

**٦٤) چەردەیەكی كۆمەڵایەتییانە لە مێژووی نوێی عیراق- بەرگی چوارەم- لە ساڵی ١٩١٤ەوە تا ساڵی ١٩١٨**
نووسین: د.عەلی وەردی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا
له بڵاوكراوەكانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ: یەکەم، چ: پیرەمێرد، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦١٩، س: ٢٠٠٨، ل: ٤٨٤، پ: ١٦×٢٢
ناوەرۆک: بەشی یەکەم: دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگدا.

**٦٥) قەیران خولقێنی زلهێزەکان لە کوردستانی عێراق**
نووسین: د.ساڵح مەلا عومەر عیسا
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: سلێمان تاشان
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دراسات و پێگەیاندنی حیزبی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ١٠٠٦، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٥٣، پ: ١٧×٢٣
ناوەرۆک: دابەشکردنی کوردستان دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی.

**٦٦) سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩- ١٨٧٨**
**نووسین: پۆل دۆمۆن**
وەرگێڕانی لە زمانی فەرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٤١٤، س: ٢٠٠٨، ل: ١٦٦، پ: ١٥×٢١
ناوەرۆک: پێشەکیی وەرگێر (لێرەدا نووسراوە: سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩- ١٨٧٨ یەکێک لە قۆناغە هەر گرینگەکانی مێژووی ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئەوە هەر لەم قۆناغەدا بوو کە دواتر دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم «سوڵتانی سوور» کۆتایی بە هەموو ئەو پرۆسیسانەی ڕیفۆرم هێنا کە لە ماوەی نیو سەدەدا بۆ نوێکردنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی خرابوونە گەڕ. هەروەها لە کۆتاییدا نووسراوە: ئەم باسەی لێرەدا کردوومانە بە کوردی بەشێکە لە کتێبێکی گەورەی مێژوویی بەناوی «مێژووی ئیمپراتۆریای عوسمانی» لەلایەن کۆمەڵێک ڕۆژهەڵاتناس و عوسمانیناسی گەورەی ڕۆژئاوا نووسراون و کتێبەکە نزیکەی ٨١٠ لاپەڕەی قەوارە گەورەیە. ئێمە لەم کتێبەدا تەنیا بەشی سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩- ١٨٧٨مان هەڵبژارد...)/ پاشکۆ: لیستی سوڵتانەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی/ وێنەی سوڵتانێکی عوسمانی/ درووشمی ئیمپراتۆریای عوسمانی.

**٦٧) شاه ئیسماعیلێ صەفەوی و دامەزراندنا دەولەتا صەفەوی- خواندنەکا ڕخنەیی**
نووسین: د.ئەمیر حسێن خونجی
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: نزار ئەییوب گولی
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەرێ ڤەکولینێن کوردی و پاراستنا بەلگەنامان
چاپ: یەکەم، چ: ز- دهۆک، ش: دهۆک، ژ.س: ٤٤٥، س: ٢٠٠٨، ل: ٢١٣، پ: ١٧×٢٤
ناوەرۆک: کارەساتا چالدیران و ئەنجامێن وێ بزاڤێن قزلباشێن سەفەوی د دەولەتا عوسمانیدا/ شەرێ چالدیران و ژ دەست دانا باکوورێ ڕۆژئاڤایا ئیرانێ/

بەرفرەهبوونا دەستەلاتا عوسمانیان د ڕۆژهەلاتا ناڤین دا و کێمبوونا ڕۆلێ ئیرانێ.

**٦٨) کورد و کوردستان- لە سەردەمی باستانەوە تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم**

نووسین: کەمال بورکای

وەرگێڕانی لە زمانی یۆنانییەوە: عەلی فەتحی

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٩٤٥، س: ٢٠٠٨، ل:٥٧٩، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: کوردستان لەنێوان شەڕەکانی عوسمانی و ئێرانیدا/ کوردستان گۆڕەپانی ململانێی نێوان ئێران و عوسمانی.

**٦٩) کورد و کوردستان- لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدسای تورکی لە مێژوودا**

نووسین: شەمسەددین سامی

ئامادەکردنی بۆ زمانی تورکی نوێ: م.ئەمین بۆزئەرسلان

وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ١٠٨٦، س: ٢٠٠٨، ل:٤١٦، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: گەلانی سەردەمی عوسمانی: بۆز ئەرسلان/ جیاوازیی ڕژێمی عوسمانی و کەمالییەکان/ سەرژمێری عوسمانی و سەرژمێری کورد.

**٧٠) کورد و تورکمان و ١٤٠**

نووسین: لەتیف فاتیح فەرەج

چاپ: یەکەم، چ: ئازاد هەورامی، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٨، ل:١٦٠، پ:١٦×٢١

ناوەرۆک:

عوسمانییەکان و کاریگەرییان لە ناوچەکەدا/ عوسمانییەکان و مافی کەمینەکان.

**٧١) کەرکوک و ناوچەی گەرمیان و مافی کۆنترۆڵکردنیان لە لایەن کوردەوە**

نووسین: د.جەمال ڕەشید

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٦٧٤، س: ٢٠٠٨، ل:٧٢، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: کەرکووک لە ژێر کۆنترۆڵی عوسمانییەکان.

**٧٢) مێژووی ئەفشار**

نووسین: میرزا ڕەشید ئەدیبوششوعەرا

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: سەلاحەددین ئاشتی

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٠٣، س: ٢٠٠٨، ل:٦٠٩، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان ئێران و عوسمانی و ڕاسپێررانی کەڵباڵی خانی ئەفشار بۆ بەرەنگاری.

**٧٣) مێژووی کوردستان**
نووسین: (م.س. لازاریف- م.أ. حسرتیان- شاکرو محوی- ی.ی.فاسیلیفا- ئۆلگا ژیگالینا)
وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە بۆ زمانی عەرەبی: د.عەبدی حاجی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: هوشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی
لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی (ڕۆژهەڵات)
چاپ: یەکەم، چ: ڕۆژهەڵات، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٥٨٨، س: ٢٠٠٨، ل:٦٠٨، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی دووەم: کوردستان لە هەژماری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانیدا (لە سەدەی شازدەوە تا سەدەی هەژدەیەم)/ کورد و شەڕ و پەلامارەکانی عوسمانی و سەفەوییەکان/ سیاسەتی سوڵتانە عوسمانییەکان و شا سەفەوییەکان لەبەرامبەر بە کورد/ کوردستان لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی/ بەشی چوارەم: کوردستان لە سەردەمی داڕمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی (کوردستان لەنێوان سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا).

**٧٤) مێژووی هونەری تەلارسازی ناوچەی کەرکوک لە روانگەی سەردەمە مێژووییەکاندا**
نووسین: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)
لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک
چاپ: یەکەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٧، س: ٢٠٠٨، ل:٢٥٨، پ:٢١×٢٩
ناوەرۆک: مێژووی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری ناوچەی کەرکووک لە سەردەمی عوسمانییەکان.

**٧٥) مێژووی کوردستانێتی شاری موسڵ لە چەندین بەڵگەنامەی جیاجیادا- بەرگی یەکەم**
ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە: دەرسیم دیبەگەیی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای هێڤی
چاپ: یەکەم، چ: هێڤی، ش: هەولێر، ژ.س: ١٨٤٨، س: ٢٠٠٨، ل:٤٢٢، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: فەرمانڕەواکانی مووسڵ و والییە کوردەکانی سەردەمی عوسمانییەکان/ بەشی چوارەم: کوردستانێتی شاری مووسڵ لە بەڵگەنامە عوسمانی و تورکییەکاندا.

**٧٦) مەلا ئیدریسی بەدلیسی- ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا**
نووسین: حەسەن مەحموود حەمەکەریم
لە بڵاوکراوەکانی پڕۆژەی تیشک
چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٩، س: ٢٠٠٨، ل:١٥٨، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: سەربوردێکی خێرا بە ڕەگەزی عوسمانییەکان و سەفەوییەکان/ ڕەگەزی عوسمانییەکان/ پەیدابوونی دەوڵەتی عوسمانی/ بۆچی میرنشینە کوردییەکان چوونە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی؟/ ڕێککەوتنی میرە

کوردەکان و دەوڵەتی عوسمانی/ ڕێککەوتنی میرە کوردەکان و عوسمانییەکان و هەڵوێستیان لە جەنگی چاڵدێراندا/ ڕێککەوتننامەی کورد و عوسمانی.

**٧٧) نوورەدین زازا- یاداشت- بەشی یەکەم**
نووسین: نوورەدین زازا
وەرگێڕانی لە زمانی فڕەنسیەوە بۆ زمانی عەرەبی: دەروێش غالیب
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: باست حەمەغەریب
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٧٨، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٤٦، پ: ١٤×٢١
ناوەڕۆک: لە سایەی ئیمپراتۆری عوسمانی و مستەفا کەمال-دا.

**٧٨) هەڵەبجە ١٨٨٩- ١٩٣٠ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**
نووسین: عادل سدیق
لە بڵاوکراوەکانی پڕۆژەی تیشک
چاپ: یەکەم، چ: نووسەر، ش: ؟، ژ.س: ٥٠، س: ٢٠٠٨، ل: ٢٠٤، پ: ١٧×٢٣
ناوەڕۆک: بەشـــی دووەم: بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارگێڕی هەڵەبجە لە ماوەی دەسەڵاتداریێتی عوسمانیدا.

**٧٩) ئینسکلۆپیدیای هەولێر- مێژووی کۆن- مێژووی ئیسلام- مێژووی نوێ ٣**
ئامادەکردن: لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا (د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد، د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان)
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان
چاپ: یەکەم، چ: گرین گالۆری، ش: لوبنان، ژ.س: ١٨٣٢، س: ٢٠٠٩، ل: ٩٦٨- ١٤٧٥، پ: ٢٠×٢٨
ناوەڕۆک: مێژووی نوێ: داگیرکرانی هەولێر لەلایەن عوسمانییەکانەوە: د.خەلیل عەلی موراد/ ئیدارەی هەولێر لە دوا سەردەمی عوسمانییەکاندا: د.خەلیل عەلی موراد/ هەولێر لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیدا: د.ئیسماعیل شوکر ڕەسووڵ.

**٨٠) چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد- بەرگی یەکەم**
نووسین: د.عوسمان عەلی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: کامەران جەمال بابان زادە
لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
چاپ: یەکەم، چ: ڕێنوێ، ش: ؟، ژ.س: ٢٦٥٥، س: ٢٠٠٩، ل: ٤٤٦، پ: ١٧×٢٤
ناوەڕۆک: بەشی یەکەم: کورد لە ناکۆکی ڕووسی- عوسمانیدا/ کورد لە شەڕی ڕووسی عوسمانی ١٨٢٨- ١٨٨٠/ ڕاپەڕینەکانی کورد و ململانێی عوسمانی- ئینگلیزی/ شەڕی قەرم

١٨٥٣- ١٨٥٤/ شەڕی ڕووسی عوسمانی ١٨٧٧- ١٨٧٨/ هێرشی هێزەکانی عوسمانی بۆ سەر میرنشینی بۆتان.

**٨١) ڕێبازی سۆفیگەری نەقشبەندیی -خالیدی- مەولانا خالید و تەریقەتی خالیدی- بەرگی دووەم**

نووسین: چەند نووسەرێک

وەرگێڕانی لە زمانی فەرەنسییەوە: د.هەڵکەوت حەکیم

لە بڵاوکراوەکانی دیداری جیهانیی مەولانا خالید

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٨٥، س: ٢٠٠٩، ل:١١٥، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی.

**٨٢) سەرەتایەک بۆ مێژووی ئامێری چاپ**

نووسین: ئەسعەد جەباری

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: شەهید ئازاد هەورامی، ش: کەرکووک، ژ.س: ١٣١٦، س: ٢٠٠٩، ل:١١٢، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: دەوڵەتی عوسمانی و سەرهەڵدانی چاپخانە/ عوسمانییەکان و چاپخانە.

**٨٣) کورد لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا**

نووسین: ئیسماعیل فەتاح قازی

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: حەمە کەریم عارف

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٩٤٨، س: ٢٠٠٩، ل:٢٦٩، پ:١٤×٢١

ناوەرۆک: پاشایانی سەفەوی و سوڵتانەکانی عوسمانی/ تورکیا لەسەدەی نۆزدەدا/ شەڕەکانی نێوان ڕووسیا و عوسمانیان.

لە کتێبی (کرد در دائره المعارف اسلام، ترجمە: اسماعیل فتاح قاضي، چاپ أول، ١٣٢٧، أنتشارات صلاح الدین أیوبی) وەرگیراوە.

**٨٤) کەرکوک لەسەدەی نۆزدەهەمدا- لێکۆڵینەوەیەک لە بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری**

نووسین: بەختیار سەعید مەحموود شوانی

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٩٢٢، س: ٢٠٠٩، ل:٢٥١، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: یەکەم: سیاسەتی دەسەڵاتداریێتی عوسمانی لە کەرکووک.

**٨٥) کوشت و بڕی ئەرمەنییەکان- هەڵبژاردەیەکە لە چەند کتێبێکی مێژوویی دەربارەی کوشت و بڕی ئەرمەنییەکان لە ساڵی ١٩١٥**

نووسین: چەند نووسەرێک (جیمس برایس، هێبەرت ئادەمز جیبۆنز، ئارنۆڵد تۆینبی، فریدوف نانسن)

